بزوتنەوەی گۆڕان • ژوری توێژینەوەی سیاسی

# کوردستان و عێراق

## ململانێی ناوخۆیی و ئایندەی سیاسی







م. یوسف محەمەد
د. دەرباز محەمەد
د. سەردار عەزیز
د. ئاکۆ حمەکەریم
د. محەمەد عەلی
هەڵمەت محەمەد

# کوردستان و عێراق

## ململانێی ناوخۆیی و ئایندەی سیاسی

- ناوی کتێب:کوردستان و عێراق ململانێی ناوخۆیی و ئایندەی سیاسی
- ئامادەکردنی:یوسف محەمەد صادق و کۆمەڵێك نووسەر
- چاپ: چاپخانەی کارۆ
- تیراژ:٥٠٠ دانە
- ساڵی چاپ:٢٠١٤

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان**

**ژمارەی سپاردنی (١١٦٦)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە**

# پێڕست

ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراق (سەرهەڵدان و داهاتووی)
م. یوسف محەمەد سادق و نووسەرانی تر، لە عەرەبییەوە: سەرکەوت جەلیل

**شیکردنەوەی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٠/٣/٧**

**د. دەرباز محەمەد**



**پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغداد: سەرەتایەکی نوێ: دیدێکی ستراتیژی**

**د. سەردار عەزیز**

**خاکی نیشتیمان لە چارەسەری دەستوورییەوە بۆ ململانێی سەربازی**

**د. دەرباز محەمەد**

سوپای عێراق "پێکهاتەکەی -ڕێژەی کورد- کاریگەرییەکانی لە سەر ئاییندەی هەرێمی کوردستان"

ئامادەکردنی: د. محەمەد عەلی



کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و کاریگەری لە سەر دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی لە عێراق

د. ئاکۆ حەمەکەریم

## دەستپێك:

لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا، دۆخی هەرێمی کوردستان بە قۆناغێکی ڕاگوزەردا تێپەڕی، پاش ئەوەی بۆ یەکەم جار لە دوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩/٧/٢٥ بەشێك لە حیزبە براوەکانی هەڵبژاردن بەشدارییان لە حکومەت نەکرد و بوونە ئۆپۆزسیۆن لە پەرلەمانی کوردستان. ئەم هەنگاوە بووە هۆی دروستکردنی گەرموگوڕییەکی گەورە لە ناو هۆڵەکانی پەرلەمانی کوردستان و تەنانەت لە ناو شەقامی کوردیش، کە ئەمەیش فشارێکی جیدی بۆ سەر حکومەت دروست کرد بە ئاڕاستەی چاککردنی خزمەتگوزارییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی هاوڵاتییان. لە هەمان کاتدا هەر لەم قۆناغەدا چەندین قەیران و ڕووداو لە پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و عێراق ڕوویان دا. سەرجەم ئەم گۆڕانکارییانە چ لە سەر ئاستی ناوخۆی هەرێم و چ لە سەر ئاستی پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغدا، شایانی لێوردبوونەوە و توێژینەوەن.

ئەم کتێبە کۆمەڵێ توێژینەوە و ڕاپۆرتی جیاواز لە خۆ دەگرێت، سەبارەت بە بارودۆخ و کێشەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان و، هەوڵێکی ئەکادیمی و بابەتییانەیە بۆ لێکۆڵینەوە و تاووتوێکردنی بەشێك لە قەیرانە سیاسی و ئەمنی و یاسایی و کۆمەڵایەتییەکانی عێراق و هەرێم. ئامانج لەم توێژینەوانە دەرخستنی هۆکار و دەرئەنجامی دیاردە و کێشەکان و لێکدانەوەیان لە ڕوانگەی تیۆر و میتۆدە زانستییەکان و خستنەڕووی پێشنیاز و چارەسەرەکان لە بارەیانەوە.

ئەم توێژینەوانەی لەم کتێبەدا کۆکراونەتەوە بەشێکن لە بەرهەمەکانی ژووری توێژینەوەی سیاسیی بزووتنەوەی گۆڕان، کە هەندێکیان لە کۆنفرانسە ئەکادیمییەکاندا پێشکەش کراون و هەندێکی تریشیان بۆ زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی و تورکی وەرگێڕدراون. توێژینەوەکانیش بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوو جۆر پۆلێن کراون:

بەشێکیان تایبەتن بە پرسە سیاسییەکانی ناوخۆی هەرێمی کوردستان و چەند تەوەرەیەك لە خۆ دەگرێت لەوانە: ئاستەنەگەکانی بەردەم پرۆسەی دیموکراسی لە هەرێمی کوردستان، پرسی پرۆژەی دەستوور، ئاسایشی نیشتیمانیی هەرێمی کوردستان، سەر هەڵدانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێم.

بەشێکی تر لەو توێژینەوانە تایبەتن بە پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ناوەند، ئەوانیش: شیکردنەوەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە ساڵی ۲۰۱۰، پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستان و عێراق، پرسی ناوچە دابڕاوەکان، سوپای عێراق و کاریگەریی لە سەر هەرێم، لە کۆتاییشدا کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و کاریگەریی لە سەر عێراق.

خوێنەری بەڕێز، ژووری توێژینەوەی سیاسیی بزووتنەوەی گۆڕان جۆرێکە لە خانەی بیر (Think Tank) ئەرکی سەرەکیی بریتییە لە توێژینەوە و پێشکەشکردنی ڕاوێژ و ڕاپۆرتی پێویست سەبارەت بە پرسە سیاسییە ناوخۆیی و هەرێمییەکانی پەیوەست بە هەرێمی کوردستان و عێراق، لە لایەن ستافێکی ئەکادیمی بەڕێوە دەبرێت. هیواداریـن ئەم توێژینەوانە بەرچاوڕوونییەك بن بۆ توێژەری کورد زمان و هەنگاوێك بن بۆ خستنەڕووی ڕێگەچارەی کێشەکان.

ژووری توێژینەوەی سیاسی

# ئاستەنگەکانی بەردەم پرۆسەی دیموکراسی
# لە سیستمی سیاسیی هەرێمی کوردستاندا*

یوسف محەمەد سادق و نووسەرانی تر

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: نەبەز کەمال

**پێشەکی**

ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستانی عێراق، لە دوای ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٩١ەوە دەستی پێ کرد، چونکە گەلی کوردستان نەیدەویست جارێکی تر بکەوێتەوە ژێر چەپۆکی ڕژێمی پێشووی عێراق، بە هۆی ئەوەی داماڵراو بوو لە مافە سیاسی و نەتەوەیی و مرۆییەکانی و قێزەونترین تاوانی دەرهەق ئەنجام دەدرا لە لایەن ئەو ڕژێمەوە، تا دەگاتە تاوانی جینۆساید لە هەڵەبجە و لە پرۆسەی ئەنفالدا، بۆیە هاوڵاتییانی کوردستانی عێراق دوای گەڕانەوەی هێزەکانی عێراق بۆ ناوچە کوردییەکان لە کۆتاییی ئادار و سەرەتای نیسانی ساڵی ١٩٩١دا، لە شوێنەکانی خۆیان نەمان و بەرەو وڵاتانی دراوسێ ڕێگەیان گرتەبەر، ئەوەیش بووە هۆی دەستوەردانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بۆ دامەزراندنی ناوچەی ئارام بۆ کوردەکان لە باکووری عێراقدا، ئەو هەنگاوەیش ڕێخۆشکەر بوو لەبەردەم دروستبوونی دەسەڵاتی دیفاکتۆ لە ناوچە

---

* ئەم توێژینەوەیە لە کۆنفڕانسی زانستیی سێهەمی سکوڵی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی سلێمانی ساڵی ٢٠١٢ پێشکەش کرا. بڕوانە: مجموعة من الباحثين، مستقبل العراق في ظل المتغيرات المحلية و الإقليمية و الدولية، مطبعة رۆژهەڵات، السليمانية، ص ص ٢٨٧ — ٤١٨.

دواتر لە لایەن سەنتەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکان لە ئەنکەرە وەرگێڕدراوە بۆ هەر دوو زمانی ئینگلیزی و تورکی.

لینکی توێژینەوەکە بە زمانی ئینگلیزی:

http://orsam.org.tr/en/showReport.aspx?ID=2209

بە زمانی تورکی:

http://www.orsam.org.tr/tr/trUploads/Yazilar/Dosyalar/201348_151turing.pdf

کوردنشینەکاندا، بە تایبەتیش دوای ئەوەی ڕژێمی پێشووی عێراق لە مانگی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا بڕیاری دا هەموو دامودەزگا سیاسی و سەربازی و مەدەنییەکانی لە پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆك بکێشێتەوە. ئەم هەنگاوە هێزە سیاسییە کوردییەکانی هان دا، بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییی دەسەڵات لە لایەن خۆیانەوە و ڕووکردنە دامەزراندنی سیستمێکی سیاسیی بەدیل لەو ناوچانەدا، کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتیان و، وا دەخوازرا ئەو سیستمە سیستمێکی دیموکراسی پشتبەستوو بێت بە دەنگی دەنگدەران.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو خواستەدا، یەکەمین هەڵبژاردنی گشتیی دیموکراسییانەی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان و سەرکردەی بزووتنەوەی کوردایەتی لە مانگی ئایاری ١٩٩٢دا بەڕێوە چوو، دوابەدوای ئەوەیش حکومەتی هەرێمی کوردستان– عێراق پێکهێنرا و دەست کرا بە پێکهێنانی دامەزراوە مەدەنی و دادوەرییەکانی دیکەی هەرێم. بەڵام ململانێ و شەڕە ناوخۆییەکان و بە تایبەتییش لە نێوان هەر دوو حیزبی سەرەکیی ئەو کاتە، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، بوونە لەمپەڕ لەبەردەم گەشەکردن و پێشکەوتنی ئەو ئەزموونە دیموکراسییە و لە ڕێچکەی خۆی لایان دا، ئەوەیش بووە هۆی دابەشبوونی هەرێمی کوردستانی عێراق بە سەر دوو ناوچەدا، کە هەر یەکێکیان، یەکێك لەو دوو حیزبە بە سەریدا زاڵ بوو، هەر بۆیە توێژینەوە لە سروشتی سیستمی سیاسیی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا و ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پرۆسەی سیاسیی ئەم هەرێمە دەبنەوە و ڕێگاکانی چارەسەرکردنیان، گرینگیی خۆی هەیە.

## کێشەی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات ڕۆشنایی بخاتەسەر ئەو سیستمە سیاسییە تازە دەرکەوتوەی، لە ئەنجامی وەرچەرخانەکانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو

سەری هەڵدا و، ڕێڕەوەکانی دواتری و کۆسپەکانی بەردەم دیاردەی دیموکراسیی تیایدا، ئەوەیش بە وەڵامدانەوەی کۆمەڵێك پرسیار، لەوانە سروشتی سیستمی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا چۆنە؟ ئایا سیستمی پەرلەمانییە یان سەرۆکایەتی و ئەوە چ کاریگەرییەکی هەیە لە سەر پرۆسەی سیاسیی هەرێم؟ کاریگەریی پەیوەندییە حیزبییەکان، بە تایبەتییش پەیوەندییەکانی نێوان هەر دوو حیزبی حوکمڕان، یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، بە سەر دامەزراوەکانی حوکمڕانییەوە چییە لە هەرێمدا؟ گرینگترین ڕواڵەتەکانی سیستمی دیموکراسییش لە هەرێمدا و هەروەها گرینگترین لەمپەرەکانی بەردەمی چین؟

### گریمانەی توێژینەوە

هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەو پرسیارە سەرەکییانە و هەروەها ژمارەیەك پرسیاری لاوەکیی تر بدەینەوە بە گریمانەکردنی ئەوەی کە "پرۆسەی سیاسی و دیموکراسی، لە چوارچێوەی سیستمی سیاسیی هەرێمدا، لە ژێر کاریگەریی پەیوەندییەکانی نێوان هەر دوو حیزبی حوکمڕانی هەرێمی کوردستانی عێراقدا، ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگ دەبێتەوە، بەتالی دەکەنەوە لە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی خۆی، کە هێنانەدی بەرژەوەندیی گشتییە".

### میتۆدی توێژینەوە

بۆ سەلماندنی گریمانەی سەرەکیی توێژینەوەکە، میتۆدی وەسفی بەکار دەهێنرێت، لەپێناوی دەرخستنی گرینگترین ڕواڵەتەکانی سیستمی حوکمڕانیی هەرێم، هەروەك میتۆدی (سیستم) بەکار دەهێنین بۆ ناسینی گرینگترین تێهاویشتە و دەرهاویشتەکانی پرۆسەی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

## هەیکەلییەتی توێژینەوە

توێژینەوەکە بە سەر دوو بەشدا دابەش کراوە، لە یەکەمیاندا قسە لە سەر سروشتی سیستمی سیاسیی هەرێم دەکەین، لە ڕێی باسکردنی سروشتی سیستمی حوکمڕانیی هەرێم و پێگەی هەر دوو حیزبی حوکمڕان و کاریگەرییان بە سەر سیستمی سیاسی و دامەزراوەکانی هەرێمەوە. لە بەشی دواتریشدا قسە لە سەر گرینگترینی ئەو ئاستەنگانە دەکەین کە ڕووبەڕووی پرۆسەی دیموکراسی دەبنەوە لە هەرێمدا.

### ١: سیستمی سیاسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا:

ئەگەر سیستمی سیاسی بریتی بێت لە کۆمەڵێك بنەمای دەستووری و ڕێسای یاسایی و هەیکەل و پاشخان و میکانیزمی سیاسی کە دەسەلآت لە ڕێگەیانەوە ویستی خۆی ئاشکرا دەکات و دەوڵەت لە ڕێگەیانەوە مانەوە و بەردەوامیی خۆی وەردەگرێت[1]، ئەوە هەوڵ دەدەین سیستمی سیاسیی هەرێمی کوردستانی عێراق[2] لە ڕێگەی باسکردنی سیستمی حوکمڕانییەکەی و حیزبە سیاسییەکانی و پەیوەندیی نێوانیان و کاریگەرییان لە سەر سیستمە سیاسییەکەی هەرێم، بناسین. ئەوەیش وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ باسکردنی گرینگترین ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پرۆسەی دیموکراسی هەرێم دەبنەوە لە برگەی دواتری توێژینەوەکەدا.

### ١-١: سیستمی حوکمڕانی:

مەبەستمان لە سیستمی حوکمڕانی چۆنێتیی ڕێکخستنی پەیوەندییە لە نێوان دەسەلآتەکانی هەرێم، بە تایبەتییش هەر دوو دەسەلآتی یاسادانان و

---

1. د. حافظ علوان الدليمي، النظم السياسية في أوروبا الغربية و الولايات المتحدة، دار وائل، عمان، ٢٠٠١، ص ٧.

2. دەستەواژەی (هەرێم) لەبری هەرێمی کوردستانی عێراق بەکار دەهێنین بۆ کورتکردنەوە.

جێبەجێکردنە. ئەو پەیوەندییە لە حاڵەتی ئاساییدا لە ڕێگەی ئەو دەستوورەوە ڕێك دەخرێت، کە سنووری ئەرك و دەسەڵاتی هەر یەکێکیان دیاری دەکات و پەیوەندییەکانی نێوانیشیان ڕێك دەخات. تا ئێستا پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراق بە شێوەیەکی کۆتایی پەسەند نەکراوە، چونکە مادەی شەشەمی یاسای پەسەندکردنی دەستووری هەرێمی کوردستان ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠٨، دەڵێت ئەم دەستوورە دوای ڕەزامەندیی دوو لە سەر سێی ئەندامانی پەرلەمان، دەخرێتە بەردەم هاوڵاتییانی هەرێمی کوردستان.

پڕۆژەی دەستووری هەرێم لە لایەن لیژنەیەکی پسپۆڕەوە ئامادە کراوە، کە بە بڕیاری ژمارە (٥)ی پەرلەمانی کوردستان لە ٢٠٠٥/٩/٨دا پێکهێنرا[1]، لیژنەکەیش لە ژمارەیەك ئەکادیمی و یاساناس و پەرلەمانتار پێکهاتبوو[2]، دواتریش پڕۆژەی دەستوورەکە[3] خرایە بەردەم پەرلەمان لە ٢٠٠٩/٦/٢٤ دا و بە دەنگی زۆرینەی دوو لە سەر سێی ئەندامانی پەرلەمان[4] پەسەند کرا. ئەوەی سەرنج دەدرێت ئەوەیە کە پڕۆژە دەستوورییەکەی هەرێم لە کاتێکدا لە پەرلەمانی هەرێم پەسەند کرا، کە ماوەی خولی دووەمی ئەو پەرلەمانە بەگوێرەی

---

1. بڕوانە مادەی یەکەمی یاسای پەسەندکردنی دەستووری هەرێمی کوردستان ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠٨.

2. پێدەچێت ئەم لیژنەیە ئەرکەکانی خۆی بە شەفافیەت و بە ئاگاداریی هەموو ئەندامەکانی ڕانەپەڕاندبێت، ئەوەتا هەندێك لە کۆبوونەوە گرینگەکانی بە بێ ئاگاداریی سێیەکی ئەندامەکانی بەستوە، نزیکەی (٢٢) مادەی ڕەشنووسی دەستوورەکەیش لەو کۆبوونەوانەدا هەموار کراون، بڕوانە، بەهادین یوسف، دیمانە لەگەڵ د. نووری تاڵەبانی، لە سایتی؛
http://sbeiy.com/ku/Inter_Report_Detail.aspx?id=138&cat=2

3. چەندین ڕەخنە ئاڕاستەی ئەو پڕۆژەیە کرا، بە تایبەتییش ئەوەندەی پەیوەندیی بە چۆنێتیی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان هەر دوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و بە سیستمی لامەرکەزیی ئیدارییەوە هەیە، بۆ نموونە بڕوانە؛ د. لەتیف مستەفا – یوسف محەمەد سادق – سەروەر عەلی جەعفەر، پێداچوونەوەیەك بۆ پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، چاپخانەی زەرگەتە، سلێمانی، ٢٠٠٩.

4. بۆ ئاگاداربوون لە دەقی پڕۆژە پەسەندکراوەکە لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە بڕوانە، پەرلەمانی کوردستان، پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان – عێراق، ناوەندی چاپ نییە، هەولێر، ٢٠٠٩.

هەر دوو مادەی (٤٦)و (٥١)ی یاسای هەموارکراوی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی عێراق[1]، کۆتایی هاتبوو.

بە وەلانانی هەموو ئەوانەیش، مادەی یەکەمی پرۆژەی دەستوورەکە دەڵێت، سیستمی سیاسیی هەرێم سیستمی پەرلەمانیی کۆماریی دیموکراسییە[2]، بەڵام بە وردبوونەوە لە مادەکانی تری پرۆژەکە بە ئاشکرا ئەوە دەردەکەوێت کە لە سیستمی پەرلەمانی لای داوە، بە تایبەتییش ئەوەندەی پەیوەندیی بە

---

1. توێژەر لە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسیدا ئاماژەی داوە بەوە، دەقەکەی ببینە لە: پاشکۆی ڕای گشتی لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، ژمارە ٢، ١٥/ ٤/ ٢٠٠٩، لاپەڕە ٢. لیژنەی یاسایی پەرلەمانی هەرێم وەڵامی ئەو بۆچوونانەیان دایەوە کە لەو دیدارە ئاماژەپێکراوەی سەرەوەدا هاتوون لە ٢٠٠٩/٤/٢١. (بڕوانە، ڕوونکردنەوەیەك لە لیژنەی یاسایی پەرلەمانی کوردستانەوە، لە سایتی: http://perleman.org/default.aspx?page=articles&c=News-Committees&id=5098)، بەڵام توێژەر جارێکی تر لەگەڵ دادوەر د. لەتیف مستەفا لە وتارێکی شرۆڤەکاریدا بۆچوونی خۆی سەلماندەوە کە بڵاوکراوەتەوە لە: پاشکۆی ڕای گشتی لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، ژمارە ٢، ١٣/ ٥/ ٢٠٠٩، لاپەڕە ٢. هەروەك زۆرێك لە ڕۆژنامەنووس و ئەکادیمییان پشتیوانیی بۆچوونی توێژەریان کرد، وەك خوالێخۆشبوو جەوهەر نامیق سەرۆکی پێشووتری پەرلەمانی هەرێم کە وتارێکی لە ڕۆژنامەی (هاوڵاتی)دا نووسیی تیایدا بۆچوونەکانی خۆی خستە ڕوو دەربارەی شەرعیەتی خولی دووەمی پەرلەمانی هەرێم لە دوای کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٩، دوای بەڵگەهێنانەوەیش بە مادەکانی یاسای هەموارکراوی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دەڵێت: (لە ڕێگەی ڕۆژنامەی خەباتەوە ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/٢٢ ئەو مشتومڕەم بەرچاو کەوت کە لە نێوان مامۆستا یوسف محەمەد و لیژنەی یاسایی پەرلەمانی کوردستاندایە و... دوای پشکنینی مادەکانی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێم بۆم دەرکەوت بۆچوونەکەی مامۆستا یوسف دروستە و وەڵامەکەی لیژنەی یاسایی پەرلەمانی کوردستان جێگەی پرسیارە....)، بڕوانە: جەوهەر نامق سالم، دواساتەکانی ئەم خولەی پەرلەمانی هەرێم و پرۆژەی دەستووری کوردستان، ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە (٥٣٢)، چوار شەممە ١٠/ ٦/ ٢٠٠٩، لاپەڕە ٤. یان هەمان بابەت لە سایتی:

http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=9202&LinkID=67

2. لە مادەی (١)ی پرۆژەی دەستووردا هاتوە کە: کوردستان هەرێمێکە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی فیدراڵدا، سیستمە سیاسییەکەی پەرلەمانی کۆماری دیموکراتە پشتی بەستوە بە فرەیی سیاسیو بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانو دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نهێنیی دەوری، بڕوانە: پەرلەمانی کوردستان، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٥.

دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێمەوە هەیە، چونکە لە مادەکانی پرۆژە دەستوورییەکە بە دەق هاتووە، کە سەرۆك بە دەنگدانی نهێنیی ڕاستەوخۆی گەل هەڵدەبژێردرێت[1]، هەروەك لە پاڵ چەندین دەسەڵاتی دیکەدا، دەسەڵاتی دەرکردن یان دەرنەکردنی مەرسومیشی پێ دەدات، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا[2]:

١. پێکهێنانی حکومەت دوای بە دەست هێنانی متمانەی پەرلەمان.

٢. لەکارخستنی وەزیرەکان ئەگەر سەرۆکی وەزیران داوا بکات، یان پەرلەمان متمانەیان لێ وەربگرێتەوە.

٣. پاڵاوتنی ئەندامانی دادگای دەستووری بۆ پەرلەمان و دامەزراندنیان دوای پەسەندکردنی کاندیدکردنیان لە لایەن پەرلەمانەوە.

٤. دامەزراندنی دادوەران و سەرۆکی دەستەی سەرپەرشتیی دادوەری و سەرۆك و ئەندامانی داواکاری گشتی، دوای کاندیدکردنیان لە لایەن ئەنجومەنی داوەریی هەرێمەوە.

٥. دامەزراندنی سەرۆکی دەستە و کۆمیسیۆنە سەربەخۆکان دوای پەسەندکردنی کاندیدەکان لە لایەن پەرلەمانەوە.

٦. دامەزراندنی نووسینگە تایبەتەکانی هەرێمی کوردستان لە وڵاتانی دەرەوە لە سەر پێشنیاری سەرۆکی حکومەت و بە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنی پەیوەندیداری ناو حکومەتی فیدراڵ.

٧. دامەزراندنی خاوەن پلە تایبەتەکان لە سەر پێشنیاری وەزیری پەیوەندیدار و بە ڕەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران.

هەروەك ئەو پرۆژەیە دەسەڵاتی ئەوە دەبەخشێت بە سەرۆکی هەرێم لە حاڵەتکەلێکی لاستیکیدا، مەرسومگەلێك دەر بکات، هێزی یاساییان هەبێت بە

---

1. بڕوانە مادەی (٦١)ی پرۆژەی دەستوور لە هەمان سەرچاوە، لا ٨٩.

2. بڕوانە برگەکانی شەشەم، پانزەهەم، شانزەهەم، حەڤدەهەم، هەژدەهەم، نۆزدەهەم، بیستەم، بیست و یەکەم و بیست و دووەمی لە مادەی (٦٥)ی پرۆژەی دەستوور لە: هەمان سەرچاوە، لا ٩٠ - ٩٢.

ڕاوێژ و ڕێکەوتن لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی وەزیران، لەگەڵ دەسەلاتی ڕاگەیاندنی حاڵەتی نایاسایی بە بێ گەڕانەوە بۆ پەرلەمان[1]. بەو جۆرە بەخشینی هەموو ئەو دەسەلاتە فراوانە بە سەرۆکی هەرێم دەبێتە هۆی بەلاڕێداچوونی سیستمە پەرلەمانییەکەی هەرێم[2]. هەروەك ماف ئەوە دراوە بە سەرۆکی هەرێم دەست لە دەسەلاتەکانی پەرلەمان و حکومەت و دەسەلاتی دادوەری[3] و هەیکەلی بەڕێوەبردنی هەرێم وەر بدات، ئەوەیش بە بێ ئەوەی لە ژێر چاودێریی پەرلەمانیدا بێت، تەنها لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا نەبێت، ئەو حاڵەتانەیش بریتین لە (شکاندنی سوێندی دەستووری و پێشێلکارییەکی مەترسیداری دەستوور و ئەنجامدانی خیانەتی گەورە)، حاڵەتەکەیش کۆمەڵێك ڕێوشوێنی قورسی پێویستە، کە دەبێت لە لایەن دوو لە سەر سێی ئەندامانی پەرلەمانەوە تۆمەتبار بکرێت و لە لایەن دادگای دەستوورییەوە تۆمەتەکەی بە سەردا ساغ بکرێتەوە[4]. بەگوێرەی فیقهی دەستووریش ئەو حوکمانە پێچەوانەی بنەما بنەڕەتییەکانی سیستمی پەرلەمانین[5].

لەو یاسایانەیشدا، کە دەسەلاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن ڕێك دەخەن و بە هۆی نەبوونی دەستوورەوە بە یاسای دەستووری دا دەنرێن، ئەو

---

1. بڕوانە هەر دوو بڕگەی هەشتەم و نۆیەمی مادەی (٦٥)ی پڕۆژەی دەستوور لە هەمان سەرچاوە، لا ٩٠ - ٩١.

2. بڕوانە: د. لەتیف مستەفا – یوسف محەمەد سادق - سەروەر عەلی جەعفەر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٩١ – ٩٢.

3. بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: القاضي الدكتور لطيف مصطفى امين، العلاقة بين رئيس الدولة و رئيس الوزراء في النظام البرلماني، دار سردم للطباعة و النشر، السليمانية، ٢٠٠٩، ص ص ٣٦٧ – ٣٧٤.

4. بڕوانە مادەی (٦٢)ی پڕۆژەی دەستوور لە: پەرلەمانی کوردستان، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٩.

5. بڕوانە: حاکم شێخ لەتیف لادان (الإنحراف) لە سیستمی پەرلەمانی لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمدا، لە سایتی:

http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=٨٣٠&AuthorID=٢٠٣

بەلارێداچوونەی سیستمی پەرلەمانی بە ڕوونی دیارە. ئەوەتا لە کاتێکدا مادەی (٥٦)ی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی عێراق ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ دەسەڵاتی متمانەبەخشین و متمانە وەرگرتنەوە لە حکومەت و چاودێریکردنی حکومەت دەدات بە پەرلەمانی کوردستان (کە ئەوە ئاماژەیەکی ڕوونە بە سیستمی پەرلەمانی)، کەچی یاسای هەموارکراوی سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠٥ دەسەڵاتێکی فراوان دەدات بە سەرۆکی هەرێم، هاوشێوەی ئەو دەسەڵاتانەی لە پرۆژەی دەستووری هەرێمدا هاتووە[١]، بە بێ دیاریکردنی ئەو لایەنە دادوەری یان پەرلەمانییەی چاودێریی ئەدای سەرۆکی هەرێم دەکات.

جگە لەوانەیش سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێم بەگوێرەی یاسای ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێمی کوردستان بە سەرۆکی هەرێم سپێردراوە، ئەو ئەنجومەنەیش دەسەڵاتێکی بەرفراوانی هەیە سەبارەت بە دەستوەردان لە کاروباری ئابووری و سیاسی و دیپلۆماسی و ئەمنی و هەواڵگری و حیزبی و تەندروستی و بازرگانی و پەیوەندییەکان و سیستمەکانی زانیاری[٢].

بەلارێداچوونی سیستمی پەرلەمانی، دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی تاکەکەسێکدا، بە بێ ئەوەی ئەو تاکەکەسە هیچ چاودێری و سانسۆرێکی لە سەر بێت، لەوانەیشە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕژێمێکی دیکتاتۆر[٣] و بەکارهێنانی ئەو دەسەڵات و پێگەیە لە لایەن سەرۆکەوە

---

1. بڕوانە مادەی دەهەمی یاسای سەرۆکایەتیی هەرێم لە: ڕۆژنامەی وەقائعی کوردستان، ژمارە (٥٥)، ساڵی پێنجەم، ١٠/٧/ ٢٠٠٥.

2. بڕوانە: المادة الثالثة من قانون مجلس امن اقليم كردستان – العراق رقم (٤) لسنة ٢٠١١، في: مجلة وقائع كردستان، العدد ١٢٧، ٥/٦/ ٢٠١١.

3. بڕوانە: زانا ڕەئوف مەحمی، لە چاوەڕوانیی دەستووردا! چەند سەرنجێک سەبارەت بە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، لە سایتی:

بۆ بەرژەوەندیی حیزبی و تاکەکەسی[1] وەك ئەوەی لە میسر ڕووی دا لە سایەی دەسەڵاتی ڕژێمەکەی حوسنی موبارەکی سەرۆکی پێشوودا. هەروەك ئەو بەلارێداچوونە، بۆی هەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی هاوسەنگیی نەرم و چاودێریی دوو لایەنەی نێوان هەر دوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن[2] کە لە دیارترین خەسڵەتەکانی سیستمی پەرلەمانین[3].

لێرەدا پێویستە باسی ئەزموونی حیزبی هەرێم بکەین، بۆ ئەوەی زیاتر بچینە سەر لایەنی پراکتیکی و واقیعیی ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان، چونکە ئاسان نییە دامەزراوەکانی حوکمڕانی و حیزبە سیاسییەکانی هەرێم بە تەواوی لە یەکتری جیابکەینەوە، چونکە ئەو دامەزراوانە زۆر لە ژێر کاریگەریی

---

http://sbeiy.com/ku/Dosya_Rozhnama_detail.aspx?ArticleID=170&CatID=13&Cat=dosya

1. ئەوەیش بە ڕاستی ڕووی دا، کاتێك مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەسەڵات و پێگەی خۆی بەکارهێنا بۆ ڕێگرتن لە پێدانی هیچ وەزارەتێك بە بزووتنەوەی گۆڕان لە حکومەتی عێراقدا دوای هەڵبژاردنەکانی خولی دووەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی لە ساڵی ٢٠١٠دا، سەرۆکی هەرێم لە چەندین بۆنەدا ئەوەی ڕاگەیاندوە کە داوای لە نووری مالیکی سەرۆك وەزیرانی عێراق کردوە هیچ پۆستێکی وەزاری نەدات بە هیچ لایەنێکی کوردیو تاکە پۆلیسێکی کوردیش دانەمەزرێنێت بە بێ ڕەزامەندیی خۆی. بڕوانە، پێشەوا تۆفیق، سەرۆکی هەرێم پشتڕاستی کردەوە کە ئەو نەیهێشتوە گۆڕان لە بەغدا وەزارەت وەربگرێت. لە سایتی،

http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=32906&cat=1

هەروەها بڕوانە، محەمەد حەمەنەجیب، پارلەمانتارێکی یەکێتی، بارزانی پێی وتین پۆست بۆ گۆڕان نییە، لە سایتی،

http://www.destur.net/bzharay-hefte/4275-barzani-nawshirwan.html

هەروەها، سۆران حسێن، مالیکی بە گۆڕانی وتوە ملم لە ژێر چەقۆی بەرزانی و هاوپەیمانیی کوردستان دا بووە، لە سایتی،

http://www.kurdiu.org/hawal/?pageid=60279

2. زانا ڕەئوف مەنمی، سەرچاوەی پێشوو.

3. بڕوانە، الدكتور هاني علي الطهراوي، النظم السياسية و القانون الدستوري، دار الثقافة للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٨، ص ص ٢٥٨– ٢٦١. هەروەها، الدكتور نعمان أحمد الخطيب، الوجيز في النظم السياسية، دار الثقافة للنشر و التوزيع، عمان، ١٩٩٩، ص ٢٨٠.

پەیوەندیی نێوان حیزبەکانن، بە تایبەتییش پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان (یەکێتی)و پارتی دیموکراتی کوردستان (پارتی)[1]، چونکە ململانێ و شەڕ و هاوپەیمانییەکانی نێوان ئەو دوو حیزبە ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆیان لە سەر کاری پەرلەمان و حکومەتی هەرێم هەبووە.

## ١-٢: پێگەی هەر دوو حیزبی دەسەڵاتدار لە سیستمی سیاسیی هەرێمدا:

ژیانی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا بە فرەحزبی دەستی پێ کردووە، بە هۆی فرەیی ئەو حیزبانەی بەشدارییان لە خەباتی چەکداریدا کردووە دژی ڕژێمی پێشوو، هەموو ئەو حیزبانەیش جگە لە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق[2] لە ژێر چەتری بەرەی کوردستانیدا کۆببووبوونەوە[3]، بەڵام بە دەست

---

1. لەمەودوا هەر دوو دەستەواژەی کورتکراوەی یەکێتی و پارتی بەکار دەهێنین بۆ ناوهێنانی ئەو دوو حیزبە.

2. بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی جیهادکارە ساڵی ١٩٨٧ لە ئیخوان موسلمینی کوردستان جیابووەوە و لە پاڵ هێزە کوردییەکانی دیکە دژی ڕژێمی پێشووی عێراق جەنگا، تا ئێستایش چەند گرووپێکی لێ جیابووەتەوە وەك کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان و گرووپی ئەنسارولئیسلام، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الجزيرة، الحركة الإسلامية في كردستان العراق، في موقع:
http://www.aljazeera.net/NR/exeres/8D1C10BA-5216-40D4-BCD8-01B2E0BC7CA4.htm

3. بەرەیەکە لە ١٩٨٨/٦/١٢ بۆ هەماهەنگیی نێوان حیزبە کوردییەکان پێکهات بەر لە کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق – ئێران بە ماوەیەکی کەم و دوابەدوای هەڵمەتەکانی جینۆساید و کیمیابارانی کە ڕژێمی پێشوو بەرامبەر بە کورد لە کوردستانی عێراقدا ئەنجامی دان، بۆیە ٨ حیزب چوونە ناو ئەو بەرەیەوە کە ڕابەرایەتیی ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی ١٩٩١ی کرد، ئەوانیش بریتین لە: پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حیزبی شیوعیی عێراق، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، حیزبی سۆسیالیستی کوردستان، پارتی سۆسیالیستی کورد – پاسۆك، حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری. بەرەکە ئەو ناوچانەی بەڕێوە برد کە لە دەسەڵاتی ڕژێمی پێشوو ڕزگارکران، تا کاتی پێکهێنانی حکومەتی هەرێم لە حوزەیرانی ١٩٩١دا، هەڵبژاردنە گشتییەکەی ١٩٩١/٥/١٩یشی ڕێکخست، بڕوانە:

نـەهێنانی هـیچ کورسـییەکی ئەنجومـەنی نیـشتیمانیی کوردسـتان بـە هـۆی تێنەپەڕاندنی بەربەستی ٧٪ لە لایەن حیزبـەکانی دیکـەوە، بێجگـە لـە یـەکێتی و پـارتی، بـووە هـۆی لاوازبـوونی ڕۆڵـی ئـەو حیزبانـە و زاڵبـوونی دوو حیزبـە سەرەکییەکە (یەکێتی و پارتی)[1] بە سەر کایەی سیاسیی هەرێمدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ.

پـارتی و یـەکێتی لـە ١٩٩٢/٥/٢٢ لـە سـەر دابەشـکردنی کورسـییەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی و پێکهێنانی حکومەتێکی کاتی پێکهاتن، لە سەر بنـەمای دابەشکردنی هەموو پۆستەکانی حکومەت و ئەنجومەنی نیشتیمانی بە نیوەیی لە نێوانیانـدا، بێجگـە لـەو پێـنج کورسـییەی ئەنجومـەنی نیـشتیمانی، کـە بـۆ مەسیحییەکان تەرخان کرابوو، لەگەڵ بەخشینی هەندێك وەزارەت بە حیزبـەکانی دیکـە کـە لـە هەڵبژاردنەکانـدا بـە دۆڕاوی هاتنـەدەرەوە[2] بـە مەبەسـتی بێدەنگکردنیان[3]. یەکەمین کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانییش لە ١٩٩٢/٦/٤

---

نەوشـیروان مـستەفا، مفـاوەزاتی بـەرەی کوردسـتانی – بـەعس (١٩٩١)، کتێبخانـەی جـەمالی عـەلی بـاپیر، سلێمانی، ٢٠٠٩، لا ١١١- ١١٢. هەروەها بڕوانە: اوراق توما توماس38 ، في موقع: http://telskuf.com/articles.asp?article_id=10711

1. بۆ زانینی زانیاریی زیاتر لە بارەی بەڕێوەچوونی ئەو هەڵبژاردنانـە و ئەنجامـەکانی، بڕوانـە: د. رشید عمارە یاس و یوسف محمد صادق، المعارضة السیاسیة في إقلیم کردستان – العـراق النـشأة و المستقبل، المرکز العربي للأبحاث و دراسة السیاسات، الدوحة، ٢٠١٢، ص ص ٤ – ٥.

2. ڕێکەوتننامەکـە بڕگـەی دیکـەی هـەبوو دواتـر جێبـەجێ نـەکران، بـۆ نموونـە هـەردوولا لـە سـەر دووبارەکردنـەوەی هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی نیـشتیمانی ڕێکـەوتن لـە ١٩٩٢/١٠/١٥ بـە هـۆی سەرپێـچی و ساختەکارییەکانی هەڵبژاردنی یەکەم، هەروەها دووبارە هەڵبژاردنەوەی سەرکردە دوای دوو مانگ بە هۆی بەدەستنەهێنانی زۆرینەی ڕەهای دەنگدەران لە لایـەن هیچکام لـە دوو کاندیدەکە، بۆ زانـینی وردەکاریی زیاتری ڕێکەوتننامەکە بڕوانـە: حامـد گەوهـەری، باشووری کوردستان لـە نێوان دوو هەڵبژاردنـدا ١٩٩٢ – ٢٠٠٥، ستۆکهۆڵم، ٢٠٠٤، لا ٢٧- ٢٨.

3. نەوشیروان مستەفا، حیزب و حوکم ئەزموونی هەرێمی کوردستان، لە سایتی: http://sbeiy.com/ku/ArticleParts.aspx?PartID=25&ArticleID=485&AuthorID=36

لە هەولێر بەسترا و تیایدا جەوهەر نامیق لە سەر لیستی پارتی بە سەرۆکی ئەنجومەن و محەمەد تۆفیق ڕەحیم لە سەر لیستی یەکێتی بە جێگری هەڵبژێردرا. هەروەك یەکەمین کابینەی حکومەتیش بە سەرۆکایەتیی د. فوئاد مەعسوم لە سەر لیستی یەکێتی و جێگریی د. ڕۆژ نوری شاوەیس لە سەر لیستی پارتی پێکهێنرا[1]. حیزبەکانی دیکەیش وەك بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری و حیزبی شیوعی و حیزبی زەحمەتکێشان و حیزبی یەکبوون[2] هەریەکێکیان وەزارەتێکیان بەرکەوت[3]، بەڵام بزووتنەوەی ئیسلامی نەچووە حکومەتەوە و لە دەرەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی و حکومەتی هەرێمدا مایەوە[4].

---

1. ئەم حکومەتە لە مانگی نیسانی ١٩٩٣ دەستی کێشایەوە و حکومەتێکی دیکەی هاوشێوەی حکومەتی پێشوو لە ڕووی پێکهاتەی سیاسییەوە پێکهێنرا بە سەرۆکایەتیی کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی، بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پێکهاتەی حکومەتی دووەم بڕوانە؛ گەراس ئار. ڤی. ستانسفیلد، کوردستانی عێراق پەرەسەندنی سیاسی و پشکوتنی دیموکراسی، و؛ پرۆفیسۆر. ی. د. یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١٠، لا ٣٣٧ - ٣٣٩.

2. ئەم حیزبە دوای زنجیرەیەك یەکگرتن لە نێوان ساڵانی ١٩٩٢و ١٩٩٣ لە نێوان چەند حیزبێك دامەزرا، وەك حیزبی سۆسالیستی کوردستان و پارتی سۆسیالیستی کوردو پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، بەڵام حیزبی یەکبوون بە هۆی پەیوەندیکردنی چەند سەرکردەیەکی بە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانییەوە، وەك ڕەسوڵ مامەندو عەدنان موفتی و پەیوەندیکردنی هەندێکی دیکەیان بە پارتی دیموکراتەوە، وەك سامی عەبدولڕەحمان و سەید کاکە، هەڵوەشایەوە، ئەوانی دیکەیش لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٣ بە سەرکردایەتیی محەمەدی حاجی مەحمود سەر لە نوێ دامەزراندنەوەی حیزبی سۆسیالیستی کوردستانیان ڕاگەیاند کە لە کۆنگرەی دووەمیدا لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٤ ناوەکەی گۆڕدرا بۆ حیزبی سۆسیال دیموکراتی کوردستان. بڕوانە؛ محەمەدی حاجی مەحمود، ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی چوارەم ١٩٩٢ – ١٩٩٦، لا ٢٠٠ – ٢١٥. هەروەها، گەراس ئار ڤی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٠ - ٢٤٢.

3. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ناوی وەزیرەکان و بریکارەکانیان و ئاراستەی سیاسییان لە یەکەمین حکومەتی هەرێمدا، بڕوانە، هەمان سەرچاوە، لا ٣٣١- ٣٣٢.

4. لیستی ئیسلامییەکان کە لە بزووتنەوەی ئیسلامی و ئیسلامییە سەربەخۆکان پێکهاتبوو، بە تایبەتییش ڕەوتی ئەو کاتەی ئیخوان موسلمین لە کوردستانی عێراق، لە پلەی سێیەمدا بوو لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٢/٥/١٩و زیاتر لە ٥٪ی دەنگەکانی بە دەست هێنا، دوای ڕەتکردنەوەی بەشداریکردنیشی لە حکومەتدا،

پێکهێنانی حکومەتی هەرێم هەنگاوێکی مێژوویی بوو بۆ کورد بە گشتی و کوردی عێراق بە شێوەیەکی تایبەتی، چونکە بەدرێژاییی مێژوو دوو جار دەرفەت بۆ کورد هەڵکەوتبوو حکومەت پێکبهێنن، ئەویش پێکهێنانی حکومەتی کوردستان بوو بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمودی حەفید لە ساڵی ۱۹۲۲دا، کە ساڵێك زیاتری نەخایاند و بە هۆی پەلاماردانی کوردستانی عێراق لە لایەن ئینگلیزەکانەوە هەرەسی هێنا، ئەزموونی دووەمیش لە سەردەمی قازی محەمەددا بوو ساڵی ١٩٤٦ لە کوردستانی ئێران، بەڵام ئەم حکومەتەیش دیسان ساڵی یەکەمی پڕ نەکردەوە و بە هۆی پەلاماردانی پایتەختەکەی، مەهاباد، لە لایەن سوپای ئێرانەوە، هەرەسی هێنا[1].

هەروەك حکومەتی هەرێم توانی ئەو بۆشایییە سیاسی و ئیداری و ئابوورییە پڕ بکاتەوە، کە بە هۆی کشانەوەی ڕژێمی پێشووی عێراق لە ناوچەکانی ژێر ڕکێفی هێزە کوردییەکان دروستبوو، حکومەتەکە بووە چەترێك بۆ ئەو فەرمانگانەی مابوونەوە وەك (خوێندنگاکان و زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر و نەخۆشخانەکان و... تاد) کە فەرمانبەرەکانیان خۆبەخشانە درێژەیان بە کارەکانیان دەدا. هاوکات ئەم حکومەتە و حکومەتەکانی دیکەی دوای ئەو بناغەیان دارشت بۆ دامەزراوە و کەرتە سیاسی و ئابووری و کارگێڕی و خزمەتگوزارییەکانی دیکە.

---

بزووتنەوەکە بوو بە بزووتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆن لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی. بەوپێیەیش کە ئەو بزووتنەوەیە بزووتنەوەیەکی چەکدار بوو و بڕوای بە شەڕکردن بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی لەگەڵ حیزبەکانی تر، بۆیە بە شێوەیەکی چەکدارانە بەر دوو حیزبە سەرەکییەکە کەوت، بە تایبەتییش یەکێتیو بۆ چەند جارێك لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۳ تا ۱۹۹۹. بڕوانە: د. رشید عمارة یاس و یوسف محمد صادق، مصدر سابق، ص ٦- ٧.

1. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، حیزب و دەسەڵاتی تەنفیزی، لە سایتی:
http://sbeiy.com/ku/ArticleParts.aspx?PartID=25&ArticleID=485&AuthorID=36

وەك پێشتر باس كرا، پارتی و یەكێتی لە سەر دابەشكردنی دەسەڵات لە هەرێمدا بەنیوەیی ڕێكەوتن، ئەو نیوەبەنیوەیە بەناو هەیكەلی وەزارەت و فەرمانگەكانیشدا شۆڕ بووەوە، چونكە حكومەت دوو سەری هەبوو، سەرۆك و جێگرەكەی، وەزارەتەكانیش بە هەمان شێوە، بەوپێیەی بریكاری وەزیر هەمان دەسەڵاتی كارگێڕی و دارایی و یاسایی وەزیری هەبوو، هەر ئەوەیش بووە هۆی ئیفلیجبوونی پرۆسەی بڕیاردان لە ناو حكومەت و وەزارەتەكاندا و دوا جاریش بووە هۆی دروستبوونی لەمپەرێكی ئیداریی گەورە[1]. بەو جۆرە بنەمای نیوەبەنیوە دابەشبوونی تەواوی حكومەت و ئیدارەی لە نێوان دوو حیزبەكەدا كردە شتێكی نەگۆڕ كە دواتر ئەو دابەشبوونە پەرەی سەند و گەیشت بە دابەشكردنی سەرلەبەری هەرێم بە هۆی شەڕە ناوخۆیییەكانەوە، كە دواتر دێینە سەری.

ئەم ئەزموونە ئەزموونێكی دانسقەیە لە جۆری خۆی و بووە هۆی[2]:

١. دروستبوونی لەمپەڕ لەبەردەم پێكهێنانی ئیدارەیەكی یەكگرتوو لە هەرێمدا و بووە هۆی دابەشبوونی هەر وەزارەتێك لە ناو خۆیدا بۆ دوو وەزارەتی فیعلی، فەرمانبەرەكانیش بە سەر دوو حیزبە سەرەكییەكەدا دابەش كران.

٢. دروستبوونی لەمپەڕ لەبەردەم ڕاپەڕاندنی كاروباری هاوڵاتییان و پلاندانان بۆ ئایندە و گەشەی ئابووری.

٣. بووە هۆی نەبوونی پرۆسەی پێگەیاندنی گیانی وابەستەیی بۆ گەل و نیشتیمان، بەڵكو وابەستەیی بۆ حیزب جێگەی وابەستەیی نیشتیمانیی گرتەوە.

٤. دروستبوونی لەمپەڕ لەبەردەم دووبارەكردنەوەی پرۆسەی هەڵبژاردن وەك پێشتر پلانی بۆ دارێژرابوو.

---

1. گەریس ئار ڤی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٣٢.

2. بڕوانە، نەوشیروان مستەفا، حیزب و دەسەڵاتی تەنفیزی، سەرچاوەی پێشوو.

٥. دوا جاریش ئەو ئەزموونە بووە هۆی جەمسەرگیرییەکی سیاسیی توند لە هەرێمدا، کە ڕێخۆشکەر بوو لەبەردەم داجزان بەرەو شەڕە ناوخۆییەکانی هەرێم[1].

قووڵبوونەوەی ئەم دابەشبوونە ناوخۆییە بە هۆی دابەشکردنی هەیکەلی حکومی و کارگێڕییەوە بۆ دووبەش و ناکۆکییە داراییەکان[2] و هەبوونی میلیشیای حیزبی[3] و حەساسیەتی کۆنی نێوان پارتی و سەرۆکەکەی (مەسعود بارزانی) لەگەڵ یەکێتی و سکرتێرە گشتییەکەی (جەلال تاڵەبانی)[4] و ململانێ و

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی چۆنێتیی برەوسەندنی ئەو جەمسەرگیرییە و ڕۆڵی لە بەرپابوونی شەڕی ناوخۆی هەرێمدا بڕوانە، گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٩ — ٢٤٣.

2. داهاتی خاڵە گومرگییەکانو بە تایبەتییش مەرزی ئیبراهیم خەلیل یەکێك بوو لە خاڵەکانی ناکۆکیی نێوان هەر دوو لا، بە هۆی ئەو ئابڵۆقەیەیشەوە کە لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییەوە خرابووە سەر عێراق، مەرزی ئیبراهیم خەلیل بووە یەکێك لە گرینگترین ڕاڕەوەکانی بازرگانیکردنی هەرێم و عێراق لەگەڵ دەرەوە، چونکە حکومەتی پێشووی عێراقو کەسە دەستڕۆیشتووەکانی ئەو حکومەتە لەو مەرزەوە نەوتیان ئاودیوی سنوورەکان دەکرد، هەروەك شمەکە پێویستەکانی هاوڵاتییانیش لەوێوە هاوردە دەکران. بڕوانە، د. حامد دحمود عیسی، القضیة الكردیة في العراق من الإحتلال البريطاني إلى الغزو الأمريكي ١٩١٤ — ٢٠٠٤، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٥، ص ٤٣٦. دەرامەتی هەرێمیش ئەو کاتە بەم جۆرە دابەش دەکرا، (٣٥٪ بۆ پارتی،٣٥٪ بۆ یەکێتی، ١٥٪ بۆ حیزبەکانی دیکە، ١٥٪ بۆ حکومەتی هەرێم) بڕوانە، هاوڕێ باخەوان، هاوڕێنامە بۆ مێژووی کوردستان و کورد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ١٩٩٩، لا ٣٦٥. هەر یەك لە حیزبە سەرەکییەکە هەوڵیان دەدا کۆنترۆڵی زیاترین دەروازەی سنووری بکەن، بە تایبەت دەروازەی گومرگیی ئیبراهیم خەلیل کە سەرچاوەی سەرەکیی داهاتەکانی هەرێم بوو. بڕوانە، گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٥ و ٢٤٢.

3. وێڕای پێکهێنانی وەزارەتی پێشمەرگە لە یەکەمین حکومەتی هەرێمەوە و ئەو وەزارەتەیش ٢٩٠٠٠ پێشمەرگەی پێوە گرێدرابووەوە بەشێوەیەکی ڕواڵەتی، بەڵام ئەو هێزانە لە ژێر فەرمانی ڕاستەوخۆی یەکێتی و پارتیدا بوون، هەمان شتیش سەبارەت بە هێزە ئەمنییەکانی هەرێم ڕاستە. بڕوانە، گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٥. هەروەها، نەوشیروان مستەفا، کێشەی پارتی و یەکێتی، سەرچاوەی پێشوو، لا لا ٩١— ٩٢. هەروەها، ڕەجائی فاید، کوردەکانی عێراق هیوا و ئاوات لە نێوان بەدی هاتن و بەدی نەهاتن، وە، عەلی میرزا عارف هەورامی، بەڕێوەبەرێتیی خانەی وەرگێران، سلێمانی، ٢٠١٠، لا ٣١٠.

4. د. حامد محمود عیسی، مصدر سابق، ص ٤٣٦.

کوشتاری کۆنی نێوانیان[1] و ڕۆڵی تێکدەرانەی ڕژێمی پێشووی عێراق[2] و دەستتێوەردانە ئیقلیمییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی وڵاتانی دراوسێ و بە تایبەتییش تورکیاو ئێران[3]، هەموو ئەوانە بوونە هۆی هەڵایسانی شەڕی نێوان

---

1. سەرەتای ناکۆکیی نێوان هەر دوو لا دەگەڕێتەوە بۆ دەیان ساڵی پێشوو، تەنانەت بۆ پێش دامەزراندنی یەکێتیی نیشتیمانی، چونکە لە ساڵی ١٩٦٤ەوە ناکۆکیی گەورە کەوتبوە نێوان مستەفا بارزانی سەرۆکی پێشووی پارتی لە لایەك و مەکتەبی سیاسیی هەمان حیزب بە سەرکردایەتیی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لە لایەکی ترەوە. کرۆکی ناکۆکییەکانیش پەیوەندیی بە سەرکردایەتیو چۆنێتیی بڕیاردانەوە هەبوو لە ناو پارتیدا، بێجگە لە ناکۆکیی ئایدیۆلۆژیو کەلتووری، بڕوانە: ڕەجائی فاید، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٠٢ – ٣٠٤. جارێکیتریش لە کۆتایی حەفتاکان و لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ناکۆکییەکە سەری هەڵدایەوە و بووە هۆی هەڵایسانی زنجیرەیەك شەڕی ناوخۆ لە نێوان ئەو دوو حیزبە و حیزبی دیکەیشدا، بڕوانە، گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠٥ – ٢١٢. هەروەها بڕوانە: ئەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩ - ١٩٨٣، ناوەندی بڵاوکردنەوەی postfach، بەرلین ١٩٩٧.

2. هەفتەنامەی ئەهلیی هاوڵاتی لە ساڵی ٢٠٠٣دا زنجیرەیەك بەڵگەنامەی نهێنیی ڕژێمی پێشووی عێراقی بڵاوکردەوە، لە نێویاندا بەڵگەنامەیەك لە ژمارە ١٤٠ی هەفتەنامەکەدا ڕۆژی ٢٠٠٣/٩/١٠ بڵاوکرایەوە، بەڵگەنامەکە بریتییە لە نامەی یەکێك لە بڕواپێکراوەکانی لقی سلێمانیی حیزبی بەعسی هەڵوەشاوە کە نازناوەکەی ئەبو جیهاد بووە، تیایدا دەیگێڕێتەوە چۆن لە لایەن (ئەبوقەیس)ی سەرۆکی لقەکەوە ڕاسپێردراوە کێشە لە نێوان یەکێتیو پارتیدا بخوڵقێنێت، ئەمیش خزمێکی خۆی بە ناوی قادر حەسەن کە فەرماندەی بەتالیۆن بوە لە ناو هێزەکانی پارتیدا، بەکار هێناوە. (قادر)یش بە فیعلی ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢ لە قەڵادزێ تەقەی لە بارەگای یەکێتیی نیشتیمانی کردوە و سەرکردەیەکی یەکێتیی کوشتوە کە (مام جوتیار) بوو، ئەو ڕووداوەیش پریشکی یەکەمی شەڕی ناوخۆ بوو. بڕوانە: ڕۆژنامەی هاوڵاتی، چاپخانەی ڕەنج، ژمارە ١٤٠، چوارشەممە ١٠/ ٩/ ٢٠٠٣، لا ١- ٢. هەندێك سەرچاوەیش ئاماژە دەدەن بەوەی (قادر حەسەن) بەشداریی لە ڕووداوەکەی قەڵادزێدا کردوە و لەوێیش کوژراوە، وەك لە بەڵگەنامەی ئاماژەپێکراودا هاتوە، بڕوانە: حامید گەوهەری، باشووری کوردستان لە نێوان دوو هەڵبژاردندا، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٤.

3. ئەمانیش بەشدارییان کرد لە جۆشدانی ململانێ ناوخۆییەکانی نێوان حیزبە کوردییەکاندا و هاوکاریکردنی هەندێکیان دژی هەندێکی دیکەیانو ناڕاستەکردنی ئەو حیزبانە ڕووە و جەمسەرگیری لە ڕێگەی هاوپەیمانیو یەکگرتن، بڕوانە، گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٢ و ٢٤٦.

یەکێتی و پارتی و حیزبە کوردییەکانی دیکەی هاوپەیمانیان[1]. یەکەمین پریشکی ئەو شەڕەیش لە قەزای سنووریی قەڵادزێی سەر بە پارێزگای سلێمانییەوە کەوتەوە، ئەوە بوو ناکۆکییەك لە سەر خاوەندارێتیی چەند پارچە زەوییەکی ئەو شارە بووە هۆی هەڵایسانی شەڕ و پێکدادان لە نێوان ئەندامان و هەوادارانی هەر دوو حیزب لەو شارەدا، لە ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢ کە هەر زووبەزوو تەشەنەی کرد و پەلی هاویشت بۆ شارەکانی دیکەی هەرێم وەك دهۆك و سلێمانی و هەڵەبجەو ناوچەکانی دیکە[2]. درێژەکێشانی ئەو شەڕ و کوشتارە ناوخۆییەیش، بواری بۆ حکومەتی ناوەندیی بەغدا و وڵاتانی دراوسێ ڕەخساند بۆ دەستوەردانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە کاروباری ناوخۆی هەرێم و هاوکاریکردنی لایەنە بەگژیەکداچووەکان، کار گەیشتە داگیرکردنی شاری هەولێر لە لایەن هێزەکانی گاردی کۆماریی عێراقەوە لە١٩٩٦/٨/٣١دا لە سەر داوای پارتی، ئەوەیش دەرکردنی یەکێتیی لێکەوتەوە لە پایتەخت[3]. دواتریش پارتی خێرا دەستی کردەوە بە سەرلەنوێ سازدانەوەی کۆبوونەوەکانی پەرلەمانی کوردستان و

---

1. شەڕی نێوان پارتیو یەکێتی زیاتر لە چوار ساڵی خایاند، لەو ماوەیەدا شەش جەولە لە شەڕ ڕووی دا، هەوڵە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی ئاشتیپارێزیش دەبوونە هۆی ماوەماوەیەك لە ئاگربەست، تا هەر دوو لا گەیشتنە ڕێکەوتننامەی ئاشتی واشنتۆن لە ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١٧، بڕوانە: حامید گەوهەری، باشووری کوردستان لە نێوان دوو هەڵبژاردندا، سەرچاوەی پێشوو، لا لا ٦٦- ٢٨٠. هەروەها، نەوشیروان مستەفا، خەون یان مۆتەکە دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق (١٩٩٢- ٢٠٠٢)، لە سایتی،
http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=1539&AuthorID=36

2. بڕوانە: هەمان سەرچاوە. هەروەها، ڕەجائی فاید، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣١٠.

3. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: لڤین، وردەکارییەکانی ٣١ی ئاب لە بەڵگەنامەکاندا، گۆڤاری لڤین، ژمارە ٧٤، ١ی ئەیلول ٢٠٠٨، لا ٣١ – ٣٥. هەروەها: د. حامد محمود عیسی، مصدر سابق، ص ص ٤٤٠ – ٤٤٤. پارتی داوای یارمەتیی لە ڕژێمەکەی سەدام کرد بە بیانووی یارمەتیدانی یەکێتیی نیشتیمانی لە لایەن ڕژێمی ئێرانەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی زۆرینەی ناوچەکانی هەرێم، نەوشیروان مستەفا ئاماژە دەدات بەوەیش کە "هەردوو حیزب پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئێراندا هەبوو، جارجارەیش یەکێکیان سەرپێچی دەکرد و ئێرانییەکان هەوڵیان دەدا بیگەڕێننەوە، ئەوەیش خەسڵەتی سیاسەتی ئێرانە کە ڕێگا نادات هیچ لایەکیان بەسەر لایەنەکەی تردا زاڵ بێت؛ د. رشید عمارة یاس و یوسف محمد صادق، مصدر سابق، ص ٧.

پێکهێنانی حکومەتێکی بەرەیی بە سەرۆکایەتیی د. ڕۆژ نووری شاوەیس و بەشداریی حیزبی دیکەی وەك بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق و یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و حیزبی شیوعی و بە بێ بەشداریی یەکێتیی نیشتیمانی. یەکێتییش حکومەتێکی پێکهێنا لەو ناوچانەدا کە، لە ژێر ڕکێفیدا بوون بە سەرۆکایەتیی کۆسرەت ڕەسوڵ و بە بەشداریی ئەو حیزبانەی لەگەڵی هاوپەیمان بوون، وەك حیزبی زەحمەتکێشان و حیزبی سۆسیال دیموکرات[1].

دەرەنجامی ئەوەیش دابەشبوونی سیاسی و کارگێڕیی هەرێم بوو دوای ئەوەی شەڕە ناوخۆییەکان لە بنەڕەتەوە دابەشیان کردبوو بۆ سێ کەرت: ناوچەیەك لە ژێر ڕکێفی پارتی (پارێزگای دهۆك و بەشی زۆری پارێزگای هەولێری دەگرتەوە)، ناوچەیەکی تر لە ژێر ڕکێفی یەکێتی (پارێزگای سلێمانیو، بەشی ڕۆژهەلاتی پارێزگای هەولێری دەگرتەوە، کە شاری کۆیە مەڵبەندەکەی بوو، لەگەڵ ناوچە ئازادکراوەکانی پارێزگای کەرکووك)، ناوچەیەکی سێیەمیش لە ژێر ڕکێفی بزووتنەوەی ئیسلامی (قەزای هەڵەبجە و دەوروبەری دەگرتەوە)[2].

دابەشبوونی یاساییش بەدوای ئەو دابەشبوونە سیاسی و کارگێڕییەدا هات، دوای دانانی جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی وەك سەرۆکی هەرێم لە ناوچەکانی دەسەڵاتی یەکێتیدا و پێکهێنانی دادگای تێهەڵچوونەوە لە هەمان ناوچەدا لە ساڵی ١٩٩٩[3].

ئەم دابەشبوونە قووڵە بووە هۆی کەمبوونەوەی ئەگەری بە دامەزراوەیی کردنی ئەزموونی کورد لە دەسەڵاتدا، ئەوەیش ترسی وڵاتانی دراوسێی کەم

---

1. نفس المصدر، ص ص ٧ -٨.

2. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، حیزب و حوکم ئەزموونی کوردستان، سەرچاوەی پێشوو.

3. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، لە نێوان من و مام جەلال ئازاری ١٩٩٩ – شوباتی ٢٠٠١، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩، لا ٩٦. یان لە سەر سایتی سبەی؛ http://sbeiy.com/ku/ArticleParts.aspx?PartID=39&ArticleID=2426&AuthorID=36

کردەوە، کە ئەوانیش لە بەرامبەردا گرینگیدانی هاوبەشی خۆیان بە گۆڕانکارییەکانی ڕەوشی کوردستانی عێراق کەم کردەوە[1].

بەڵام دوا جار و لە دەرەنجامی ڕێکەوتننامەی ئاشتی[2] واشنتۆن کە ساڵی ١٩٩٨ لە نێوانِ (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) و بە ئامادەبوونی مادلین ئۆلبرایتی، وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئەمریکا ئیمزاکرا پرۆسەی یەکخستنەوەی هەرێم لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٢ەوە دەستی پێ کرد. هەنگاوی یەکەمیش، بە یەکگرتنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان دەستی پێ کرد، کە یەکەمین کۆبوونەوەی دوای دووبارە یەکگرتنەوەی لە بەرواری ٢٠٠٢/١٠/٤ سازدا[3]، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێم دواکەوت تا ٢٠٠٦/٥/٧[4]. واتە تا زیاتر لە ساڵێك لە بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان لە٢٠٠٥/١/٣١دا. ئەو دواخستنەی پێکهێنانی حکومەتی یەکگرتوو هۆکارەکەی دەگەڕایەوە بۆ ناکۆکی سەبارەت بە دابەشکردنی پۆستەکانی هەرێم و هەروەها سەبارەت بە دابەشکردنی پشکی کورد لە پۆستەکانی دەوڵەت لە بەغدا، تا هەر دوو حیزب گەیشتنە ڕێکەوتنێك کە لە

---

1. لەم قۆناغەدا کۆبوونەوە هاوبەشەکانی نێوان ئێران و تورکیا و سوریا دەربارەی بارودۆخی کورد لە باکووری عێراق ڕاوەستا، شایانی بیرهێنانەوەیە کە ئەو کۆبوونەوانە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی پێشووی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا و زیادبوونی هێزو ڕۆڵ و پێگەی حیزبە کوردییەکان لە سەرلەبەری عێراقدا بە گشتی و لە هەرێمدا بە تایبەتی، دەستیان پێ کردەوە، بڕوانە: گەراس ئار فی ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٤٨.
2. بۆ بینینی دەقی ڕێکەوتننامەی ئاشتی واشنتۆن لە نێوان پارتی یەکێتی، بڕوانە: عايدة علي سري الدين، المسألة الكردية في ملف السياسة الدولية، دار الآفاق الجديدة، بيروت، ٢٠٠٠، ص ص٣٨٠ —٣٨٤. هەروەها: حامید گەوهەری، باشووری کوردستان لە نێوان دوو هەڵبژاردندا، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٧٩- ٢٨٦.
3. بڕوانە: تأريخ إنتخابات الدورة الاولى ١٩٩٢، على موقع برلمان كردستان:
http://www.kurdistan-parliament.org/default.aspx?page=sitecontents&c=Parliament-History1992
4. بڕوانە: یاسین ساڵح، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩، لا ٣٣٠.

سایەیدا حکومەت لە سەرخانەوە یەکخرایەوە بە دوو سەرەوە (سەرۆکی حکومەت و جێگرەکەی) کە پێکەوە لە لایەن پەرلەمانەوە دیاری دەکران و سەرۆکی هەرێم ڕای دەسپاردن بۆ پێکهێنانی کابینەی حکومەت، هەروەك لە سەر یەکخستنەوەی وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێمیش ڕێکەوتن (دیسان لە سەرخانەوە) و بە شێوەیەکی هەنگاو بە هەنگاو. لەبەر ڕۆشنایی ڕێکەوتنەکەدا ئەوسا و ئێستایش پۆستەکانی سەرۆکی حکومەت و جێگرەکەی و وەزارەتەکان بە نیوەیی لە نێوان پارتی و یەکێتی دابەش دەکرێن، لەگەڵ بەخشینی هەندێك لە وەزارەتەکان بە حزبە بەشداربووەکانی خولی دووەمی پەرلەمانی هەرێم وەك یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی و حیزبی شیوعی و حیزبی سۆسیال دیموکرات و حیزبی زەحمەتکێشان، بەو مەرجەی هەموو دوو ساڵ جارێك سەرۆکی حکومەت و جێگرەکەی بگۆڕدرێن. بەو شێوەیە ئەو دوو حیزبە گەڕانەوە بۆ دابەشکردنی نیوەبەنیوەی دەسەلآت لە ناو خۆیاندا، بەلآم بە کلێشەیەکی جیاواز، بە جۆرێك کە حکومەتیان بە سەر دوو بەشدا دابەش کرد، یەکێکیان بە سەرۆکایەتیی سەرۆکی حکومەت و ئەوی تر بە سەرۆکایەتیی جێگری سەرۆکی حکومەت، هەر بەشێکیشیان کاروباری حکومەتی لە ناوچەی ئیداڕەی یەکێتی یان پارتیدا بەڕێ دەکرد و وەزیرەکانی سەر بە حزبەکەی خۆی و بریکاری وەزیر و بەڕێوەبەرە گشتییەکانی ناوچەی دەسەلآتی خۆیان، کە سەر بە وەزارەتەکانی حیزبەکەی تر بوون، وابەستەی دەبوون. ئەم ڕێکەوتنەی نێوان یەکێتی و پارتی بەو جۆرە گەشەی کرد، تا هەر دوو حیزب لە٢٠٠٧/٧/٢٧دا گەیشتنە ڕێکەوتننامەی ستراتیژیی نێوانیان بۆ یەکخستنی بۆچوون و هەوڵەکانیان لە هەرێم و بەغدا و چۆنێتیی دابەشکردنی دەسەلآت لە نێوانیاندا لە سەر هەر دوو ئاست تا ساڵی ٢٠١٣، واتە بۆ دوو خولی هەڵبژاردن[1]. ئەم یەکگرتنە سەرخانییەی حکومەت

1. ئەم ڕێکەوتننامەیە بە نهێنی مایەوە تا ٥/ ٦/ ٢٠١٠، کە لەو بەروارەدا چەند بەشێکی ڕێکەوتننامەکە

هاوشـان لەگـەڵ هێـشتنەوەی هـەرێم بـە دابەشـکراوی بـە سـەر دوو ناوچـەی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی، تا ساتی نووسینەوەی ئەم دێڕانەیش بەردەوامە. لەم ڕووەیـشەوە وەزیـری دارایـی حکومـەتی هـەرێم لـە ٢٠١١/١٢/٢١دا لەبـەردەم پەرلەمانی هەرێمدا وتی: "حکومەتی هەرێم هەتا ئێستا دوو لەتە، ئێوە هەمووتان ئەو ڕاستییە دەزانن، پێویـست ناکـات ئێمـە ئـەو ڕاسـتییە بشارینەوە". وتیـشی "هەتا ئێستا (٢٠١١/١٢/٢١) ئەو بودجەیەی لە بەغداوە دێت، دابەشی دەکرێت بە سەر ئیدارەی سلێمانی و گەرمیان لە لایەکەوە (٤٣٪) و هەولێر و دهۆك لە لایەکی ترەوە (٥٧٪)"[1].

لە کۆی هەموو ئەوانەی باس کران، دەتوانین بڵێین ناکۆکی لە سەر چۆنێتیی دابەشکردنی دەسەڵات و ئەو کێشانەی بە هۆی سیستمی پشکپشکێنەی حیزبیـی نیوەبەنیوە دروستبوون، بوونـە هـۆی دروسـتبوونی لەمپـەڕ لەبـەردەم سیـستمی سیاسیی هەرێمدا و هەروەها بوونە هۆی هەڵایسانی شەڕی ناوخۆ لە نێوان حیزبە کوردییەکان و بە تایبەتییش لە نێوان پارتی و یەکێتی، کە ئەوەیش لای خۆیـەوە بووە هۆی دابەشبوونی هەرێم لە سەر ئاستی حکومی و کـارگێڕی و یاسـایی بـە سەر کۆمەڵێك ناوچەی دەسەڵاتی حیزبە کوردییەکاندا و بـە تایبـەتییش پـارتی و یەکێتی. کۆتاییهـاتنی شـەڕ و کوشـتاری نێـوان ئـەو دوو حیزبـە ڕێخۆشـکەر بـوو لەبـەردەم یەکخـستنەوەی حکومـەت لـە سـەرخانەکەیەوە، بـەڵام بەرژەوەنـدیی حیزبـی ڕێگربـوو لەبـەردەم یەکخـستنەوەی هـەر دوو ئیدارەکـەی هـەرێم. وێـڕای

---

بڵاوکرایەوە، دەتوانن ئەو بەشانە ببینین لە سایتی:

http://standardkurd.net/direje.aspx?Cor=Hewal&Jimare=3420

1. وەرگیراوە لە: کوردیو، بایز تاڵەبانی: حکومەتی هەرێم تا ئێستا هەر دوو پارچەیە...، لە سایتی:

http://www.kurdiu.org/hawal/index.php?pageid=92730

هەروەها بڕوانە: لڤین پرێس، بایز تاڵەبانی، تا ئێستا سێ جار داواکراوە وەزارەتی دارایی یـەك بخرێتـەوە بەڵام نەکراوە، لە سایتی:

http://lvinpress.com/K_Direje.aspx?Jimare=6614&Besh=Hewal&Cor=1

سازدانی دوو خولی هەڵبژاردن لە هەرێمدا، بێجگە لە (٣) خولی هەڵبژاردن لە سەر ئاستی فیدراڵی لەو کاتەوە کە شەڕی ناوخۆی نێوانیان تەواوبوە، بەڵام هەر دوو حیزب بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان داوە بارودۆخی ئێستا وەك خۆی بمێنێتەوە. بەڵام لە بەرامبەردا دەرەنجامی خراپیی ئەو هاوکێشە حیزبییەی دابەشکردنی دەسەڵات و ئەو گەندەڵییەی لە هەرێمدا تەشەنەی سەندوە و ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پرۆسەی دیموکراسی دەبنەوە لە هەرێمدا، بوونە هۆی دەرکەوتنی ناڕاستەیەکی جەماوەری و مەدەنی و سیاسی، کە ئامانجی ڕاستکردنەوە و چاکسازیی بونیادی سیستمی سیاسییە لە هەرێمدا، هەروەك بووە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی گۆڕان و دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا[1].

### ٢: ئاستەنگەکانی بەردەم پرۆسەی دیموکراسی لە هەرێمدا:

سیستمە دیموکراسییەکان بە درێژایی مێژوو سەرکەوتنی خۆیان سەلماندوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکان و مەترسی و هەڕەشە ناوخۆیی و دەرەکییەکان. بۆ نموونە سیستمە دیموکراسییەکانی ڕۆژاوا لە دوو جەنگی جیهانیدا و هەروەها لە جەنگی ساردیشدا سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە بە سەر سیستمە تۆتالیتارییەکاندا، کە خۆیان لە پاشا و قەیسەرەکان و لە نازیزم و فاشیزم و کۆمۆنیزمدا دەبیننەوە. هاوکات ئەو سیستمە دیموکراسیانە توانیویانە زۆر بە سەرکەوتوویی ڕووبەڕووی قەیرانە سیاسی و ئابوورییە ناوخۆییەکانیان ببنەوە و بەڕێوەیان ببەن و بیانکەن بە خاڵی گۆڕانکاری بەرەو گەشەکردن و نوێبوونەوە، بە پێچەوانەی سیستمە تۆتالیتارییەکان کە چارەسەرنەکردنی ئەو قەیرانانە لە سایەیاندا دەبێتە هۆی کەڵەکەبوونیان و گەورەبوونی قەبارە و پانتاییان، کە ئەوەیش دوا جار دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی ئەو سیستمانە،

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. رشيد عمارة ياس و يوسف محمد صادق، مصدر سابق، ص ١٤ – ٢٨.

هەرەسی سیستمە کۆمۆنیستەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیێت نموونەیەکی زەقن لەم ڕووەوە.

میکانیزم و پێکهاتە بنەڕەتییەکانی سیستمی دیموکراسی وەك ئازادیی ڕادەربڕین و فرەیی سیاسی و ئاڵوگۆڕی ئاشتییانەی دەسەڵات، بوار دەڕەخسێنن لەبەردەم دۆزینەوەی خێرای کەموکورتی و هەڵەکان و پێشنیازکردنی چارەسەری گونجاو بۆیان لە ڕێگەی بەرنامەی سیاسیی هەموو لایەنە سیاسی و مەدەنییەکان و هەروەها پێشنیازکردنی بەرنامەی جێگرەوە لە لایەن لایەنە ڕکابەرەکانی دیکەوە. ئەم پرۆسەیەیش زۆر بەسادەیی دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی کەموکورتی و، کەلێنەکان و گەشەکردن و نوێبوونەوە بەدرێژاییی هەموو خولەکانی هەڵبژاردن. هاوکات ئەو میکانیزمانە سەقامگیریی سیاسییان لێ دێتە دی بۆ مەودای دوور، بە هۆی ئەو زەمینەسازییەی دەیکات بە ئاراستەی چارەسەرکردن و بەڕێوەبردنی ململانێ سیاسییە ناوخۆییەکان بە ڕێگای ئاشتییانە و ڕەخساندنی هەلی چوونیەك لەبەردەم هەموو ڕکابەرەکان و لایەنەکانی ململانێ بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە ڕێگای کێبەرکێ لە سەر بە دەست هێنانی دڵی هاوڵاتییان.

دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی ڕاستەقینە لە هەرێمدا دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە ڕووی سەقامگیرکردنی ئارامیی سیاسی تیایدا و یارمەتیدەر بێت بۆ دانانی هەرێم لە سەر ڕێچکەی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بەهێزکردنی بە جۆرێك بتوانێت دەرفەتە نێودەوڵەتی و ناوچەییيە ڕەخساوەکان لە داهاتوودا وەبەر بهێنێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە دەستنیشانکراوەکان و دوورخستنەوەی هەڕەشە چاوەڕوانکراوەکانی سەری، بەڵام پرۆسەی دیموکراسی لە هەرێمدا، ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگی گەورە دەبێتەوە، دەبنە هۆی لاوازکردنی لە ڕووی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دنیای دەرەوە و هەروەها شلۆقکردنی ئارامیی ناوخۆیشی. لە خوارەوە باسی گرینگترینی ئەو ئاستەنگانە دەکەین، بە ئاماژەدان بە واقیعی توخمە دیموکراسییەکانی ئەزموونی دەسەڵات لە هەرێمدا.

### ٢-١: نەبوونی دەستوور:

دەستوور لە سیستمە دیموکراسییەکاندا ئەو گرێبەستە کۆمەڵایەتییەیە، کە لە نێوان تاکەکانی گەلدا دەبەسترێت، لەپێناوی دانانی ڕێساکانی گەمەی دیموکراسی و سنووردانان لەبەردەم دەسەڵاتی ڕەهای فەرمانڕەواکان و ئامادەکردنی میکانیزم و ئامرازە ئاشتییانەکانی ئاڵوگۆڕکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات و زامنکردن و پاراستنی ماف و ئازادییە تاکەکەسییەکان. بە واتایەکی تر (هەبوونی دەستوور و پابەندبوون پێوەی ڕێگە خۆش دەکات، بۆ پاراستنی سیماکانی تری سیستمی دیموکراسی[1].

نەبوونی بەڵگەنامەیەکی دەستووری لە هەرێمدا، کە بە شێوەیەکی ڕوون پەیوەندییەکانی هاوڵاتی بە دەسەڵاتەوە و پەیوەندیی حیزب بە حکومەتەوە و پەیوەندیی سێ دەسەڵاتی دادوەری و یاسادانان و جێبەجێکردن دیاری بکات، یەکێکە لە گرنگترین کێشە سیاسییەکانی هەرێم. ئەوەیش بوەتە هۆی بە دامەزراوە نەکردنی ئەزموونی دەسەڵات لە هەرێمدا و ناڕۆشنیی سنووری سێ دەسەڵاتەکە و زاڵ نەبوونی هەندێکیان بە سەر هەندێکی تریاندا و زاڵبوونی دەسەڵاتی هەر دوو حیزبەکە بە سەر هەرسێکیاندا و توانەوەی حکومەت لە ناو دوو حیزبە دەسەڵاتدارەکەدا و گەشەکردنی هەر ناکۆکییەکی نێوان ئەو دوو حیزبە بە ئاڕاستەی ململانێی خوێناوی.

لە هەمان کاتدا ئەو پرۆژەی دەستووری هەرێمەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، کەموکورتییەکی زۆری تێدایە. ئەو پرۆژەیە پێدەچێت بۆ ئەوە نووسرابێت سنووری دەسەڵاتی جێبەجێکردن و بە تایبەتییش سەرۆکی هەرێم فراوانتر بکات لە سەر حسابی دەسەڵاتەکانی تر و هەروەها لە سەر حسابی ماف و ئازادییەکانی

---

1. دێڤید بێتهام و کەوین بۆیل، دیموکراسی چییە؟ ئاشنابوون بە دیموکراسی، وەرگێڕانی شۆڕش جوانڕۆیی، خانەی وەرگێران، سلێمانی، ٢٠٠٢، لا ٣٣.

هاوڵاتییــان. وەك پێــشتریش وتــرا، ئەگەرچــی پرۆژەکــە جــەخت لــە ســەر پەرلەمانیبوونی سیستمی حوکمڕانی دەکاتەوە لـە هەرێمـدا، بـەڵام دەسـەڵاتێکی فــراوان دەدات بــە ســەرۆکی هــەرێم بــە جۆرێــك، کــە دەتوانێــت دەســت لــە دەسەڵاتەکانی حکومەت و پەرلەمان و دادگا وەر بدات[1].

**٢-٢: لاوازیی سەروەریی یاسا:**

ســەروەریی یاســا، یەکێکــە لــەو بناغــە و پایانــەی کــە دیموکراســیی نــوێ لەسەریان وەستاوە، ئەو بناغەیەی ناکرێت ماشێنی دیموکراسی بـە بـێ ئـەو کـار بکات[2]، بۆیە زۆر پێویستە دامەزراوەی داوەری و میکانیزمی چاودێریی سەربەخۆ و بێلایەن و کارا هەبن، سەروەریی یاسا دەستەبەر بکـەن. بـۆ ئـەوەیش کـە ئـەو دامــەزراوە و میکانیزمانــە بتــوانن ڕێزگــرتنی تــەواو لــە یاســا مــسۆگەر بکــەن و ڕێکوپێکی ڕێوشوێنەکان چاکتر بکەن و ستەم نەهێڵن، پێویـستە ڕێگـا لەبـەردەم هەمواندا بە یەکسانی تەواو بکرێتـەوە، بـۆ بـەکارهێنانی ئـەو ئـامرازە ئیـداری و داوەرییانــەی مافــەکانیان دەپــارێزن و ڕێزگــرتنی دامودەزگاکــانی دەوڵــەت و نوێنەرانی دەسەڵاتی گشتی و ئەندامانی کۆمەڵگا لە بڕیارە ئیداری و داوەرییەکان زامن دەکەن[3].

ڕاپــۆرتی ڕێکخــراوی مــەدەنیی ئاســك ( American Society for Kurds) ئاماژە دەدات بە کۆمەڵێك سەرپێچی دادگا و پێشێلکاریی بنەمای یاسا سەروەری لـە هەرێمـدا، لەوانـە: دادگـاییکردنی دەسـتگیرکراوان لـە لایـەن دەزگا

---

1. بڕوانە مادەی (٦٥)ی پرۆژەی دەستووری هەرێم.

2. د. مازن موفق هاشم، لنتكلم في عناصر الديمقراطية، على موقع:
http://www.alrashad.org/issues/17/17-Hashem.htm

3. المعهد الدولي لقانون حقوق الإنسان كلية الحقوق بجامعة دي بول، الديمقراطية و حريات العامة، دار النشر بلا، مكان النشر بلا، ٢٠٠٥، ص ٣٩.

ئەمنی و پۆلیسییەکانەوە، خاوەخاوکردن لە تەواوکردن و یەکلاییکردنەوەی هەندێك کەیس، دەستکاریکردنی پەڕاو و دۆسیەی هەندێك کەیس، کە یەکلایی نەبوونەتەوە، لاوازیی دادگاکان لە ئاست هەندێك کەیسی پەیوەندیدار بە هۆزەکان یان بە دوو حیزبە حوکمڕانەکە، هەبوونی چەندین حاڵەتی ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی لە دژی تۆمەتباران، دەستوەردانی حکومی و حیزبی لە کاروباری دادگادا، فشار خستنەسەر دادگا تایبەتەکان، وابەستەیی هەندێك لە داوەران بە حزبە سیاسییە حوکمڕانەکانەوە، کە کاریگەریی کردووەتە سەر بڕیارەکانیان بۆ بەرژەوەندیی حیزبەکانی دەسەلأت.. تاد[1].

**٢-٣: پێشێلکاریی مافەکانی مرۆڤ و ئازادیە گشتییەکان و ئازادیی ڕادەربڕین:**

مافەکانی مرۆڤ بەشێکی خۆبەخۆی دیموکراسییە[2]، بە واتایەکی تر ناکرێت هیچ سیستمێکی دیموکراسی بهێنینە بەرچاوی خۆمان، بە بێ ڕێزگرتن لە مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییان. بیرۆکەی ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ شتێکی نوێ نییە. مادەی (٢١)ی جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ جەختیکردووەتەوە لەوەی "ویستی گەل سەرچاوە و بنچینەی دەسەلأتی دەوڵەتە"[3]. کەواتە ئەو پەیوەندییە دووسەرەیە، بەوەی

---

1. کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ کورد ASK، پرۆژەی چاودێریکردنی سیستمی دادوەریی هەرێمی کوردستانی عێراق – هەولێر، لە سەر سایتی:

http://www.askurds.org/judiciarymonitoring1.pdf

لە هەمان کاتدا ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتییش ئاماژە بە هەندێك لەو پێشێلکارییانە دەکات، بڕوانە، منظمة العفو الدولیة، بین المجازر و الیأس العراق بعد خمس سنوات، مطبوعات منظمة العفو الدولیة، لندن، رقم الوثیقة Al Index No: MDE 14 / 001 / 2008: مارس/آذار March 2008__، ٢٠٠٨، الطبعة الأولی، ص ٢٠.

2. دیوید بیتام، دیموکراسي و حقوق بشر، ترجمە، محمد تقي دلفروز، إنتشارات طرح نو، تهران، ١٣٨٣ هـ. ش، ص ١٥١.

3. الإعلان العالمي لحقوق الإنسان، G. A. Res. 217 A, UN GAOR، الدورة الثالثة، Supp. No. 1، ١١٣٦ وثیقة الأمم المتحدة رقم A/ 810، ١٩٤٨.

پاراستنی مافەکانی مرۆڤ بەشێکی بنەڕەتی دیموکراسییە و لە هەمان کاتدا گەیشتن بە دەسەڵاتی دیموکراسییانە خۆی لە خۆیدا بەشێکە لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ.

لە لایەکی دیکەوە دیموکراسی پێویستیی بە هەبوونی ئازادیی بیر و بۆچوون و ڕادەربڕینە، بە مافی بڕواهێنان بە هەر بۆچوونێك بە بێ هیچ دەستوەردان و تەگەرەیەك، هەروەها مافی دەستگەیشتن بە زانیاری و بیرۆکەکان و وەرگرتنیان و بڵاوکردنەوەیان لە ڕێگەی هەر ئامرازێکی ڕاگەیاندنەوە بە بێ گوێدانە بەربەست و سنوورە سەپێنراوەکان[1].

لە هەمان کاتدا کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا ئامرازێکی گرینگن بۆ ڕەخنەگرتن لە کەموکورتییەکانی دامەزراوەکانی دەوڵەت، هەروەها بە ئامرازێکی گرینگ دادەنرێن بۆ هۆشیارکردنەوەی هاوڵاتییان و ئامادەکردنی سەکۆ ئازادەکان بۆ مشتومڕی سیاسی و دروستکردنی ڕای گشتی و فشارکردن بە ئاراستەی چارەسەرکردنی کێشە و کەموکورتییەکان[2].

لە هەرێمدا هەندێك لە مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییان پێشێل دەکرێت، وەك مافی خۆپیشاندان. ئەوەتا وێڕای ناساندنی ئەو مافە لە دەستووری عێراقدا[3]، بەڵام ئەو مافە لە هەرێمدا لەبەر ڕۆشنایی یاسای ڕێکخستنی خۆپیشاندان بە هۆی مەرجی وەرگرتنی ڕەزامەندیی لایەنە جێبەجێکار و کارگێڕییەکانی هەرێم، کۆتوبەند کراوە[4]. ڕاپۆرتە نێودەوڵەتییەکانی بواری مافی مرۆڤ ئاماژە دەدەن بە

---

1. المعهد الدولي لقانون حقوق الإنسان كلية الحقوق بجامعة دي بول، مصدر سابق، ص ٤٠.

2. دێڤید بێتهام و کوین بۆیل، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٨.

3. بڕوانە مادەی (٣٨)ی دەستووری عێراق.

4. بڕوانە بڕگەی یەکەمی مادەی سێیەمی یاسای ژمارە (١١)ی ساڵی ٢٠١٠ بۆ ڕێکخستنی خۆپیشاندان لە هەرێمی کوردستان – عێراقدا. ئەزموونی پراکتیکییش سەلماندویەتی کە ئەو یاسایە بووەتە ئامرازێکی کارای دەستی دەسەڵاتداران بۆ ڕێگرتن لە خۆپیشاندان لە هەرێمدا، بۆ نموونە بڕوانە: کوردیو: گرووپی

چەندین حاڵەتی دیکەی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ وەك ئەشکەنجەدان و دەستگیرکردنی تەعەسوفی لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسادا و ناچارکردنی هاوڵاتییان بە بوونە ئەندام لە یەکێك لە دوو حیزبە حوکمڕانەکە، هەروەها کوشتن و بریندارکردنی هاوڵاتییانی خۆپیشاندەر لە ڕێگەی بەکارهێنانی زیاد لە پێویستی هێزەوە لە لایەن هێزەکانی ئاساییشەوە[1].

لە ڕووی ئازادیی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەنووسیشەوە، ئەوە وێڕای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانیی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆ دەرکەوتوون، وێڕای ئەوەیش کە پەرلەمانی هەرێم یاسای ڕۆژنامەنووسی دەرکردووە، بەڵام پێشێلکاریی مەترسیدار لەم ڕووەوە هەبووە. ڕاپۆرتێکی سەنتەری میترۆ بۆ داکۆکی لە مافی ڕۆژنامەنووسان، ساڵی ٢٠١١ی بە خراپترین ساڵ ناو برد، لە ساتەوەختی دامەزراندنی هەرێمی کوردستانەوە لە ڕووی ئازادیی ڕۆژنامەنووسییەوە. سەنتەرەکە لەو ساڵەدا

---

٤٠٠ لە چوارچێوەی یاسای خۆپیشاندانداندا داوای مۆڵەت بۆ خۆپیشاندان دەکەن و پارێزگاری سلێمانی مۆڵەتیان پێ نادات.لە سایتی:

http://www.kurdiu.org/hawal/index.php?pageid=59350

1. بڕوانە: تقرير منظمة العفو الدولية لعام ٢٠١٠، حقوق الإنسان في الجمهورية العراقية، على موقع:
http://amnesty.org/ar/region/iraq/report-2010

هەروەها، منظمة العفو الدولية، بين المجازر و اليأس العراق بعد خمس سنوات، مصدر سابق، ص ٢٠. و كذلك ينظر:

U.S. DEPARTMENT OF STATE, 2010 Human Rights Report: Iraq, April 8, 2011, In site:

http://www.state.gov/j/drl/rls/hrrpt/2010/nea/154462.htm

هەروەها، منظمة العفو الدولية، حالة حقوق الإنسان في منطقة الشرق الأوسط و شمال أفريقيا من يناير/ كانوون الثاني الى اواسط أبريل/ نيسان ٢٠١١، مطبوعات منظمة العفو الدولية، لندن، رقم الوثيقة: Index: POL 10/ 012/ 2011 Arabic، مايو / ايار ٢٠١١ May، الطبعة الأولى، ص ١٩. دەکرێت دەقی ڕاپۆرتەکەیش لە سەر ئەم سایتە بخوێننەوە:

http://amnesty.org/ar/library/asset/POL10/012/2011/ar/f797ad21-8843-474f-b376-1686f8c67960/pol100122011ara.pdf

نزیکەی (٢٥٩) پێشێلکاریی جۆراوجۆری مافەکانی ڕۆژنامەنووسانی تۆمار کرد، لەنێو ئەو پێشێلکارییانەیشدا (٤) برینداربە هۆی تەقەکردنەوە و (٨) حاڵەتی سووتاندن و تێکوپێکدانی نووسینگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و (٨٥) حاڵەتی دەستدرێژی بە لێدان و (٥٧) هەڕەشە و.. تاد[1] هەبوون.

## ٢-٤: سەرپێچییەکانی هەڵبژاردن:

ڕەگەزێکی تری بنەڕەتی لە پیادەکردنی دیموکراسیدا، خۆی لە ڕێکخستنی هەڵبژاردنی ئازادانە و پاکدا دەبینێتەوە لە کۆمەڵێك وادەی ڕێکخراودا، کە گەل تیایاندا گوزارشت لە ویستی خۆی دەکات. پێویستیشە ئەو هەڵبژاردنانە لە سەر بنەمای دەنگدانی گشتی و دادپەروەرانە و نهێنی بەڕێوە بچن، بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی دەنگ دەدەن نوێنەری خۆیان لە سایەی یەکسانی و ئازادی و شەفافیەتێکدا هەڵبژێرن کە کێبەرکێی سیاسی تاو بدات[2]. بەڵام هەڵبژاردن هەموو شتێك نییە لە دیموکراسیدا، ڕاستە هەڵبژاردن ڕەگەزێکی پێکهێنەری دیموکراسییە، بەڵام بۆ ئەوەی هەڵبژاردنەکە هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە بێت پێویستە لە سەر بنچینەی دیموکراسی دامەزرابێت، واتە لە سەر بنچینەی یەکسانی لە توانا و دەرفەت و ئامرازدا. ئەگینا ئەو دیموکراسییەی ئامانجی ئەوەیە گەل دەسەڵاتدارانی خۆی هەڵبژێرێت، تەنها کۆمەڵێك دەسەڵاتدار بەرهەم دەهێنێت، کە سەر بە یەك گروپن، یان بە واتایەکی تر سەر بە یەك چینن: چینی هەمیشە دەسەڵاتدار لە سایەی هەلومەرجێکدا کە یەکسانیی تێدا نییە. لە سەر

---

1. بڕوانە، تقرير مركز مترو السنوي حول الإنتهاكات التي تعرض لها الصحفيون في إقليم كردستان عام ٢٠١١، دار النشر بلا، السليمانية، ٢٠١٢. هەروەها، HUMAN RIGHTS WATCH، عند مفترق الطرق حقوق الإنسان في العراق بعد ثماني سنوات من الغزو بقيادة الولايات المتحدة، على موقع: http://www.hrw.org/ar/reports/2011/01/20

2. المعهد الدولي لقانون حقوق الإنسان كلية الحقوق بجامعة دي بول، مصدر سابق، ص ٢٨.

ئەو بنەمایە هەڵبژاردن واتە دیاریکردن، کە دەڵێین مرۆڤێك هەڵدەبژێرێت، واتە ئەو مرۆڤە کۆمەڵێك ڕێگا و ئەگەر خراونەتە بەردەمی بۆ ئەوەی کامیانی بە دڵە ئەوەیان دیاری بکات[1].

بۆ ئەوەیش کە هەڵبژاردن مانای خۆی لە دەست نەدات، پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت، کە وەك بنەمای سەرەکیی هەموو پرۆسەیەکی هەڵبژاردنن، هەروەك دەبنەوە بە مەرجی بنەڕەتی مسۆگەرکردنی بە دیموکراسی مانەوەی پرۆسەکە[2]:

- مافی گەل لە سازدانی هەڵبژاردن و بەشداری لە خۆکاندیدکردن و دەنگداندا، بەو مانایەی پێویستە هەموو هاوڵاتییان مافی دەنگدان و بەشداریکردنیان هەبێت لە کاروباری گشتیدا.
- پێویستە ڕێوشوێنەکانی دەنگدان، ئازادیی دیاریکردن و چوونیەکی هاوڵاتییان لە ڕووی قورسایی دەنگەوە و شاردراوەیی دەنگدانەکە و، ڕاست و دروستیی جیاکردنەوەی کارتەکان زامن بکات.
- پێویستە هەڵبژاردنەکان ناوەناوە و بەردەوام بن بۆ ئەوەی دەرفەت لەبەردەم هاوڵاتییاندا هەبێت نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن و بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا بکەن و کاریگەرییان هەبێت بە سەر بڕیارە سیاسییەکانەوە[3].

---

1. د. محمد عابد الجابري، الديمقراطية و حقوق الإنسان، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٤، ص ص ١٦- ١٧.
2. رواب جمال، النظم الإنتخابية، ص ص ١- ٢، على موقع، في ٣١/ ١/ ٢٠١٢.
http://www.scribd.com/doc/77534331/%D8%A7%D9%84%D9%86%D8%B8%D9%85-%D8%A7%D9%84%D8%A7%D9%86%D8%AA%D8%AE%D8%A7%D8%A8%D9%8A%D8%A9-%D8%B1%D9%88%D8%A7%D8%A8-%D8%AC%D9%85%D8%A7%D9%84
3. ڕێکخراوی دیاکۆنیای سویدی، دیموکراتی سیاسەت، ئامادە و وەرگێڕانی: فرسەت ئەحمەد – موئەیەد تەیب – تێلی ئەمین، چاپخانەی خەبات، دهۆك، چ ٣، ٢٦٩٩ ك، ل ٢٥ – ٣٦.

- پێویستە هەڵبژاردنەکان لە چوارچێوەی ڕێزگرتنی مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییاندا بەڕێوە بچن.
- بازنەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دیاری بکرێن، بە جۆرێك وردترو گشتگیرتر ویستی دەنگدەران ڕەنگ بداتەوە تیایاندا.
- پێویستە دەسەڵاتێك یان ئۆرگانێکی سەربەخۆی جیاواز لە دەسەڵاتەکانی دیکەی دەوڵەت سەرپەرشتی یان چاودێریی پرۆسەکانی هەڵبژاردن بکات بۆ ئەوەی بێخەوشییەکەی بپارێزێت، هەر وەك پێویستە بڕیارەکانی ئەو ئۆرگانە قابیلی تانەدان بێت لەبەردەم دەسەڵاتی دادوەری.
- کێبەرکێی شەرەفمەندانە لە هەڵبژاردنەکاندا.
- ئازادیی بانگەشەی هەڵبژاردن.

سەرپێچی و پێشێلکاریی زۆر لە هەڵبژاردنەکانی هەرێمدا هەیە. بۆ نموونە هیچکام لە هەڵبژاردنە گشتی و ناوخۆییەکان لە وادەی دیاریکراوی خۆیاندا بەڕێوەنەچوون، بەگوێرەی یاسای هەڵبژاردنەکان. لە ڕووی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی هەرێمەوە (٣) خولی هەڵبژاردن لە ساڵەکانی ١٩٩٢و ٢٠٠٥و ٢٠٠٩ ڕێکخراون. تەنانەت هەڵبژاردنەکانی خولی سێیەمیش، وەك پێشتر باسمان کرد، چەند مانگێك لە وادەی خۆی دوا کەوت. هەمان شتیش سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان ڕاستە، کە تا ئێستا تەنها یەك جار بەڕێوە چووە لە ساڵی ٢٠٠٥دا، لە کاتێکدا ماوەی یاسایی کاری ئەنجومەنی پارێزگاکان خۆی چوار ساڵە.

جگە لەوانە، چەندین خروقات لەو هەڵبژاردنانەدا ڕوویان داوە، کە لە هەرێم بەڕێوەچوون، بە تایبەتییش لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان، کە ڕۆژی ٢٠٠٩/٧/٢٥ بەڕێوە چوو. لە بانگەشەی هەڵبژاردن و لە ڕۆژی دەنگدانیشدا چەندین سەرپێچی و ساختەکاری ڕوویان دا، وەك دەرکردن لە سەر کار و گواستنەوەی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتییان بە شێوەیەکی پلانرێژکراو بە هۆی وابەستەیی

سیاسییانەوە[1]، ئەوە بوو زۆرێك لە فەرمانبەرانی دەوڵەت لە كار دەركران[2] و زۆرێكی تر لە پۆستەكانیان لابران، لەنێویاندا ڕاگر و سەرۆك بەشی سەر بە دامەزراوەی خوێندنی باڵا[3] و زۆرێك لە كادیرانی لیستە جیاجیاكان هەڕەشەیان لێكرا[4]. بێ لەوانەیش پرۆسەیەكی ساختەكاریی بەرفراوان لە ڕۆژی دەنگداندا

---

1. كاتێك دەڵێین ئەم پرۆسەیە بەرنامەڕێژ بووە، مەبەستمان ئەوەیە كە بڕیارێك (لانی كەم لە ناو یەكێتیدا) هەبووە بۆ فشار خستنەسەر لیستەكانی دیكە و بە تایبەتییش لیستی گۆڕان، لە ڕێگەی دەركردن یان گواستنەوەی زۆرەملێی كادیرەكانییەوە لە ناو دامەزراوە و فەرمانگەكانی حكومەتدا، لەم ڕووەوە مەلا بەختیار لە چاوپێكەوتنێكی ڕۆژنامەی (ئاوێنە)دا دەڵێت: "هەر پۆستێك گەورە بێت یان بچووك، لە بەڕێوەبەری ناحیەیەكەوە لە پۆلیسێكەوە تا ئاسایش و پێشمەرگە و پۆستە بەرزەكان، مادام ئەوانە كاندیدی یەكێتین بۆ ئەو پۆستانە، ئەوە یەكێتی مافی ئەوەی هەیە بیانگۆڕێت یان سزایان بدات یان متمانەیان لێ وەربگرێتەوە، بۆ بینینی دەقی چاوپێكەوتنەكە بڕوانە: ئاوێنە، مەلا بەختیار، مانگانە یەكێتی و پارتی لە٣٠ ملیۆن دۆلار كەمتر لە حكومەت وەرناگرن، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Babet&Cor=Chawpekewtin&jimare=715
2. بۆ نموونە بڕوانە: فەلاح ئەجم، بە پێچەوانەی یاسای هەڵبژاردنەوە، یەكێتی بەردەوامە لە دەركردنی فەرمانبەرە حكومییەكان، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17525&cat=1
3. بۆ نموونە بڕوانە: سبەی، لە سەر لیستی گۆڕان دوو مامۆستا دەركران، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=3810
هەروەها بڕوانە: دلێر عەبدولخالق، ڕاگری كۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەكانی زانكۆی كۆیە لە سەر كار لا دەدرێت، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17397&cat=1
4. بۆ نموونە بڕوانە: سبەی، لە سكاڵایەكدا بۆ ڕای گشتیی سەرۆكی لیستی بزووتنەوەی چاكسازیی كوردستان: ماوەیەكە لە هەولێر و دهۆك فشار دەخرێتەسەر ئەو كەسانەی هاوكاریمان دەكەن، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17459&cat=1
هەروەها بڕوانە: هەڵوێست عوسمان و بەرهەم لەتیف، دیدارێك لەگەڵ د. عبدالمصور بارزانی، گۆڤاری ڕێگا، ژمارە ١٣، ٢٠ی حوزەیرانی ٢٠٠٩، لا ١٧- ١٩.
هەروەها بڕوانە: ئاڵا لەتیف، كاندیدێكی بزووتنەوەی چاكسازیی كوردستان دەستگیركرا، لە سەر سایتی:
http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=8954&LinkID=63

ئەنجامدرا، بە تایبەتییش لە هەر دوو پارێزگای هەولێر و دهۆك[1]، کە بێگومان ئەوە بووە هۆی ساختەکردنی ویستی دەنگدەران و شێواندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان و دەرنەکەوتنی ئەنجامی ڕاستەقینەی دەنگی دەنگدەرن.

---

هەروەها بڕوانە: هاوڵاتی، لیستی پێشکەوتن: ئاسایشی پارتی هەڕەشەی کوشتن لە ئەندامانمان دەکات، لە سەر سایتی:

http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=9555&LinkID=63

1. نیمچە کۆدەنگییەك لە ڕاپۆرتی تۆڕەکانی چاودێریی هەڵبژاردنەکاندا هەیە کە ساختەکارییەکی بەرفراوان لەو هەڵبژاردنانەدا ڕووی داوە، لێرەدا ئاماژە دەدەین بە هەندێك لەو ڕاپۆرتانە، کە چەند برگەیەکیان لە ڕۆژنامە ناوخۆیی و جیهانییەکاندا بڵاوکراوەتەوە.

بەرزان عەلی حەمە، هەڵبژاردن لە هەولێر و دهۆك هەرێمی کوردستان دەخاتە لیستی ڕەشەوە. لە سەر سایتی:

http://chawyxelk.com/NewsDetailN.aspx?id=1873&LinkID=63&Detail=1

هەروەها سبەی، چاودێرێکی گرووپی نەزاهە، تەنها لەو وێستگەیەی منی تێدا بووم ١٢٠ بۆ ١٣٠ دەنگ بەساختە دراوە، لە سەر سایتی:

http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=19195&cat=1

C. *The Economist* print edition, The times they are a-Changing: on site:
http://www.economist.com/world/mideast-africa/displaystory.cfm?story_id=14140770

هەروەها: ئاوێنە، ئینیستیۆتی مافەکانی مرۆڤ: ساختەکاریی بەرفروان کراوە، لە سەر سایتی:

http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=4517

هـ. هەروەها: التقرير النهائي عن مراقبة انتخابات رئيس و برلمان اقليم كردستان العراق، في موقع:

http://www.tammuz.net/news/arabic/03-09-009a.pdf

و. هەروەها: نوێنەری سێ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی: پێشێلکاریی زۆر لە لایەن حیزبی دەسەڵاتدارەوە ئەنجام دراوە، لە سەر سایتی:

http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=10224&LinkID=63

ز. هەروەها بڕوانە: ئاوێنە، تۆڕی شەمس: ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی پێشمەرگە دوو جار دەنگیان داوە، لە سەر سایتی:

http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=4476

ژ. هەروەها بڕوانە: الى رسالة من قنصل فرنسا الى صلاح الدين بهاءالدين رئيس قائمة الإصلاح و الخدمات سابقا في موقع:

http://www.kurdiu.org/fileup3/3278french.pdf

### ٢-٥: فرەحزبی و ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات:

فرەیی سیاسی، مانای هەبوونی زیاتر لە هێزێکی سیاسی دەگەیەنێت لە ناو دەوڵەتدا و ئەوەیش دەگەیەنێت، کە هەلی چوونیەکی (یاسایی و واقیعی)[1] لە نێوان ئەو هێزانەدا هەبێت بۆ کێبەرکێ و ململانێی ئاشتییانە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. بەو مانایەیش سەرکەوتنی هەر حیزبێکی سیاسی لە سیستمی دیموکراسیدا بەستراوەتەوە بە ڕادەی پشتیوانیکردنی جەماوەر لە بەرنامەکانی و کاندیدەکانی بۆ وەرگرتنی پۆستە گشتییەکان، ئەمەیش پێویستی بە هەلی چوونیەك هەیە بۆ هەموو حیزب و هێزە سیاسییەکان، لە ڕووی گەیشتن بە دەنگدەران و ڕاکێشانی سۆزیان، نەك ئەوەی هەندێك لەو حیزبانە بە جیاواز لەوانی دیکە، بۆیان هەبێت سەرچاوەکانی دەرامەتی دەوڵەت بەکار بهێنن بۆ بە دەست هێنانی دەنگی دەنگدەران بە هەموو ڕێگایەك، وەك بەکارهێنانی دامەزراوەکان و کەرەستە حکومییەکانی بانگەشەی هەڵبژاردن و خەرجکردنی سامانی گشتی بۆ کڕینی دەنگی دەنگدەران.

هەبوونی هەلی چوونیەك لەبەردەم حیزبە سیاسییەکاندا، دەبێتە مایەی ئەوەی ڕازیکردنی دەنگدەران و بە دەست هێنانی دەنگەکانیان لە ڕێگەی داڕشتنی بەرنامەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئەوتۆوە، کە خزمەتی ئەو

---

ط. جێی باسە نووسراوێك کە دەوترێت بڵاوکراوەیەکی ناوخۆی پارتییە و، بۆ ڕاگەیاندن دزەی پێ کرا، دان بەوەدا دەنێت کە هەندێك لەکادیرەکانی ساختەیان کردوە و ئەوەیش کاریگەریی خراپی هەبووە بۆ سەر ناوبانگی پارتی، بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەو بڵاوکراوەیە بڕوانە: هاوڵاتی، پارتی دان بەوەدا دەنێت لە هەڵبژاردنەکانی ٧/٢٥دا ساختەکاریی ئەنجام داوە، لە سەر سایتی:

http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=12191&LinkID=63

ی. بە هەمان شێوە گۆڤاری لڤین ڕاپۆرتێکی مەکتەبی ڕێکخستنی پارتی بڵاوکردەوە کە باسی ڕێژەی ساختەکاری دەنگەکانی پارتی دەکات لە هەر دوو پارێزگای هەولێرو دهۆك بەم شێوەیە: هەولێر ٢٠٪، دهۆك ٢٦٪، بڕوانە، مەحمود یاسین کوردی، لڤین دەگاتە مەکتەبە هەستیارەکەی پارتی و زانیارییەکانی بڵاو دەکاتەوە، بەشی دووەم، ژمارە ١٨٤، ١/ ١/ ٢٠١٢، لا ٦- ٩.

1. ڕزگار محەمەد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێدا، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، لا ٣٩.

دەنگدەرانە بکات، گۆڕاوی سەرەکی بێت بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. ئەوەیش دەبێتە هۆی ئەوەی بەرژەوەندی و چاکەی گشتی بخرێتە سەرووی بەرژەوەندییە حیزبی و تاکەکەسییە تەسکەکان.

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە حیزبی سیاسیی زۆر لە هەرێمدا هەن و بە پێی یاسا ئازادیی پێکهێنانی حیزب، ڕێکخراوە[1]، بەڵام ناتوانین باسی فرەحزبیی تەواو بکەین لە هەرێمدا، چونکە بەگوێرەی ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێ کرا، یەکێتی و پارتی دامەزراوە حکومییەکانی هەرێم و سامانی گشتی بۆ بانگەشەی هەڵبژاردن بەکار دەهێنن. هەروەك ئەو دوو حیزبە فشار دەخەنە سەر حیزبەکانی دیکە لە ڕێگەی دەرکردنی کادیرەکانیان لە فەرمانگە و دامەزراوە ڕەسمییەکان و بڕینی ناوەناوەی مینحە داراییەکانیان[2]، تا دەگاتە پەلاماردانی بارەگاکانیان و سووتاندنی ئەو بارەگایانە[3]، بە تایبەتییش لەو ناوچانەدا کە لە

---

1. بڕوانە: مادەی (٣)ی یاسای پارتەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە ١٧ی ساڵی ١٩٩٣ لە: ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان، کۆی یاسا و سیستمەکان، ژمارە ٢، مێژوو ١٩٩٣، لا ٩٤.

2. لە مادەی (١٤)ی یاسای پارتەکانی هەرێمی کوردستان عێراق، ژمارە ١٧ی ساڵی ١٩٩٣دا بە دەق هاتوە کە، ئەو مینحانەی لە بودجەی هەرێم تەرخان دەکرێن بۆ حیزبەکان، بە گوێرەی چەند ڕێسایەك دابەش دەکرێن کە ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان – عێراق بڕیاریان لێ دەدات، بەڵام تا ئێستا ئەو ڕێسایانە ڕێك نەخراون کە لە سەرەوە باسکران، بۆیە ئەو مینحانە هەتا ئێستایش ملکەچی بڕیاری هەر دوو حیزبی دەسەڵاتدارن، کە بۆ نموونە هەر کاتێك هەڵوێستەکانی بزووتنەوەی گۆڕان یان ئۆپۆزسیۆن بە گشتی توندتر بێت مینحەکانیش دەبڕدرێن. بۆ زانینیش پشکی یەکێتیو پارتی لە بودجەی هەرێم ٤,٧٢٠,٠٠٠,٠٠٠ (چوار ملیارو حەوت سەد و بیست ملیۆن) دینارە لە مانگێکدا بۆ هەر لایەکیان. بڕوانە: ژیار محەمەد، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەشید تاهیر بریکاری وەزیری دارایی، گۆڤاری لڤین، ژمارە ١٨٧، شوباتی ٢٠١٢، لا ١٨. ئەمە بێجگە لە مووچەی کادیرە حیزبیو میدیاکارەکانیانو خەرجیی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیان لەگەڵ ئەوەیشدا کە قەبارەی فراکسیۆنەکانیان لە پەرلەماندا تا ڕادەیەك نزیکە لە قەبارەی فراکسیۆنی گۆڕان بۆ نموونە، لە کاتێکدا پشکی مانگانەی بزووتنەوەی گۆڕان ٥٠٠,٠٠٠ (پێنج سەد هەزار) دۆلارە، واتە نزیکەی ٦٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (شەش سەد ملیۆن) دینار، ئەگەر لە بنەڕەتەوە ئەوەیشی بۆ خەرج بکرێت، بڕوانە: د. رشید عمارة یاس و یوسف محمد صادق، مصدر سابق، ص ٣٧.

3. بڕوانە: AFP، المعارضة في كردستان العراق تتحدث عن "انتهاكات" بحق اعضائها، في موقع:

ژێـر دەسـەڵاتی پارتیـدان، بۆیـە دەکرێت بڵـێین سیـستمی حیزبـی لـە هـەرێمی کوردستاندا لە سیستمی تاکە حزبییەوە نزیکترە لە هەر دوو ناوچـەی دەسـەڵاتی دوو حیزبە حوکمڕانەکە، یەکێتی و پارتی.

لـە لایـەکی تـرەوە، پـەیڕەوکردنی دیموکراسـی بـە شـێوەیەکی تەندروسـت، پێویـستیی بــە خوڵقانــدنی هــەلی دەســتووری و یاســایی و سیاســییە بــۆ دەستاودەســتکردنی ئاشــتییانەی دەســەڵات لــە نێــوان حیزبــە سیاســییە ڕکابەرەکاندا، چونکە پرۆسەی گەیشتن بە دەسـەڵات و پیـادەکردنی دەسـەڵات و دەستاودەســتکردنی ئاشــتییانەی دەســەڵات، دەرفــەت دەڕەخــسێنێت بــۆ کێبەرکێیەکی سیاسیی کـراوە لـە سـایەی دیموکراسـیدا، ئـەو کێبەرکێیـەیش لـە بەشدارییەکی میللی پانوپۆڕ و ئازادانە و بێ جیاکارییەوە سەرچاوە دەگرێت[1].

هاوکـات دەنگـدەران دوو پـەیام ئاڕاسـتە دەکـەن لـە پرۆسـەی گـۆڕینی بۆچــوونەکاندا لــە خزمــەتی لایــەنێك و دژی لایــەنێکی تــر، دواتــریش لــە دەستاودەستکردنی دەسەڵاتدا لە نێوان ئەو دوو لایەنە. پەیامێك بۆ ئەو لایەنـەی دەنگدەران دەنگیان پێ نەداوە ناوەرۆکەکەی دەڵێت، بەرنامە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو لایەنە بە دڵی دەنگدەران نەبوە و پێویستە چاکسازییان تێدا بکرێت و پێداچوونەوەیان بۆ بکرێت، هەروەها ئەو لایەنە نەیتوانیوە وەڵامـی ویـست و داخـوازی و پێداویـستییەکانی هاوڵاتییـان بداتـەوە (ئـەو کاتـەی لـە دەسەڵاتدا بووە)، لەم حاڵەتەیشدا ئەو لایەنەی دەسەڵاتی لە دەست چووە، یان لە هەڵبژاردنەکاندا دۆڕاوە، ناچار دەکرێت بـە بەرنامـە و پرۆژەکانیـدا بـچێتەوە و چاکسازی لـە دامـەزراوە حیزبییەکانیـدا بکـات و هەنـدێك لـە نـاوە دیارەکانیـشی بگۆڕێـت، لەوێیـشەوە بــە گیــانێکی نــوێ و پــرۆژەی نوێــوە ئامادەکــاری بــۆ

---

http://www.google.com/hostednews/afp/article/ALeqM5h1spHvJf7n_SVojslg7EfpnmCAyw

1. المعهد الدولي لقانون حقوق الإنسان كلية الحقوق بجامعة دي بول، مصدر سابق، ص ٣٧.

هەڵبژاردنـەكانی داهـاتوو بكـات. لێـرەوە ئـەم پرۆسـەیە دەبێتـە هـۆی دووبـارە دروســـتبوونەوە و نوێبوونـــەوەی حیزبـــە سیاســـییەكان لـــە سیـــستمە دیموكراسییەكاندا، هەروەها لە پرۆسەی دەستاودەستكردنی دەسەلاٚتدا پـەیامێك ئاڕاستەی لایەنەكەی تر دەكرێت، كـە لـە هەڵبژاردنەكانـدا بـراوە بـووە، ئـەویش ئەوەیە، كـە متمانەپێدانی لـە لایـەن دەنگدەرانـەوە بـۆ پیـادەكردنی دەسـەلاٚتی خـۆی، متمانەپێـدانێكی ڕەهـا و هەمیـشەیی نییـە و ئـەمیش ڕووبـەڕووی هـەمان چارەنووسی لایەنە دۆڕاوەكە دەبێتەوە، ئەگەر بەڵێنەكانی بۆ دەنگدەران نەباتـە سەر و وەلاٚمی داواكارییەكانیان نەداتـەوە و بەرژەوەنـدیی گشتی نەهێنێتـە دی. لێرەوەیە دەستاودەستكردنی ئاشتییانەی دەسەلاٚت، دەبێتە هۆی نوێبوونـەوەی بـەردەوام و زینـدوویی پرۆسـەی سیاسـی و هـەروەها بـەدیهێنانی بەرژەوەنـدیی گـشتی و دانـانی ئـەو بەرژەوەندییـە لـە سـەرووی بەرژەوەندییـە تاكەكەسـی و حیزبییە بەرتەسكەكانەوە.

تا ئێستا لە هەرێمی كوردستاندا و دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە بیست ساڵ بـە سەر ئـەزموونی دەسـەلاٚتی كوردیـدا، پرۆسـەی دەستاودەسـتكردنی ئاشـتییانەی دەسـەلاٚت ڕووی نـەداوە، ئەگەرچـی جێگـۆڕكێی پۆسـتەكان لـە نێـوان پـارتی و یەكێتیدا ڕووی داوە، بەلاٚم ڕادەستكردنی تەواوی دەسەلاٚت لە هیچ لایەكیانەوە بۆ لایەكەی تر ڕووی نەداوە، هەروەك دەرفەتی چوونیەكیش بۆ حیـزب و هێزەكـانی دیكە نەڕەخسێنراوە، تا كێبەركێ بكەن لە سەر دەسەلاٚت و دەسەلاٚتیان ڕادەست بكرێت، ئەگەر لە هەڵبژاردنێكی بێخەوشدا براوە بوون، بۆیە پرسیاری سەرەكی لە ئێستادا وەك مەلا بەختیار، ئەنـدامی مەكتـەبی سیاسـی یـەكێتی دەڵێـت ئەوەیـە (ئایا پارتی و یـەكێتی هـیچ براوەیـەكی تـری هەڵبژاردنـەكان لـە ئاییندەدا قبـوڵ دەكەن؟)[1] و ئایا بە شێوەیەكی ئاشتییانە دەسەلاٚتی ڕادەست دەكەن؟

---

1. مەلا بەختیار، پەیامێكی ڕۆژنامەوانی بۆ نێچیرڤان بەرزانی، لە سایتی:

له كۆی هەموو ئەوانەی وتران، دەگەینە ئەوەی ئەگەرچی هەندێك سیما و ڕەگەزی دیموكراسی بوونیان هەیە، وەك هەڵبژاردن و ڕۆژنامەگەریی ئازاد و ژمارەیەك حیزبی سیاسیو.. تاد، بەڵام ئەو كەموكورتی و پێشێلكارییانەی دەرهەق بەو ڕەگەز و سیمایانە ڕوویان داوە، وا دەكەن پرۆسەی دیموكراسی لە هەرێمدا، زیاتر لە پرۆسەیەكی ڕتووشكردن و جوانكاریی سیاسی بچێت و، زۆر لەوەوە دوور بێت، كە لە ڕێگای گەڕاندنەوەی دوا بڕیار بۆ دەستی گەل، چاكەی گشتی بهێنێتەدی، بۆ ئەوەی گەل خۆی نوێنەر و دەسەڵاتدارەكانی خۆی دیاری بكات.

**كۆتایی (دەرەنجام و ڕاسپاردەكان):**

**أ. دەرەنجامەكان:**

١. ئەو زوڵم و ناعەدالەتی و شەڕی جینۆسایدەی ڕژێمە دیكتاتۆرە یەك لە دوای یەكەكانی ڕابردوو دژی گەلی كورد پەیڕەویان كردووە، لە پاڵ پێشێلكردنی مافە سیاسی و نەتەوەیی و مرۆییەكانی، بووە هۆی بەرپابوونی ڕاپەڕینی ئاداری ساڵی ١٩٩١ و قایل نەبوونی گەلی كورد بە گەڕانەوە بۆ بەسەربردنی ژیان لە ژێر سایەی ڕژێمی لەو چەشنانە و، هەنگاونان بەرەو دامەزراندنی سیستمێكی دیموكراسی لە هەرێمدا. بڕیارەكەی ڕژێمی پێشوویش لەمەڕ كێشانەوەی هەموو دامەزراوە سیاسی و ئیداری و سەربازییەكانی لە پارێزگاكانی سلێمانی و هەولێر و دهۆك یارمەتیدەری ئەو ئاڕاستەیە بوو، بەو جۆرەیش ڕێ خۆش كرا بۆ سازدانی یەكەمین هەڵبژاردنی گشتیی پەرلەمانی لە ئایاری ساڵی ١٩٩٢دا، كە وێڕای هەندێك كەموكورتی و سەرپێچی، بە پاكترین و دیموكراسییانەترین هەڵبژاردن دانرا، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

---

http://www.cawder.org/yeke.php?besh=Nusraw&perrge=nusraw&nujimare=22975

٢. وێڕای پەسەند نەکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم، بەڵام ئەوەی لەو پرۆژەیەدا هاتووە، بە تایبەتییش سەبارەت بەوەی پەیوەندیی نێوان هەر دوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنەوە هەیە، هەروەها ئەو یاسایانەی هەڵبژاردن و سنووری دەسەڵاتەکانی پەرلەمان و سەرۆکی هەرێم رێك دەخەن، بە روونی ئاماژە دەدەن بە لادان لە سیستمی پەرلەمانی و بەخشینی دەسەڵاتێکی بەرفراوان بە سەرۆکی هەرێم. ئەوەیش لەوانەیە ببێتە هۆی کۆبوونەوەی دەسەڵاتەکان لە دەستی تاکەکەسێکدا، بە بێ ئەوەی ئەو کەسە هیچ چاودێری و سانسۆرێکی لە سەر بێت، کە ئەوەیش رێخۆشکەر دەبێت لەبەردەم دەرکەوتنی رژێمێکی دکتاتۆریدا، بە تایبەتییش لەو کۆمەڵگایانەدا، کە لە قۆناغی گواستنەوە دان لە سیستمی تۆتالیتارییەوە بەرەو سیستمی دیموکراسی. هەر وەك ئەو لادانە لەوانەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی ئەو هاوسەنگییە نەرم و چاودێرییە دوو سەرەیەی لە نێوان هەر دوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردندا هەیە و بە یەکێك لە گرنگترین خەسڵەتەکانی سیستمی پەرلەمانی دادەنرێت.

٣. نەگەیشتنی هیچ کام لە حزبە کوردییەکان، جگە لە پارتی و یەکێتی، بە ئەنجومەنی نیشتیمانی بە هۆی تێنەپەڕاندنی بەربەستی ٧٪ی دەنگی دەنگدەران لە هەڵبژاردنە گشتییەکەی ساڵی ١٩٩٢دا، بووە هۆی رێکەوتنی پارتی و یەکێتی لە هەمان ساڵدا، لە سەر دابەشکردنی کورسییەکانی کورد لە ئەنجومەنی نوێنەراندا و دابەشکردنی پۆستە وەزارییەکان لە سەر بنەمای نیوەبەنیوە لە نێوان خۆیاندا، تەنها چەند وەزارەتێك نەبێت، کە دران بە حزبە بچووکەکانی دیکە، ئەو دابەشکارییە نیوەبەنیوەیەیش (کە بە سیستمی فیفتی بە فیفتی ناو نرا) شۆڕ بووەوە تەنانەت بۆ ناو هەیکەلی وەزارەت و فەرمانگەکانیش. ئەوەیش بووە هۆی ئیفلیجبوونی پرۆسەی بڕیاردان لە ناو حکومەت و وەزارەتەکاندا، دابەشکارییەکی تەواوی حکومی و کارگێڕیشی جێگیر کرد، لە نێوان دوو

حیزبەکەدا، کە دواتر تەشەنەی کرد و گەیشتە دابەشکردنی سەرلەبەری هەرێم لە نێوانیاندا لە ڕووی سیاسی و یاسایی و کارگێڕی و جوگرافی و سەربازییەوە، بە هۆی ئەو شەڕە ناوخۆییانەوە کە لە ئەنجامی قووڵبوونەوەی دابەشبوونە ناوخۆییەکەوە هەڵایسان و لە ئەنجامی ناکۆکیی دارایی و هەبوونی میلیشیای حیزبی و هەستیاریی کۆنی نێوان پارتی و یەکێتی و ململانێی کۆنی نێوانیان و ڕۆڵی تێکدەرانەی ڕژێمی پێشووی عێراق و دەستوەردانە ئیقلیمییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی وڵاتانی دراوسێ، بە تایبەتییش ئێران و تورکیا، هەموو ئەوانە بوونە هۆی دوورکەوتنەوەی ئەگەری بە دامەزراوە کردنی ئەزموونی کورد لە دەسەڵاتدا.

٤. ئەم سیمایانەی دابەشبوونی ناوخۆیی، تەنانەت دوای ئاگربەستی نێوان پارتی و یەکێتیش درێژەیان کێشا و تا ئەمڕۆیش بەردەوامن، لە ئەنجامی ڕێکەوتننامە و لێکگەیشتنەکانی نێوانیان، کە سەرلەنوێ سیستمی نیوەبەنیوەی بەرهەمهێنا لە نێوانیاندا بۆ دابەشکردنی وەزارەت و فەرمانگەکان و تەواوی دەسەڵاتی هەرێم و هەموو بەشی هەرێمی کوردستان لە حکومەت و دامەزراوە فیدراڵییەکانیشدا لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی پێشووی عێراق.

٥. دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسیی ڕاستەقینە لە هەرێمدا دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ جێگیرکردنی ئارامی و سەقامگیریی سیاسی تیایدا و، دانانی هەرێم لە سەر ڕێچکەی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بەهێزکردنی بە جۆرێک، کە بتوانێت هەلە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکان بقۆزێتەوە، کە لە ئاییندەدا دەڕەخسێن بۆ گەیشتن بەئامانجەکان و دوورخستنەوەی هەڕەشە گریمانەکراوەکانی سەری، بەڵام پرۆسەی دیموکراسی لە هەرێمدا ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگی قووڵ دەبێتەوە، کە دەبنە هۆی لاوازکردنی لە ڕووی

پەیوەندییەکانییەوە بە دەرەوە و دەبنە هۆی شلۆقکردنی سەقامگیریی ناوخۆییشی.

٦. نەبوونی بەڵگەنامەیەکی دەستووری لە هەرێمدا، کە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پەیوەندیی هاوڵاتی بە دەسەڵاتەوە و پەیوەندیی حیزب بە حکومەتەوە و پەیوەندیی نێوان هەر سێ دەسەڵاتی دادوەری و یاسادانان و جێبەجێکردن دیاری بکات، یەکێکە لە گرنگترین کێشە سیاسییەکانی هەرێم، چونکە ئەو حاڵەتە بووەتە هۆی بە دامەزراوەیی نەکردنی ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمدا و ناڕۆشنیی سنووری دەسەڵاتەکانی هەر سێ دەسەڵاتەکە و زاڵبوونی هەندێکیان بە سەر هەندێکی دیکەیاندا. هاوکات پڕۆژەی دەستووری هەرێمیش کەموکورتییەکی زۆری تێدایە و، پێدەچێت ئەو پڕۆژەیە بۆ ئەوە نووسرابێت، سنووری دەسەڵاتەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکار و بە تایبەتییش سەرۆکی هەرێم زیاتر بکات، لە سەر حسابی دەسەڵاتەکانی تر و هەروەها لە سەر حسابی ماف و ئازادییەکانی هاوڵاتییان.

٧. ڕاپۆرتەکانی ئەو ڕێکخراوە مەدەنییانەی، تایبەتن بە چاودێریکردنی دامودەزگا دادوەرییەکان لە هەرێمدا، ئاماژە دەدەن بە لاوازیی بنەمای یاسایەروەری و، ڕوودانی ژمارەیەکی زۆر لە سەرپێچیی دادوەری و دەستوەردانی حکومی و ئەمنی و حیزبی و خێڵەکی و تاکەکەسی لە کاروباری دادگادا و هەبوونی ئەشکەنجە لە دژی دەستگیرکراو و زیندانییان و جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکانی دادگا لە لایەن دەزگا جێبەجێکارەکانەوە و ژمارەیەکی زۆری سەرپێچی تر، کە دەبنە هۆی نایەکسانیی هەمووان لەبەردەم دادگادا و لاوازبوونی متمانەی هاوڵاتییان و هێزە سیاسییەکان بە دادگا، کە لەوانەیە هەر ئەوە ببێتە هۆی تاوسەندنی ناکۆکییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و زیادبوونی توندوتیژیی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە هەرێمدا.

٨. هەروەها لە هەرێمدا هەندێك لە مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییان پێشێل دەکرێن، وەك مافی خۆپیشاندان و حاڵەتی دیکەی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، وەك ئەشکەنجەدان و دەستگیرکردنی تەعەسوفیانە لە دەرەوەی یاسا و ناچارکردنی هاوڵاتییان بە بوون بە ئەندام لە یەکێك لە دوو حیزبە دەسەڵاتدارەکەدا، هەروەها کوشتن و بریندارکردنی هاوڵاتییانی خۆپیشاندەر لە ڕێگەی زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی هێز لە لایەن هێزەکانی ئاسایشەوە. لە ڕووی ئازادیی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەنووسییشەوە، ئەوە وێڕای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانیی سەربەخۆ و نیمچەسەربەخۆ کراونەتەوە، وێڕای دەرچوونی یاسای ڕۆژنامەنووسییش لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە، بەڵام پێشێلکاریی زۆر لەو کایەیەدا ڕووی داوە، کە ڕاپۆرتی ڕێکخراوە پەیوەندیدارەکان ئاماژەیان پێ داون.

٩. وێڕای سازدانی زنجیرەیەك هەڵبژاردنی ناوخۆیی و گشتی لە هەرێمدا، بەڵام هەمیشە پرۆسەکانی هەڵبژاردن ژمارەیەکی زۆر لە کەموکورتی و سەرپێچی و ساختەکاری بە خۆیانەوە دەبینن، کە دەبنە هۆی نوێنەرایەتی نەکردنی ویستی دەنگدەران، بەڵام دەکرێت سەرنجی کەمبوونەوەی ئەو سەرپێچییانە بکرێت لە هەڵبژاردنێکەوە بۆ هەڵبژاردنی دواتر.

١٠. لە ڕووی فرەیی سیاسییشەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ژمارەیەکی زۆر حیزبی سیاسی لە هەرێمدا هەن و ئازادیی دامەزراندنی حیزب بە یاسا ڕێکخراوە، بەڵام ناکرێت باسی فرەحزبیی تەواو بکرێت لە هەرێمدا، چونکە بەگوێرەی ڕاپۆرتە سەربەخۆکانی ئەم بوارە، هەر دوو حیزبی دەسەڵاتدار، پارتی و یەکێتی، دامەزراوە حکومییەکانی هەرێم و سامانی گشتی لە بانگەشەی هەڵبژاردندا بەکار دەهێنن، هەروەك ئەو دوو حیزبە بەشێوازی جۆراوجۆر فشار دەخەنە سەر حیزبەکانی تر، بۆیە دەتوانین بڵێین، سیستمی حیزبی لە هەرێمی کوردستاندا لە

سیستمی تاکحزبییەوە نزیکترە لە سنووری دەسەلاتی هەر یەك لە دوو حیزبە دەسەلاتدارەکە. هاوکات تا ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا و ویڕای تێپەڕبوونی زیاتر لە بیست سالّ بە سەر ئەزموونی دەسەلاتی کوردیدا لە هەرێم، دەسەلات بە ئاشتییانە دەستاودەستی پێ نەکراوە. ئەگەرچی ئالّوگۆڕی پۆستەکانیش لە نێوان پارتی و یەکێتیدا کراوە، بەلام هیچ کام لەو دوو حیزبە تەواوی دەسەلاتی ڕادەستی ئەو تر نەکردووە، هەروەك دەرفەتی چوونیەك بۆ حیزب و هێزەکانی تر نەڕەخسێنراوە، بۆ کێبەرکێ لە سەر دەسەلات و بۆ ئەوەی دەسەلاتیان ڕادەست بکرێت، ئەگەر لە هەلّبژاردنێکی بێخەوشدا براوە دەرچوون..

ب. ڕاسپاردەکان:

١. هەموارکردنەوەی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان بۆ چارەسەرکردنی ئەو لە ڕێ لادانەی لە سیستمی پەرلەمانیدا ڕووی داوە و دۆزینەوەی هاوسەنگی لە نێوان هەر سێ دەسەلاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری، بە مەبەستی سەقامگیرکردنی کۆلّەکەکانی سیستمێکی دیموکراسی مەدەنی لە هەرێمدا، هەروەها بۆ گەیشتن بە هەماهەنگییەکی نیشتیمانی بەرامبەر ئەم پڕۆژەیە.

٢. دووبارە پێکهێنانەوەی هێزی چەکدار و هێزی ئەمنی و هەوالگری لە هەرێمدا بە شێوەیەکی پیشەگەرانە و لە سەر بنەمای نیشتیمانی و بە دوور لە وابەستەیی حیزبی و سیاسی و بە تاوان ناساندنی هەموو ڕێکخستنێکی حیزبی لە ناو ئەو هێزانەدا و بەکار نەهێنانیان لە ململانێ سیاسییەکانی ناوخۆدا، بۆ ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی شەڕە ناوخۆییەکان و بەرزەبتکردنی توندوتیژیی سیاسیی چەکدارانە و خولّقاندنی کەشێکی یارمەتیدەر بۆ ململانێی ئاشتییانەی نێوان حیزبەکانی هەرێم.

٣. گەشەپێدانی دامەزراوەکانی دادوەری و میکانیزمی ئەو چاودێرییە سەربەخۆ و بێلایەن و کارایەی یاساسەروەری زامن دەکات، بۆ ئەوەی ئەو دامەزراوە و میکانیزمانەیش بتوانن ڕێزگرتنی تەواو لە یاسا مسۆگەر بکەن و سەلامەتیی ڕێوشوێنەکان باشتر بکەن و زوڵم نەهێڵن، پێویستە دەرگا بۆ هەموان واڵا بکرێت، وەك یەك بۆ بەکارهێنانی ئەو ئامرازە کارگێڕی و دادوەرییانەی مافەکانیان زامن دەکات و ڕێزگرتنی دامودەزگاکانی دەوڵەت و نوێنەرانی دەسەڵاتی گشتی و ئەندامانی کۆمەڵگا لە بڕیارە کارگێڕی و دادوەرییەکان مسۆگەر دەکات.

٤. زامنکردنی مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییان وەك مافی خۆپیشاندان و مافی ڕادەبڕین و ئازادیی ڕۆژنامەنووسی بە یاسا و هەموارکردنەوەی ئەو یاسایانەی پێچەوانەی ئەو مافانەن، هەروەها گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ پارێزگاریکردن لە ڕۆژنامەنووسان لەبەردەم ئەو دەستدرێژییانەی بەردەوام دەکرێتە سەریان.

٥. دووبارە پێکهێنانەوەی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراقدا لە سەر بنەماگەلێکی پیشەگەرانە و بە دوور لە پشکپشکێنەی تایەفی و حیزبی، لە کەسانێکی پسپۆڕ کە بە پاکی و بوێری ناسرابن، هەروەها پێکهێنانی دەستەی هەڵبژاردنەکان لە هەرێمدا لە سەر هەمان بنەما و، مامەڵەی توندوتۆڵتر لەگەڵ ئەو لایەنانەدا، کە ساختەکاری دەکەن و، ڕێگرتن لە بەکارهێنانی سامانی گشتی و دامەزراوەکانی حکومەت و هێزە چەکدارەکان و هێزە ئەمنییەکان لە بانگەشەی هەڵبژاردندا، ئەوەیش وەك ڕێخۆشکردنێك لەبەردەم ئەو حاڵەتەدا، کە دەنگی دەنگدەران لە سایەیدا ببێتە تاکە پێوەر و دوا پێوەری بە شەرعیبوونی دەسەڵاتی سیاسی لە هەرێمدا.

٦. تۆکمەکردنی کۆڵەکەکانی فرەیی سیاسی لە هەرێمدا لە ڕێگەی بەکار نەهێنانی هێز و سامانی گشتی و دامەزراوە حکومییەکان لە ململانێ سیاسییەکاندا و بە یاساییکردنی مینحە داراییەکانی حیزبە سیاسییەکانی هەرێم لە سەر بنەماگەلیکی شەفاف و دادپەروەرانە، بۆ ڕێگرتن بەکارهێنانی ئەو مینحانە بۆ هەڵوێست کێشانەوە لە هێز و حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن.

## گفتوگۆی سیاسی و یاسایی سەبارەت بە
## "پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان"

ئا. هەڵمەت محەمەد شکور

**سەرەتا**

ژووری توێژینەوەی سیاسی بزووتنەوەی گۆڕان، ڕۆژی شەممە ٢٠١٢/٥/٢٥ لە هۆڵی مۆتێل مەم و زین لە شاری سلێمانی هەستا بە سازدانی وۆرکشۆپێك سەبارەت بە (پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان).

وۆرکشۆپەکە گفتوگۆیەکی کراوە بوو بۆ کۆمەڵێك کەسایەتیی شارەزای بواری دەستووری و یاسایی، کە تیایدا ژمارەیەك مامۆستای زانکۆ و چاودێر و کەسایەتیی سیاسی و ئەندام پەرلەمان و چالاکوانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕۆشنبیر ئامادە بوون.

دەستپێکی گفتوگۆکە بە وتەی بەخێرهاتن لە لایەن (د. ئاکۆ حەمە کەریم- ئەندامی ژووری توێژینەوەی سیاسی) دەستی پێ کرد و لە وتەکەیدا ئامانجەکانی وۆرکشۆپەکەی خستە ڕوو و ئاماژەی دا بە زەروورەتی بوونی دەستوورێکی پێشکەوتوو و مۆدێرن بۆ هەرێمی کوردستان، کە لە غیابی دەستووردا هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکرن و دادوەری تێکەڵ بە یەکتر بوون و سنووری نێوانیان ڕوون نییە، هەر ئەمەیش وای کردووە، دەسەڵاتەکان ببنە پاشکۆی یەکتر و ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستاندا نادامەزراوەیی بێت.

هەروەها وتیشی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان کەموکووڕیی زۆری تێدایە و ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە، کە لە پێناو فراوانبوونی دەسەڵاتی سەرۆکی هەرێم لە سەر حسابی دەسەڵاتەکانی تر نووسراوەتەوە، بۆیە پرۆژەکە هەر لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی ڕەخنە بوویەوە و، بازنەی ناڕازیبوون بەردەوام لە

فراوانبوون دایە و بە ڕادەیەك كۆدەنگیی نیشتیمانی دروست بووە (جگە لە پارتی) لە سەر گێڕانەوە و هەمواركردنی پڕۆژە دەستوورەكە.

لە درێژەی قسەكانیدا، د. ئاكۆ ئەوەیشی خستەڕوو، كە داكۆكیكردنی بزووتنەوەی گۆڕان لە گێڕانەوەی پڕۆژەی دەستوور داكۆكییەكی نیشتیمانییە نەك حیزبی و سیاسی، بەو پێیەی دەستوور فەلسەفەی سیاسی دەوڵەتە و دایكی یاساكانە و تەنها بۆ ئێستا نانووسرێتەوە، بەڵكو بۆ نەوەكانی ئاییندەیشە. هەر بۆیە بزووتنەوەی گۆڕان بە ئەركی ئەخلاقی و نیشتیمانیی خۆی دەزانێت كۆشش لە پێناو هێنانەدی دەستوورێك بكات، كە سەرجەم ماف و ئازادییەكانی هاوڵاتییانی تێدا دەستەبەر كرابێت و ڕەزامەندیی هاوڵاتییانی كوردستانی لە سەر بێت و لە سەر بنەمای سازانی نیشتیمانی سەرجەم هێزەكان دابڕێژرێت.

دواتر بەڕێز د.لەتیف مستەفا (ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) وتەیەكی سەبارەت بە دەستووری هەرێم پێشكەش كرد، هەروەها باسی لە سیستەمە سیاسییەكانی وەك سیستمی پەرلەمانی و سەرۆكایەتی و ئەنجومەنی كرد. ئاماژەی بە پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتەكان كرد لە هەر سێ دەسەڵاتەكەدا، لەگەڵ ئەوەیشدا بە وردی ئاماژەی دا بە شێوازی سیستمی پەرلەمانی لە ڕووی مێژوویی و یاساییەوە، بە نموونە ڕوونی كردەوە كە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان سیستمێكی پەرلەمانی لادەر دروست دەكات.

پاشان بۆ گفتوگۆكردن، بەشداربووانی وۆركشۆپەكە بە پێی پسپۆڕی و شارەزاییان دابەشی (٨) گروپ بوون و تاووتوێی (٨) تەوەری گرینگیان كرد، دواتر ڕێكخەری گروپەكان دەرەنجام و سەرنج و تێبینیی گروپەكەی خۆیان سەبارەت بە پڕۆژە دەستوورەكە خستەڕوو، لە دوو دانیشتندا، ئەو تەوەرانەی گفتوگۆیان لەبارەوە كرا، ئەمانە بوون:

تەوەری یەکەم: پرۆسەی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری دووەم: سیستمی حوکمڕانی لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری سێهەم: ناوچە جێناکۆکەکان لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری چوارەم: کۆمیسیۆنە سەربەخۆکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری پێنجەم: پرۆسەی ڕاپرسی و هەموارکردن لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری شەشەم: دەسەڵاتی دادوەری لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری حەوتەم: پێکهاتەکانی تری هەرێم لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

تەوەری هەشتەم: ئاشتیی کۆمەڵایەتی و پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

### ١: دانیشتنی یەکەم:

دانیشتنی یەکەم لە لایەن بەڕێز (د.دەرباز مەحمەد- ئەندامی ژووری توێژینەوەی سیاسی) بەڕێوە برا و تێیدا ڕاپۆرتی چوار گروپ خرایە ڕوو، بەم شێوەیەی خوارەوە:

### ١-١: پرۆسەی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:

راپۆرتی گروپی یەکەم لە لایەن بەڕێز (کوێستان محەمەد – ئەندامی پەرلەمانی کوردستان) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| ناوی بەشداربووان | ئەرك |
|---|---|
| کوێستان مەحمەد | ڕێکخەری گروپ |
| یوسف محەمەد سادق | ئەندام |
| د. عابد خالید ڕەسوڵ | ئەندام |
| د. شێرکۆ جەودەت | ئەندام |
| شایان محەمەد تاهیر | ئەندام |

**راپۆرتی گروپی پرۆسەی نووسینەوەی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان**

پرۆسەی نووسینەوەی پڕۆژەی دەستووری هەرێم هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی نادیموکراسی دەستی پێ کردووە، چونکە هیچ نەخشەڕێگایەك بە یاسا لە ئارادا نەبوو، تا بە شێوەیەکی قۆناغبەندی پرۆسەکە ڕەنگرێژ بکات. تەنانەت یاسای پەسەندکردنی پڕۆژەی دەستووری هەرێم لە ساڵی ٢٠٠٨، دوای (٦) ساڵ لە یەکەم پەسەندکردنی پڕۆژەکە لە پەرلەمان دەرچووە و، یاساکەیش کەموکرتیی زۆری تێدایە.

پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان لە ٢٠٠٢/١١/٧ واتە پاش زیاتر لە حەوت ساڵ لە تەواوبوونی ماوەی یاسایی خولی هەڵبژاردنی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان، بە بڕیاری ژمارە (٢٦) ی پەرلەمان پەسەند کراوە، بەڵام خولی هەڵبژاردنی دووهەمی پەرلەمان لە ٢٠٠٥/٨/٦ بە بڕیاری ژمارە (٤) بڕیاری دا بیگەڕێنێتەوە بۆ پەرلەمان، بۆ پێداچوونەوەی و لە ٢٠٠٥/٩/٨ لیژنەیەکیشی بۆ هەمان مەبەست دروست کرد بە بڕیاری ژمارە (٥). لە دانانی ئەندامانی لیژنەکەیشدا بنەماکانی نوێنەرایەتیکردنی دیموکراسییانە ڕەچاو نەکراوە.

ئەم لیژنەیە کارەکانی خۆی بە شێوەیەکی ئاسایی و یاسایی ئەنجام نەدا و، بە کۆبوونەوەی نهێنی و بە بێ ئاگاداریی سێیەکی ئەندامانی (٢٢) بڕگە و مادەی گرینگ و جەوهەریی پرۆژەکە دەسکاری کردووە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو نزیکەیدوو ساڵ، لە ئەیلولی(٢٠٠٦)ەوە تا کۆتاییحوزەیرانی(٢٠٠٨)، لیژنەینووسینەوەی دەستوورهیچ کۆبوونەوەیەکینەکردووە بۆ تەماشاکردنیئەو پێشنیازانەیلە لایەن چەندین ڕێکخراویسیاسیو مەدەنیو کەسانیپسپۆڕ و شارەزا نێردرا بوون بۆ لیژنەکە بە مەبەستیدەوڵەمەندکردنی. هەر بۆیەیش د. نوری تاڵەبانی ئامادەکاریی یەکەم پرۆژەی دەستووری هەرێم، لە ٢٠٠٨/٧/٥ دەستی لە ئەندامێتیی لیژنەکە کێشایەوە. تەنانەت بەدەر لە کاری لیژنەکە سەرۆکایەتیی پەرلەمان دەسکاریی هەندێ لە مادەکانی پرۆژە دەستوورییەکەی کردووە.

دواتر پەرلەمانی کوردستان لە ٢٠٠٨/١١/٢٨، یاسای پەسەندکردنی دەستووری هەرێمی کوردستانی دەرچواند. بە پێی ئەو یاسایە نەك هەر ڕێ بە یاساناس و ئەکادیمی و ڕۆشنبیران و هاوڵاتییان نەدرا، کە پێش خستنە ڕاپرسیی پرۆژەکە ڕای خۆیانی لە سەر بدەن، بەڵکو تەنانەت ڕێ بە پەرلەمانتارانیش نەدراوە، کە لە دانیشتنی پەرلەماندا وتووێژ لە سەر پرۆژەکە بکەن. لەمەیش سەیرتر، خولی دووهەمی پەرلەمان بە پێی مادەی دوهەمی یاساکە، خولی هەڵبژاردنی پێش خۆی، کە بۆ ماوەی نزیکەی (١٣) ساڵ درێژەی کێشا، بە دەسەڵاتی دامەزرێنەر ناساندوە، کە ئەمە زیاتر لە پینەوپەڕۆ دەچێ، نەك پرۆسەیەکی تۆکمەی نووسینەوەی دەستوور، چونکە دەسەڵاتی دامەزرێنەر بۆ نووسینەوەی دەستوور لە وڵاتە دیموکراسییەکان، دەبێت بەو سیفەتە لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێت، نەك لە دوای تەواوبوونی خولەکەی و درێژکردنەوەیشی بۆ ماوەی (٩) ساڵ، ئەوجا ئەو سیفەتەی پێ ببەخشرێت.

هەر بۆیەیش پرۆسەی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێم هەر لە سەرەتاوە ناکۆك بوو لەگەڵ بنەماکانی نووسینەوەی دەستوور لە وڵاتە دیموکراسییەکان و تەنانەت زۆر دواکەوتووتر بوو لە پرۆسەی نووسینەوەی دەستووری هەمیشەییی عێراق. ئەوەتا بە پێی مادەی (٦٠) لە یاسای ئیدارەدانی دەوڵەتی عێراق لە قۆناغی ڕاگوزەر، کۆمەڵەی نیشتیمانیی عێراق، کە هەر بە پێی ئەم یاسایە لە ٢٠٠٥/١/٣٠ هەڵبژێردرا، بەرپرسیار کراوە، کە دەستووری عێراق بنووسێتەوە و، هەستێ بە ڕێکخستنی وتووێژی کراوە لە هەموو ناوچەکانی عێراق و لە ڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندن سەبارەت بە پرۆژەی دەستوور و، وەرگرتنی سەرنج و تێبینییەکان و سوودلێوەرگرتنیان لە پرۆسەی نووسینەوەی دەستوور و، پرۆسەکەیش لە عێراقدا هەروا بەڕێوە چوو.

سەرەڕای هەموو ئەم کەموکورتییانەیش، پەرلەمانی کوردستان لە ٢٠٠٩/٦/٢٤ پاش ئەوەی تەنها یەك ڕۆژ بوو پرۆژەی دەستوورەکە خرابووە بەردەم پەرلەمانتاران، پرۆژەکەی پەسەند کرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە خولی هەڵبژاردنی دوهەمی پەرلەمانی کوردستان بە پێی مادەکانی ٤٦ و ٥١ ی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی هەموار کراو، لە ڕۆژی ٢٣/ ٢/ ٢٠٠٩ ماوەی یاسایی تەواو بوو، بەو پێیەی دەرەنجامی کۆتاییی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووهەمی ٢٠٠٥، لە ٢٠٠٥/٢/١٣ ڕاگەیەنرا، چونکە بە پێی ئەم دوو مادەیە، ماوەی پەرلەمان چوار ساڵە و لە یەکەم دانیشتنیەوە دەست پێ دەکات، تا کۆتاییی ساڵی چوارەمی و، دەبێت یەکەم کۆبوونەوەی لە کاتژمێر دەی ڕۆژی دەیەمی پاش ڕاگەیاندنی دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان ببەستێت، بەڵام پەرلەمان بەدەر لە یاسای ئاماژەپێدراو و بە بێ بوونی هیچ پاساوێك لە ٢٠٠٩/٥/١٣ واتە پاش تێپەڕ بوونی زیاتر لە ٢ مانگ و نیو لە کۆتاییی هاتنی ماوەی یاسایی خۆی، بڕیاری بەردەوام بوونی خۆی و سەرۆکی هەرێمی دا و، هەر لەو ماوە نایاساییەیشدا

پـرۆژەی دەسـتووری پەسـەند کـرد و، بڕیـاری دا لـە ٢٠٠٩/٧/٢٥ بیخاتـە ڕاپرسییەوە، کە ئەمەیش ناڕەزاییی زۆری ناوخۆیی لێکەوتەوە. هەر بۆیەیش بە دەیان پارێزەر و یاساناس و مامۆستای زانکۆ و پزیشك و نووسەر و ڕووناکبیر و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و لیستی گۆڕان و نوێنەری پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبییەکانی تری هەرێم و هەزاران هاوڵاتی دەنگی نـاڕەزاییی خۆیـان دژ بەو پرۆژە دەستوورە بەرز کردەوە. لەو ساتەوە تا بە ئێستا بـە هـۆی زیاتر ئاشـکرابوونی فەزیحـەکانی نـاو ئـەو پـرۆژە دەسـتوورییە، بازنـەی ناڕازییـەکانی بەردەوام لە پەرەسەندن دایە، تا ئەوەی ئێستا کۆدەنگیەکی نیشتیمانی جگە لـە پارتی لە ناو هەموو هێزە خاوەن پێگە جەماوەرییەکانی هەرێم دروست بووە (بەو حیزبانەیش پێشتر لە پەرلەمان دەنگیان لە سەر پـرۆژە دەسـتوورییەکە داوە) بـۆ هەموارکردنەوەی. پارتی و سەرۆکی هەرێم ئێستا و ئەوسایش گوێیان بەو هـەموو ناڕەزاییە ناوخۆییە نەدا و، ئەوەی بووە ڕێگر لەبـەردەم تێپەڕانـدنی پرۆژەکـە، ناڕەزایی دەرەوە بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، ئەمەیش خاڵی جیاکەرەوەی سەرجەم سیستمە دیکتاتۆرییەکانی ناوچەکەیە، کە هەمیشە شێری ناوماڵ و ڕێویی دەرەوەن.

بە هۆی شکست هێنـانی پرۆسـەی سەپاندنی پـرۆژەی دەسـتووری هـەرێم، پەرلـەمانی کوردسـتان لـە ٢٠٠٩/٧/٩، یاسـای هـەموارکردنی دوهـەمی یاسـای پەسەندکردنی دەستووری هـەرێمی بـە ژمـارە (١٠)ی سـاڵی ٢٠٠٩ دەرکـرد و، لـە پرۆتۆکۆلی پەرلەمانی کوردستان، ژمارە (٥٣) لاپـەڕە ٣٦١-٣٩٦ لە دەقە کوردی و عەرەبییەکەی لە کاتی خستنە ڕوو و دەنگدانیش لەسەری، دەسـەڵات دراوە بـە سەرۆکایەتیی پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران و لایەنە پەیوەندیـدارەکان کـە بـە هەماهەنگی، کاتی ڕاپرسی لە سەر پرۆژەی دەستوور ئامادە بکەن، بـەڵام کاتێـك کە لە سەرۆکایەتیی هەرێم بڕیارەکە دەرکراوە و لـە وەقـائیعی کوردسـتان ژمـارە

(١٠٤) لە ٢٠٠٩/٨/٣ بڵاو کراوەتەوە، لە دەقە عەرەبییەکەیدا نووسراوە، کە سەرۆکایەتیی هەرێم و ئەنجومەنی وەزیران بە هەماهەنگیی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان، کاتی ڕاپرسییەکە دەستنیشان دەکەن، واتە لە دەقە عەرەبییەکە سەرۆکایەتیی پەرلەمان گۆڕدراوە بۆ سەرۆکایەتیی هەرێم!! سەرەڕای ئەمەیش ئەم یاسایە لە سایتی پەرلەمانی کوردستان بڵاو نەکراوەتەوە.

لە خولی هەڵبژاردنی سێیەمی پەرلەمانی کوردستانیش سەرەڕای ساختەکاری و گزیکاری لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩/٧/٢٥، پاش ئەوەی بزووتنەوەی گۆڕان و هێزەکانی تری ئۆپۆزسیۆن توانیان سێیەکی کورسییەکانی پەرلەمان بە دەست بهێنن و، پاش خۆپیشاندانە جەماوەرییەکانی سەرەتای ساڵی ٢٠١١، پەرلەمانی کوردستان لە ٢٠١١/٣/١٧ بە سازانی هەموو فراکسیۆنەکانی و بە دەنگی (١٠٤) پەرلەمانتار، بڕیاری ژمارە (٢)ی دەرکرد، کە ناوەڕۆکەکەی ڕەزامەندیی بوو لەسەر داواکارییەکانی خۆپیشاندەران، کە داواکاریی یەکەمیشی بریتی بوو لە گێڕانەوەی پڕۆژەی دەستوور بۆ پەرلەمان بۆ پێداچوونەوەی، بەڵام سەرۆکی ئەو کاتی پەرلەمان بە پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان، ئەم بڕیارەی دەرنەکردووە و لە ڕۆژنامەی فەرمی وەقائیعی کوردستان بڵاو نەکراوەتەوە.

پاش ڕەچاو کردنی سەرجەم ئەوەی لەسەرەوە باس کرا، دەکرێت بوترێ:

١. سەرەتای نووسینەوەی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان؛ لەگەڵ بنەما دیموکراتییەکانی پرۆسەی نووسینەوەی دەستووری وڵاتە دیموکراسییەکان یەك ناگرێتەوە.

٢. پرۆسەی نووسینەوەی دەستوور لە هەرێمدا تەنها سپێردراوە بە لیژنەیەك، کە کارەکانی بە شاراوەیی تەنانەت بە بێ ئاگاداریی هەندێ لە ئەندامانی خودی لیژنەکەیش ئەنجام داوە و، هیچ یەکێ لەو سەرنج و تێبینیانەی لە لایەن یاساناس و ئەکادیمی و هاوڵاتییان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی،

بۆ لیژنەکە ڕۆشتوون، لەبەرچاو نەگیراون. تەنانەت ڕای پەرلەمانتارانیشی لە سەر وەرنەگیراوە.

٣. خولی هەڵبژاردنی دووەمی پەرلەمان لە کاتی پەسەندکردنی پڕۆژەی دەستوور شەرعیەتی نەماوە و ماوەی یاسایی خۆی تەواو کردووە.

٤. لە ٢٠١١/٣/١٧ هاوشێوەی ٢٠٠٥/٨/٦، پەرلەمانی کوردستان دووبارە بڕیاری داوە پڕۆژەی دەستوور بگێڕێتەوە بۆ پەرلەمانی کوردستان بۆ هەموار کردنەوەی. ئەمەیش بە ڕوونی لە پرۆتۆکۆلی پەرلەمانی کوردستان ژمارە (٦٤) لاپەڕە (٤٨٤) ئاماژەی پێ دراوە. دەرنەکردنی نایاساییانەی بڕیاری پەرلەمان بۆ ئەم مەبەستە لە لایەن سەرۆکی پەرلەمان، لە سەنگی یاسایی بڕیارەکە کەم ناکاتەوە، هەروەها سەرۆکایەتیی پەرلەمان لە خولی سێیەمیدا بەرپرسیارە لە جێبەجێ نەکردنی ئەو بڕیارە و هەموارنەکردنەوەی پڕۆژە دەستوورییەکە.

کەواتە خستنە ڕاپرسیی دەستووری هەرێم شەرعیەتی یاسایی و سیاسیی نییە و، دەبێ لە پەرلەمانی کوردستان هەموار بکرێ، پێش ئەوەی بخرێتە ڕاپرسییەوە.

**١-٢: سیستمی حوکمڕانی لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:**

ڕاپۆرتی گروپی دووەم لە لایەن بەڕێز (د. لەتیف شێخ مستەفا – ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| ناوی بەشداربووان | ئەرك |
|---|---|
| د. لەتیف شێخ مستەفا | ڕێکخەری گروپ |
| د.ئاکۆ حەمەکریم | ئەندام |
| د. ئومێد ڕەفیق | ئەندام |
| د. سەردار قادر | ئەندام |
| سامی عەبدولقادر ڕێکانی | ئەندام |
| نەجمەدین عەبدوللا عەباس | ئەندام |
| ئامۆ کەریم | ئەندام |

## راپۆرتی گروپی سیستمی حوکمڕانی

## له پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان

١. پێویسته سیستمی سیاسیی هەرێمی كوردستان پەرلەمانی بێت، چونكه سیستمی پەرلەمانی توانای خۆگونجاندنی لەگەڵ هەموو ژینگه جیاوازەكان هەیه و سەركەوتنی به دەست هێناوه له وڵاته جیاوازەكاندا. به پێچەوانەوه سیستمی سەرۆكایەتی یاخود سیستمی لادەر له دەرەوەی وڵاتی دایك (ئەمریكاو فەرەنسا) سەركەوتوو نەبووه، زۆر جار به لاڕێدا براوه و دەسەڵاتی تاكڕەوی و دیكتاتۆری لێ بەرهەم هاتووه، بۆیه پێویسته سیستمی سیاسیی هەرێم پەرلەمانی بێت.

٢. پێویسته سیستمی سیاسیی هەرێم پێچەوانه نەبێت لەگەڵ سیستمی سیاسی له عێراق، به پێی مادەكانی (١، ٧)ی دەستووری عێراق پێویسته دەستوور و سیستمی سیاسیی هەرێمەكان تەبابێت لەگەڵ دەستوور و سیستمی عێراق، كه سیستمی پەرلەمانییه.

٣. له مادەی (١) پرۆژەی دەستووری هەرێمدا هاتووه، كه سیستمی سیاسیی هەرێم پەرلەمانییه، پێویسته ئەم مادەیه ڕەنگدانەوەی له هەموو مادەكانی دەستوورەكەدا هەبێت، نابێت هیچ ماده و بڕگەیەك هەبێت پێچەوانەی ئەم مادەیه بسەلمێنێت و سیستمی سیاسیی هەرێم به لارێدا بەرێت بەرەو سەرۆكایەتی یان هەر مۆدێلێكی تر.

٤. پێویسته مادەی (٦٠) له پرۆژەی دەستووری هەرێم هەموار بكرێت، كه تێدا هاتووه (سەرۆكی هەرێمی كوردستان سەرۆكی فەرماندەی گشتیی هێزەكانی پێشمەرگەیه) پێویسته ئەم دەسەڵاته بگوێزرێتەوه بۆ سەرۆك وەزیران و ئەویش تەنها هێزی پێشمەرگه بگرێتەوه (نەك ناوخۆ) و تەنها بۆ كاتی جەنگ و باری نائاسایی ناوخۆ بێت. له بەرامبەردا سەرۆكی هەرێم تەنها سەرۆكی هێزی پێشمەرگه بێت بۆ مەبەستی پرۆتۆكۆڵ.

٥. مادەی (٦١) هەموار بکرێت و سەرۆکی هەرێمی کوردستان متمانە لە پەرلەمان وەربگرێت، بۆ ئەوەی لە لایەن پەرلەمانەوە چاودێری بکرێت و بەرپرس بێت لەبەردەمی.

٦. مادەی (٦٥) پرۆژەی دەستووری هەرێم دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی داوە بە سەرۆکی هەرێم، پێویستە ئەو دەسەڵاتانە بگوێزرێنەوە بۆ سەرۆک وەزیران و سەرۆکی هەرێم تەنها دەسەڵاتێکی ڕەمزی هەبێت، چونکە لەگەڵ بنەماکانی سیستمی پەرلەمانی ناگونجێت، بەم شێوەیە:

أ. برگەی یەکەم لە مادەکە لابرێت و سەرۆکی هەرێم مافی پێشکەشکردنی پرۆژە یاسای نەبێت.

ب. برگەی دووەم: سەرۆکی هەرێم مافی نارەزایی دەربڕینی نەبێت لە یاسا و بڕیارەکان.

ج. برگەی شەشەم: ئەوەی بۆ زیاد بکرێت، کە پێویستە پاش ڕەزامەندیی پەرلەمان مەرسوم بۆ لە سەر کار لابردنی وەزیر دەر بکرێت.

a. برگەی حەوت بە تەواوی لابرێت.

b. برگەی هەشتەم بگوێزرێتەوە بۆ دەسەڵاتەکانی سەرۆک وەزیران پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمان.

c. برگەی (نۆ) و (دە) بکرێتە هاوشێوەی دەستووری عێراق، بگوێزرێتەوە بۆ دەسەڵاتەکانی سەرۆک وەزیران پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمان.

d. برگەی یازدەهەم: ئەوەی بۆ زیاد بکرێت بە مەرجێ سەرۆکی هەرێم مافی دەنگدانی نەبێت.

e. برگەی (دوازدەهەم) و (سێزدەهەم) بگوێزرێتەوە بۆ دەسەڵاتەکانی سەرۆک وەزیران پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمان.

f.  بڕگەی هەژدەهەم: لەپاڵ ڕەزامەندیی پەرلەمان ڕەزامەندیی ئەنجومەنی دادوەری بۆ زیاد بکرێت.

g.  بڕگەی بیست و یەك: پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمانی بۆ زیاد بکرێت.

h.  بڕگەی (بیست و دوو) و (بیست و سێ) بگوێزرێتەوە بۆ دەسەڵاتەکانی سەرۆك وەزیران.

**١-٣: ناوچە جێناکۆکەکان لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:**

ڕاپۆرتی گروپی سێهەم لە لایەن بەڕێز (د. یوسف گۆران–مامۆستای زانکۆ) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| ناوی بەشداربووان | ئەرك |
|---|---|
| د. یوسف گۆران | ڕێکخەری گروپ |
| د. دەریاز محەمەد | ئەندام |
| لەتیف فاتیح فەرەج | ئەندام |
| مەلا فەرمان | ئەندام |
| ئەحمەد عەزیز | ئەندام |
| پشتیوان ئەحمەد | ئەندام |
| هێمن ئیبراهیم قادر | ئەندام |

**ڕاپۆرتی گروپی ناوچە جێناکۆکەکان لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان**

مەسەلەی تایبەت بە ناوچە جێناکۆکەکان لە پرۆژەی دەستووری هەرێمدا تایبەتە بە سێ تەوەرەوە: **یەکەمیان** پابەندبوونی هەرێمی کوردستان بە ئەرکە نەتەوەییەکەی بەرامبەر بە دانیشتوان و خاکی ئەم ناوچانە، **دووەم،** سنووری

کۆتایی هەرێمی کوردستان، سێیەمیش بە شێوەی مامەڵە کردنمان لەگەڵ پێکهاتەکانی تری کوردستان و شێوەی پەیوەندییەکانمان لەگەڵیان.

**یەکەم: پابەندبوونی پرۆژەکە بە ئیلتیزامی نەتەوەییمان:**

ئاشکرایە دەستوور سەرباری ئەوەی کە یاسایەکی باڵایە شێوەی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتەکان و سنووریان و مافە سەرەکییەکانی هاوڵاتییان شێوەی پاراستنیان دەکا لە وڵاتێکی وەك كوردستان، پێویستە تێڕوانینێکی نەتەوەیی گشتگیری بەرامبەر بە مەسەلە نەتەوەییە باڵاکانمان هەبێ. ئەم پرۆژەیە کەمترین ئاماژە و تێڕوانین و ئیلتزامی نەتەوەیی بەرامبەر بە ناوچە دابڕاوەکان لە خۆ گرتووە.

ڕاستە ئەم دەستوورە بۆ هەرێمی بێ ناوچەدابڕاوەکان نووسراوە، بەڵام ئایا ئەم بەڵگەنامە سیاسییە پێویستی بەوە نییە تێڕوانینی گشتیی بەرامبەر ئەم ناوچانە یەك بخات؟ ئایا پێویست نییە لە ڕێی ئەم پرۆژەیەوە هەندێ ئیلتزامی سیاسی–نەتەوەیی–ئەخلاقی بە سەر نوخبەی سیاسیمان فەرز بکرێت و بکرێتە نەخشەڕێگای مامەڵەکردنیان لەم مەسەلەیە؟

دەکرێت ئەم هەنگاوانە وەك دەسپێك پێشنیار بکرێت

١. لە دیباجەکە ئاماژە بە ناوچە دابڕاوەکان و کوردستانیبوونیان بدرێت.

٢. لە سوێندخواردنی سەرۆکی هەرێم، سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان و پەرلەمان و ئەندامانی، ئاماژە بە پابەندبوونی سیاسی– ئەخلاقییان بەرامبەر ئەم ناوچانە بدرێت.

٣. دوو بۆچوونی جیاواز هەبوو لە سەر ئەوەی ئایا:

بوونی چەند کورسییەکی ڕەمزی لە پەرلەمانی کوردستان تایبەت بێت بە دانیشتوانی ناوچە دابڕاوەکان، ئەم کورسییانە هێمایەك دەبێت بە پابەندبوونی

ئەخلاقی هەرێمی بە دانیشتوان و خاکی ئەم ناوچانەی دەرەوی هەرێم و یەکێتیی کوردستان، دەکرێت ئـەم کورسییانە هـەموو مافێکیـان جگـە لـە مـافی دەنگدان هەبێت. هەندێ ئەندامی گروپەکە لەگەڵ ئەم بیرۆکەیە نەبوون.

یان لەبری ئەوە ئەنجومەنێکی تایبـەت لـە پەرلـەمانی کوردسـتان بـۆ ناوچـە دابڕاوەکان دروست بکرێت، کە دەسەڵات و شێوەی دانانیان بە یاسا رێك بخرێت. ئەم بۆچوونە هەرچەندە کۆدەنگی لە سەر نەبوو، بەڵام پشتگیریی زیاتری هەبوو.

## دووەم: مادەکانی تایبەت بە سنووری هەرێم و مادەی ١٤٠:

١. هەموارکردنی مادەی ٢ بەندی دووەم بەم شێوەیە:

سـنووره سیاسـییەکانی هـەرێمی کوردسـتان–عـێراق، بـە پـشتبەستن بـە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ ی دەستووری فیدراڵییەوە، یـان هـەر رێگەچارەیەکی تر، کە هەرێمی کوردستانی دەیگرێتە بەر بۆ گەڕانەوەی ئەو ناوچانە دابڕاوانـەی، کە لە مادەی ٢ بەندی یەکەم ناویان هاتووە دیاری دەکرێت.

زیادکردنی ئەم دێڕە گرینگـە، چـونکە کاتێك ئـەم ڕەشنووسـە نووسـرابۆوە زۆربەی لایەنەکان پێیان وابوو، کە مادەی ١٤٠ لە سەدا سەد جێبـەجێ دەکرێت، بەڵام بە پێـی پێشهاتەکانی ئێستا و بـۆ ئـەوەی ئێمـە لـە ڕووی دەسـتوورییەوە دەسـتی خۆمـان تـەنها نەبەسـتینەوە بـەم مادەیـە بـۆ گەڕاندنـەوەی ناوچـە دابڕاوەکان، پێویستە رێگەچارە دەستوورییەکانمان لە مادەی ١٤٠ فراوانتر بێت.

٢. هەموارکردنی مادەی دوو خـاڵی یـەك بـە زیـادکردنی بـەدرە و جەسـان و تەلەعفەر.

## سێیەم: ماف و پێگەی کەمینەکان:

بۆ داکۆکیکردن لە مافی کەمینەکان دەستووری هەرێم میکانیزمی ئیـداری لـە شـێوەی ئۆتۆنـۆمی دانـاوە، کـە بێگومـان گرینگـە بـۆ کەمینـەکان. ئـەم بابەتـە

هەرچەندە بەشێکی پەیوەستە بە ئێستای هەرێم و مافی پێکهاتەکان تیایدا، بەڵام لێرە ئێمە قسە لە سەر پەیوەستی ئەم مەسەلەیە بە ناوچە جێناکۆکەکان و سنووری کۆتاییی هەرێمی کوردستان بکات.

بە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ناوچە جێناکۆکەکان پەیوەستە بە ڕازیبوونی کەمینەکانی ئەم ناوچانە یان ڕەتکردنەوەیان بۆ هاتنەوە بۆ هەرێمی کوردستان، بۆیە شێوەی چارەسەری دەستووریمان بۆ کێشەی کەمینەکان کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لە سەر ئەم مەسەلەیە.

لەگەڵ ئەوەی دەستووری هەرێم لە مادەی (٣٥)دا باسی ئۆتۆنۆمی بۆ پێکهاتەکان کردووە و، کە مەسەلەیەکی گرینگە، بەڵام ئەم جۆرە چارەسەرە کێشەی دەستووری و یاسایی تێدایە:

١. چ گرەنتییەك هەیە، کە ئەم مادانە پاش گەڕانەوەی ناوچەکان بۆ سەر کوردستان کە هەموار ناکرێتەوە بێ ڕەزامەندیی ئەوان، بۆیە پێویستە بەندێك یان زیاتری بۆ زیاد بکرێت بۆ مادەی (٣٥) کە تایبەتە بە کەمینەکان بەوەی بێ ڕەزامەندیی ئەوان برگەکانی تایبەت بە مافی کەمینەکان هەموار نەکرێتەوە.

٢. بەشدارییپێکردنی ئەم پێکهاتانە لە پۆستە باڵاکانی سەرجەم کوردستان پاش گەڕانەوەیان بۆ سەر هەرێم نەك تەنها لە ناوچەکانی خۆیان. ئەم بەشدارییپێکردنە لە دەستووری هەرێم ئاماژە پێ بکرێت.

**١-٤: کۆمیسیۆنە سەربەخۆکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:**

ڕاپۆرتی گروپی چوارەم لە لایەن بەڕێز (ئارام جەمال – بەڕێوەبەری ڕێکخراوی پەیمانگای کوردی بۆ هەڵبژاردن) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| ناوی بەشداربووان | ئەرك |
|---|---|
| ئارام جەمال | ڕێکخەری گروپ |
| شۆرش ئەمین | ئەندام |
| عەتا محەمەد ئەحمەد | ئەندام |
| سەردەشت عەبدولڕەحمان | ئەندام |
| پەیمان عیزەدین | ئەندام |

**ڕاپۆرتی گروپی کۆمیسیۆنە سەربەخۆکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان**

– مادەی (١٠٧)

یەکەم: ئامانجی کۆمیسیۆن دەستە سەربەخۆکان بریتییە لە داکۆکی و پاراستنی بنەما و بەها و بنەماکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و بەدیهێنانی دادپەروەری لە هەرێمدا.

دووەم: لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا، کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان خاوەنی بڕیار و ستراتیژو ڕوانینی سەربەخۆ و بێ لایەنانەی تایبەت بە خۆیانن و ناکەونە ژێر کاریگەریی هیچ کام لە دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەرییەوە.

سێیەم: کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان لە ژێر چاودێریی پەرلەماندا دەبێت.

- مادەی (١٠٨)

کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان لە لایەن پەرلەمانەوە پێکدەهێنرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: دەستنیشانکردن و پاڵاوتن بۆ ئەندامبوون لە ناو ئەنجومەنی باڵای کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکاندا لە لایەن یەك لیژنەی هەمیشەیی یان زیاتری پەرلەمانەوە ئەنجام دەدرێت، بە مەرجێك:

١. سروشتی کاری لیژنەکە/ لیژنەکان لە سروشتی کاری کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان نزیك بێت.

٢. لیژنەکە بنەمای لێهاتوویی و پیشەییبوون و بێلایەنی و ڕاستگۆیی بکاتە پێوەری سەرەکی بۆ پاڵاوتنی ئەندامان.

دووەم: هەڵبژاردن و متمانەسەندنەوە لە ئەندامانی ئەنجومەنی کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان بە دەنگی دوو لە سەر سێی ئەندامانی ئامادەبووی پەرلەمان دەبێت.

سێیەم: پێویستە ئەندامانی ناو ئەنجومەنی باڵای کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان:

١. کەسانی حیزبی نەبن.

٢. بەر لە دەستبەکاربوونیان، بە نووسراوی فەرمی وازیان لە حیزب هێنابێت.

- مادەی (١٠٩)

پێویستە لە پێکهێنانی کۆمیسیۆن و دەستە سەربەخۆکان ڕەچاوی ئەمانە بکرێت:

یەکەم: کۆتای ئافرەتان بە ڕێژەی ٣٠٪ کەمتر نەبێت.

دووەم: پێکهاتــە نەتــەوەیی و ئایینییــەکان لــە ســەر بنــەمای ڕێــژەی نوێنەرایەتییان لە پەرلەماندا.

### ٢: دانیشتنی دووەم:

دانیـشتنی دووەم لــە لایــەن بــەڕێز (د.محەمــەد عــەلی– ئەنــدامی ژووری توێژینەوەی سیاسی) بەڕێوە برا و، تێیـدا ڕاپـۆرتی چوار گـروپ خرایـەڕوو؛ بـەم شێوەیەی خوارەوە:

### ٢-١: دەسەڵاتی دادوەری لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:

ڕاپۆرتی گروپی پێنجەم لە لایەن بەڕێز (بێستوون محەمەد ساڵح – پـارێزەر) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| [illegible] | [illegible] |
| --- | --- |
| بێستوون محەمەد ساڵح | ڕێکخەری گروپ |
| بورهان ڕەشید حەسەن | ئەندام |
| جەمیل ئەنوەر بەرواری | ئەندام |
| دیلمان محەمەد سابیر | ئەندام |
| دانا دارا حسێن | ئەندام |
| ئانیا کورد محەمەد | ئەندام |

### ڕاپـۆرتی گروپـی دەســەڵاتی دادوەری لــە پــڕۆژەی دەسـتووری هــەرێمی کوردستان

- مادەی (77) لەم مادەیە هـاتووە، کـە دەسـەڵاتی دادوەری لـە هـەرێمی کوردستان سەربەخۆیە، پێویستە ئەمەی تێدا زیاد بکرێت:

١. قەزای واقف(پارێزەران).

٢. ئەنجومەنی شورای هەرێم بەشێکە لە دەسەلاّتی دادوەری.

– مادەی (٧٨) بەم شێوەیە دابڕێژرێتەوە، لە جیاتی دادگاکان و دادوەران.

دادگاکان و دادوەران سەربەخۆن و جگە لە یاسا هیچ دەسەلاّتێکی بە سەرەوە نییە.

– مادەی (٧٩) وشەی (دادوەری) بکرێت بە (دادگا).

– مادەی (٨١):

١. زاراوەی پاداشت بکرێت بە مووچە.

٢. ئەم مادەیەیشی بۆ زیاد بکرێت:

هیچ کەسێك مافی حەسانەی یاسایی نییە پێویست بە ڕەزامەندیی مەرجەعەکەی ناکات، کاتێك داوا دەکرێت لە لایەن دادگاوە بێجگە لە ئەندام پەرلەمان و وەزیر کاتێك لە پۆستەکەی دایەوە دوای تەواوبوونی ماوەی ئەرکەکەی لەو پۆستەدا حەسانەکەی نامێنێت.

– مادەی (٨٩): لە بارەی (قەرەبوو) ئەوە زیاد بکرێت (قەرەبوو بە یاسا ڕێك دەخرێت).

– مادەی (٩٢) بەم شێوەیەی لێ بکرێت:

یەکەم: دادگای دەستووری لە ٧ ئەندام پێك دێت بە سەرۆکەکەیەوە، کە لە نێوان دادوەران لە پۆلی یەکەم و ماموستایانی زانکۆ کە خزمەتیان لە ٢٠ سالّ کەمتر نەبێت، لە لایەن دادوەرانی هەرێمی کوردستان هەلّدەبژێرێن.

دووەم: ئەنجومەنی دادوەری ئەندامانی دادگای دەستووری دەپالێوێت.

– مادەی (٩٤): سەرۆك و ئەندامانی دادگای دەستووری پێش ئەوەی دەست بە ئەرك و فەرمانەکانیان بکەن لەبەردەم پەرلەمان سوێندی یاسایی دەخۆن.

- مادەی (٩٥)

شەشەم: بەم شێوەیەی لێ بکرێت: یەکلاکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی دراونەتە پال سەرۆکی هەرێم و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی پەرلەمان ئەمەیش بە یاسا رێك دەخرێت.

- مادەی (٩٧) بەم شێوەیە دابڕێژرێتەوە:بڕیارەکانی دادگای دەستووری یەکلاکەرەوەیەو دەبێت سەرجەم دەسەلأتەکان پابەندبن پێوەی.

- مادەی (٩٨): دوو بڕگەی بۆ زیاد بکرێت بەم شێوەیە:

سێیەم: سەرۆکی ئەنجومەنی دادوەری لە نێوان دادوەرانی پلە ١ و ٢ لە لایەن دادوەران و داواکارانی گشتییەوە هەڵدەبژێرێن بۆ ماوەی (٤) ساڵ و شیاوی نوێکردنەوەیە.

چوارەم: سەرۆکی دادگاکانی تێهەڵچوونەوە لە نێوان دادوەرانی پۆلی یەکەم و دووەم هەڵدەبژێرێت لە لایەن ئەو دادوەرانەی، کە سەر بە ناوچەی تێهەڵچوونەوەن بۆ ماوەی ٤ ساڵ و شیاوی نوێکردنەوەیە.

- مادەی (٩٩) بڕگەی (٣)ی بۆ زیاد بکرێت بەم شێوەیە:

سێیەم: ئەنجومەنی دادوەری بە ڕاوێژ لەگەڵ دادگای دەستووری مافی پێشکەش کردنی پڕۆژە یاسای هەیە، کە پەیوەندیدارە بە دەسەلأتی دادوەری و کاری دادگاکان.

- مادەی (١٠٠):

ئەم دەستەواژەیە زیاد بکرێت (دەستەیەکی سەربەخۆیە بەشێکە لە دەسەلأتی دادوەری).

ئەم بڕگەیەی بۆ زیاد بکرێت:

دووەم: سەرۆکی داواکاری گشتی لە لایەن ئەندامانی داواکاری گشتییەوە هەڵدەبژێرێت بۆ ماوەی ٤ ساڵ و شیاوی نوێکردنەوەیە.

- مادەی (١٠١): ئەنجومەنی شورا نووسراوە دادەمەزرێ نەنووسراوە لە لایەن کێوە، بۆیە دەبێت بنووسرێت: (لە لایەن دەسەلاّتی دادوەری دادەمەزرێت).
- مادەی (١٠٧) زیادکردنی برگەیەك لە دووەمیدا: دەستەی سەربەخۆی مافەکانی مرۆڤ.
- لە دەسەلاّتەکانی سەرۆکی هەرێمدا لە مادەی ٦٥ برگەی ١٨ و ١٩ لا ببرێت.

**٢-٢: پرۆسەی راپرسی و هەموارکردن لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:**

راپۆرتی گروپی شەشەم لە لایەن بەڕێز (دانا سەعید سۆفی- ئەندامی پەرلەمانی کوردستان) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| [illegible] | [illegible] |
| --- | --- |
| دانا سەعید سۆفی | رێکخەری گروپ |
| عەبدوڵای مەلا نوری | ئەندام |
| ئاریان محەمەد عەلی عەباس | ئەندام |
| مستەفا حەسەن قادر | ئەندام |
| چۆمان محەمەد عەلی | ئەندام |
| ئاوات محەمەد کەریم | ئەندام |

**راپۆرتی گروپی پرۆسەی راپرسی و هەموارکردن لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان**

١. هیچ بەربەستێکی یاسایی نییە بۆ هەموارکردنەوەی پرۆژەی دەستوورەکە، یاسای ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠٨ دووجار هەموار کراوە، دەکرێت جاری سێهەمیش هەموار بکرێتەوە.

٢. پرۆژەی هەمواری یاساکە پێشکەش بکرێت، ئەم بنەمایانەی تێدا ڕەنگ بداتەوە.

أ. بڕیاری پێداچوونەوە و هەموارکردنەوە.

ب. لیژنەیەك بۆ پێداچوونەوە دروست بکرێت لە کەسانی شارەزا.

ج. لە پێکهاتەی لیژنەکە پێویستە ڕەچاوی پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکان و ژنان و ناوچە دابڕاوەکان بکرێت.

د. کارو ئەرکی لیژنەکە دیاری بکرێت و ماوەی پێویست بۆ ئامادەکردنی هەموارەکە دیاری بکرێت.

٣. هەمواری پرۆژەی دەستوور بخرێتە بەردەم پەرلەمان بۆ پەسەندکردنی.

٤. لە هەموارەکە بنووسرێت و ماوەیەك دیاری بکرێت بۆ پەسەندکردنی و کۆمیسیۆن پرۆژەی دەستوور دەخاتە ڕاپرسییەوە.

## ٢-٣: پێکهاتەکانی تر لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:

ڕاپۆرتی گرووپی حەوتەم لە لایەن بەڕێز (د. مونا یوحەنا یاقۆ – مامۆستای زانکۆ) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| [illegible] | [illegible] |
|---|---|
| د. مونا یوحەنا یاقۆ | ڕێکخەری گروپ |
| عەدنان مەدحەت سەفر ئەلتائی | ئەندام |
| سیروان عەلی ڕەزا کاکەیی | ئەندام |
| ئامەنگ عارف | ئەندام |
| د.کامیران بەرواری | ئەندام |

## ڕاپۆرتی گرووپی پێکهاتەکانی تر لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان

أ. مافە نەتەوەییەکان:

- دابینکردنی یەکسانی لە نێوان پێکهاتە نەتەوەییەکان، لە پێشەکیی دەستووری هەرێمدا.
- سروودی نیشتیمانی و ئاڵای هەرێم دەربڕی هەموو پێکهاتەکانی هەرێم بێت.
- بوونی نوێنەری پێکهاتەکان لە سەرۆکایەتیی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و یاسادانان.
- گرنگیدان بە زمان و زارەکانی تری هەرێم و پاراستنیان لە فەوتان.
- دادپەروەری لە دابەشکردنی پلە و پایە لە نێوان پێکهاتەکاندا.

ب. مافە ئایینییەکان:

- رێکخستنی ئازادییە ئایینییەکان بە یاسا.
- ناوی کاکەییەکان وەکو ئایینێك لە دەستوور بنووسرێت و، لە ناسنامەی باری شارستانی بە کاکەیی نەك بە موسوڵمان تۆمار بکرێت.
- گرنگیی بە زمانە ئایینییەکان بدرێت.
- ئەنجومەنی پێکهاتە و ئایینەکان سەربەخۆبن و، بە دوور بن لە دەستتێوەردان حکومەت و حیزبە باڵا دەستەکان.

**٤-٢: ئاشتیی کۆمەڵایەتی و پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان:**

راپۆرتی گرووپی هەشتەم لە لایەن بەڕێز (م.سەمەد ئەحمەد - مامۆستای زانکۆ) پێشکەش کرا، گروپەکەیان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:

| [illegible] | [illegible] |
| --- | --- |
| د. شامۆ سەعید | رێکخەری گروپ |
| فەتاح زاخۆیی | ئەندام |
| شیراز شێخو حفطارو | ئەندام |
| د. محەمەد عەلی ئەحمەد | ئەندام |
| رابوون تۆفیق مەعرووف | ئەندام |
| م.سەمەد ئەحمەد | ئەندام |

## راپۆرتی گروپی ئاشتیی کۆمەڵایەتی و
## پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان

یەکەم: ئاشتیی کۆمەڵایەتی لە پرۆسەی نووسینەوە و ئامادەکردنی دەستووردا:

١. پرۆسەی ئامادەکردن و نووسینەوەی پرۆژەی دەستوور بە پێی پرۆسەیەکی سیستماتیك و دیموکراسی بەڕێوە نەچووە، واتە ئەنجومەنێکی تایبەت ئەو پرۆژەیەی ئامادە نەکردووە، وەك (ئەنجومەنی دامەزراندن) بەڵکو خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان ئەو کارەی ئەنجام داوە.

٢. ئەم پرۆژە دەستوورە گوزارشت لە پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی گەلی کوردستان ناکات، بەڵکو گوزارشت لە تاکە پێکهاتەیەکی ناو دەسەڵاتی سیاسی دەکات، بەمەیش ئاشتیی کۆمەڵایەتی دەخاتە مەترسییەوە، چونکە مەرجەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی تێدا نییە، کە گرینگترینیان ڕەزامەندیی لایەنەکانی گرێبەستەکەیە، کە لە ئێستادا نییە.

٣. ئەم دەستوورە لە کاتی نا ئاساییدا و لە لایەن پەرلەمانێکی ماوە بەسەرچووەوە تێپەڕێندراوە، بەمەیش ئەو پەرلەمانە گوزارشتی لە پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان نەکردووە.

٤. بە ڕەچاوکردنی ئەزموونی ئەو وڵاتانەی، کە بەهاری عەرەبی تێدا ڕووی دا، ئەگەر هەر دەستوورێك گوزارشت نەکات لە کۆ یان زۆرینەی کۆمەڵگا، دەبێتە هۆی نائارامی و پاشاگەردانیی کۆمەڵایەتی و قەوارەی سیاسییش دەخاتە مەترسییەوە، هەر بۆیە یەکێك لە داخوازییەکانی خۆپیشاندەرانی ١٧ی شوبات، گەڕانەوە و هەموارکردنەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان بوو.

٥. ئەم پرۆژە دەستوورە لە کاتێکدا دەنگی لە سەر دراوە، کە کەشی کامپینی هەڵبژاردن لە ئارادا بووە، هەندێ لە لایەنەکان خراونەتە ژێر ئیبتزازی

سیاسـییەوە. یـەکێکیش لـە مەرجـەکانی گرێبەسـت ئەوەیـە، کـە لایەنـەکانی گرێبەسـت ڕەزامەنـدبن، بـۆ بەڵگـەی ئەمـەیش لـە ئێستادا لایـەنێکی سـەرەکیی دەسەڵات و دوو لایەنی ئۆپۆزسـیۆن، کـە ئـەوکات لـە دەسـەڵاتدا بـوون دەنگیـان پێدا، ئێستا ناڕازین.

دووەم: ئاشتیی کۆمەڵایەتی لە ناو مادە و بەندەکانی پڕۆژەی دەستووردا:

١. لـە دیباجـەی پـڕۆژەی دەسـتووردا جیاکـاری لـە نێـوان هاوڵاتییـانی کوردسـتاندا لـە سـەر بنـەمای پێشینەی شۆڕشـگێڕی کـراوە، ڕەچـاوی فرەیـی کۆمەڵایەتی و ئیتنی و ئایینیی کۆمەڵگەی کوردستان نەکراوە، ئەمـەیش ئاشـتیی کۆمەڵایەتی دەخاتە مەترسییەوە.

٢. سەبارەت بە چارەنووسـی ناوچـە دابڕاوەکـان، پـڕۆژەی دەسـتوور ڕێگـە چارەیەکی گونجاوی بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناوچانە پێشنیاز نەکردووە، ئەمەیش هەڕەشـە لـە ئاشـتیی کۆمەڵایـەتیی پێکهاتـە نەتـەوەیی و ئایینییـەکانی گـەلی کوردستان دەکات، لەبەر دوو هۆکار:

أ. ئەگەر ئەم دەستوورە لە هەرسێ پارێزگاکەی هەرێم بخرێتە دەنگدانەوە، بەشێکی گەلی کوردستان لە بەشێکی تـری دادەبڕێت، واتـە مـافی دەنگـدانیان لـە سەر ئەم دەستوورە لێدەسەنرێتەوە.

ب. ئەگەر پاساوی دەستوور ئەوە بێت، کە ئاماژە دراوە بەو ناوچـانە، ئەمـە پاساوێکی لاوازە، چونکە گەلی کورد لە ناوچە دابڕاوەکان دەکات بـە گـژ پێکهاتـە نەتەوەیی و ئایینییەکانی تردا، کە دەشـێت ڕای جیاوازیـان لـە سـەر ئـەم پـڕۆژە دەسـتوورە هـەبێت، کەواتـە ئـەم پاسـاوەیش هەڕەشـە لە ئاشـتیی کۆمەڵایـەتی دەکات.

تێبینـی: بـەدەر لـەم دوو تـەوەرە چـەند خـاڵێکی پـۆزەتیڤ لـە پـڕۆژەی دەستووری هەرێم هەیە، کە خزمەت بە ئاشتیی کۆمەڵاتی دەکات، بە دیاریکراوی مادەکانی (٥، ٦، ١٩، ٢٠، ٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣، ٣٤)دا.

**لە دەرەوەی تەوەرەکانی سەرەوە لە کاتی گفتوگۆی کراوەدا تیشك خرایە سەر چەند خاڵێك لە پڕۆژە دەستوورەکە:**

١. ڕەخنە لە پێشەکیی پڕۆژە دەستوورەکە گیرا و زۆر بە لاواز وەسف کرا، بە پێویست زانرا جارێکی تر دابڕێژرێتەوە.

٢. قەدەغەکردنی کاری سیاسی و حیزبی لـە نێو هێزە چەکدارەکان بـە فیعلی.

٣. گرنگ نەبێت کارەکان سەر بە کێن، هێندەی ئەوە گرینگـە ملکەچی پەرلەمان بن.

٤. دەکرێـت سـەرۆك لـە لایـەن خەڵکـەوە هەڵبـژێردرێت و دەسـەڵاتەکانی پرۆتۆکۆڵی بێت.

دوا وتەی گفتوگۆکـە لـە لایـەن بـەڕێز (یوسـف محەمـەد سادق – ڕێکخـەری ژووری توێژینەوەی سیاسـی) خرایـە ڕوو، تێیـدا سوپاسـی ئامـادەبووانی کـرد و، جەختی کـردەوە، کـە بزووتنـەوەی گـۆڕان هـیچ مەبەسـتێکی تەسـکی حیزبـی و گروپی یان شەخسیی نییە لە گێڕانەوەی پڕۆژە دەستوور بۆ پەرلەمان، هـەروەها جەختی لەوە کردەوە لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن لە ئێستادا پـڕۆژە هـەموارێکی بـۆ پڕۆژەی دەستووری هـەرێمی کوردسـتان ئامادەیـە، وتـەی کۆتاییـشی ئـەوە بـوو هیـوای خواسـت پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بێتـە نێـو ئـەو کۆدەگییـە نیشتیمانییەی لە سەر گێڕانەوەی دەسـتوور دروسـت بـووە و مـل بـۆ داواکارییـە جەماوەرییەکان بدات.

## ناو و پیشەی بەشداربووان:

| ژ | ناوی بەشداربووان | پیشە |
|---|---|---|
| ١ | سامی عەبدولقادر ڕێکانی | ئەکادیمی |
| ٢ | د. کامیران بەرواری | مامۆستای زانکۆ |
| ٣ | ئەبوبکر عەلی | ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکگرتووی ئیسلامی |
| ٤ | فەتاح زاخۆیی | نووسەر و ڕووناکبیر |
| ٥ | شیراز شیخو حفطارو | پارێزەر |
| ٦ | شایان محەمەد تاهیر | ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق |
| ٧ | د. شاهۆ سەعید | مامۆستای زانکۆ |
| ٨ | د. ئومێد ڕەفیق | مامۆستای زانکۆ |
| ٩ | د. سەردار قادر | مامۆستای زانکۆ |
| ١٠ | یوسف محەمەد سادق | ڕێکخەری ژووری توێژینەوەی سیاسی |
| ١١ | دیلمان محەمەد سابر | ماستەر لە کارگێڕی |
| ١٢ | عەتا محەمەد ئەحمەد | بەڕێوەبەری ڕێکخراوی (CDO) |
| ١٣ | د. عابد خالید ڕەسوڵ | مامۆستای زانکۆ |
| ١٤ | د. منی یوحنا یاقو | مامۆستای زانکۆ |
| ١٥ | ئارام جەمال | بەڕێوەبەری ڕێکخراوی (KIE) |
| ١٦ | ئاهەنگ عارف | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |
| ١٧ | ڕابوون تۆفیق مەعرووف | چاودێری سیاسی |
| ١٨ | دانا دارا حسێن | پارێزەر- نوێنەری کۆمەڵی ئیسلامی |
| ١٩ | سیروان عەلی ڕەزا کاکەیی | نووسەر |
| ٢٠ | د. محەمەد عەلی ئەحمەد | ئەندامی ژووری توێژینەوەی سیاسی |
| ٢١ | شۆڕش ئەمین | چالاك لە بواری ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی |
| ٢٢ | مەلا قەرمان | ڕۆژنامەنووس |
| ٢٣ | ئەحمەد عەزیز | ڕۆژنامەنووس |
| ٢٤ | نامۆ کەریم | ڕۆژنامەنووس |
| ٢٥ | کامەران عەبدوللا عەلی | چاودێری سیاسی |
| ٢٦ | د. دەرباز محەمەد | ئەندامی ژووری توێژینەوەی سیاسی |
| ٢٧ | لەتیف فاتیح فەرەج | نووسەر و ڕۆشنبیر |
| ٢٨ | نەجمەدین عەبدوللا عەباس | هەڵسووڕاوی بزووتنەوەی گۆڕان |

| ٢٩ | پشتیوان ئەحمەد | پەرلەمانتاری خولی پێشووی ئەنجومەنی |
|---|---|---|
| ٣٠ | بێستوون محەمەد ساڵح | پارێزەر |
| ٣١ | تانیا کورد محەمەد | پارێزەر |
| ٣٢ | چۆمان محەمەد عەلی | پارێزەر |
| ٣٣ | ئاوات محەمەد کەریم | پارێزەر |
| ٣٤ | فەرهەنگ خالید سەعید | پارێزەر |
| ٣٥ | د. شێرکۆ جەودەت | ئەندامی سەرکردایەتیی یەکگرتوو |
| ٣٦ | د.ئاکۆ حەمەکریم | ئەندامی ژووری توێژینەوەی سیاسی |
| ٣٧ | بورهان ڕەشید حەسەن | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |
| ٣٨ | جەمیل ئەنوەر بەرواری | چالاکی سیاسی |
| ٣٩ | مستەفا حەسەن قادر | ماستەر لە یاسادا |
| ٤٠ | دانا سەعید سۆفی | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |
| ٤١ | عەبدوڵڵای مەلا نوری | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |
| ٤٢ | عـــەدنان مەدحـــەت ســـەفر ئەلتائی | نوێنەری (حزب الأخا و التركماني) |
| ٤٣ | ئاریان محەمەد عەلی عەباس | مامۆستای زانکۆ |
| ٤٤ | هێمن ئیبراهیم قادر | مامۆستای زانکۆ |
| ٤٥ | م. سەمەد ئەحمەد | مامۆستای زانکۆ |
| ٤٦ | سەردەشت عەبدولڕەحمان | چالاك لەبواری ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی |
| ٤٧ | کوێستان محەمەد | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |
| ٤٨ | د. لەتیف شێخ مستەفا | ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق |
| ٤٩ | د. یوسف گۆران | مامۆستای زانکۆ |
| ٥٠ | پەیمان عیزەدین | ئەندامی پەرلەمانی کوردستان |

# ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسی‌لە هەرێمی‌کوردستانی عێراق

## (سەرهەڵدان و داهاتووی)*

م. یوسف محەمەد سادق و نووسەرانی تر

لە عەرەبییەوە: سەرکەوت جەلیل

**پێشەکی**

دیموکراسییەتی ڕاستەقینە بریتییە لە بزاوتێکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و کەلتووری، لەپێناو بەدیهێنانی‌بەرژەوەندیی گشتی‌و پاراستن و بەرگریکردن لەو بەرژەوەندییانە، لە بەرامبەر بەرژەوەندییە کەسییە بەرتەسکەکانی کەسانی دەسەڵاتدار (فەرمانڕەوا).

ململانێی ئاشتییانەی‌هێزە سیاسییەکان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات -هەڵبەتە بە پێی‌کۆمەڵێك ڕێسا و یاسای گشتی‌و جێگیر- باشترین و گونجاوترین میکانیزمە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە و هاوکات کرۆك و جەوهەری بزووتنەوە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و کەلتوورییەکانیشە. ئەوەیش واتە ململانێی حیزب و هێزە سیاسییەکان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و مانەوە لە سەر دەسەڵات لەڕێی بە دەست هێنانی ڕەزامەندیی هاوڵاتییانەوە، لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی بەدیهێنانی بەرژەوەندیی

---

* ئەم توێژینەوەیە لایەن سەنتەری عەرەبی بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە سیاسییەکان لە قەتەر، بڵاوکرایەوە. دواتر لە لایەن سەنتەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکان لە ئەنکەرە وەرگێردرا بۆ زمانی تورکی. پاشان سایتی سبەی وەری گێڕا بۆ زمانی کوردی. لینکی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی:

http://www.dohainstitute.org/release/cf7c6b56-126a-47d6-af38-de28e8d10fab

بە زمانی تورکی:

http://www.orsam.org.tr/tr/trUploads/Yazilar/Dosyalar/201337_133rapor.pdf

بە زمانی کوردی:

http://sbeiy.com/Detail.aspx?id=15193&LinkID=14

گشتیو گرەنتیی بەردەوامبوونی دەکات. سەرلەبەری ئەم پرۆسەیەیش پێویستیی بەوەیە، هێزێك یان چەند هێزێك لە سەر دەسەلأت بن، هەولّیجێبەجێکردنیبەرنامەکانیخۆیان بدەن و لە هەمان کاتدا لە ترسیلەدەستدانیڕەزامەندیی و متمانەیهاولأتییان و قبولّنەکردنیبەرنامەکانیان، بەرژەوەندییگشتیفەرامۆش نەکەن، چونکە ئەگەر بێت و زۆرینەیکۆمەلّگە بەو بەرنامانە ڕازینەبن، ئەو هێزانە دەسەلأت لە دەست دەدەن. کۆی ئەم پرۆسەیەیش لە سایەیسیستەمە دیموکراسییەکاندا وا دەخوازێت لایەنێکیتر لە پرۆسەیسیاسیدا هەبێت، کە ئەویش ئۆپۆزسیۆنە. ئۆپۆزسیۆن لایخۆیەوە هەولّ دەدات بگاتە دەسەلأت، بەرنامە و پرۆژەیخۆیدەبێت، کە لە ڕێگەیانەوە هەولّ دەدات هاولأتییان لە خۆیڕازیبکات، لەگەلّ ئەوەیشدا دەیەوێت کەموکورتیی کاریفەرمانڕەوایان بدۆزێتەوە و ئاشکرا بکات و ڕایگشتییان لە دژ بوروژێنێت.

پرۆسەیسیاسیی هەرێمیکوردستانیعێراقیش لەو چوارچێوەیە بەدەر نییە، بە تایبەتیلەم ماوەیەیدواییدا، کە گۆڕانکارییەکیڕیشەییبەخۆوە دەبینێت، کە هیوادارین بیخاتەوە سەر ڕێگەیڕاستیخۆیو وایلێ بکات، زیاتر لەگەلّ ڕۆح و جەوهەریدیموکراسی بێتەوە. ئەو گۆڕانکارییەیش خۆیلە لەدایکبوونیئۆپۆزسیۆنێکیسیاسیتا ڕادەیەك بەهێزدا دەبینێتەوە، کە توانیلە هەلّبژاردنە پەرلەمانیو سەرۆکایەتییەکەیسالّیهەرێمیکوردستاندا، یەك لە سەر سێیکورسییەکانیپەرلەمان بباتەوە.

ئەو گۆڕانکارییە شایەنیگرینگیپێدان و پشکنین و بەدواداچوونە، تا بزانین هۆکارەکانیسەرهەلّدانیئەو گۆڕانکارییە چیبوون و سروشتیئۆپۆزسیۆن لە کوردستاندا بزانین و خالّیلاوازییبدۆزینەوە، سەرەڕایئەوەیکە پێویستە خالّیبەهێزییو هەلیسەرکەوتن و چۆنێتیی مامەلّەکردنیدەسەلأتیسیاسیلەگەلّ ئەو ئۆپۆزسیۆنەدا باس بکەین و بخەینە ڕوو.

بە پێی ئەوەی وتمان، لەم توێژینەوەیەدا هەوڵ دەدەین وەڵامی چەند پرسیارێك بدەینەوە، كە ئەمانەن:

سیستەمی سیاسی لە هەرێمی كوردستاندا چۆن سەری هەڵدا و گەشەی كرد؟ ئایا هاوكات بەو گەشەكردنە، پرۆسەیەكی دیموكراسی تەندروست سەرپێ كەوت؟ هۆكارەكەی چی بوو؟ شێوازەكانی ڕەخنەگرتن لە حوكمڕانی و نیشانە و ئاماژەكانی سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی كوردستاندا چۆن دەستی پێ كرد و هۆكارەكانی چی بوون؟ ئەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی ڕاستەقینە لە هەرێمدا چۆن سەری هەڵدا، هۆكارەكانی سەرهەڵدان و دیارترین سەرچاوەكانی چی بوون؟ لە ئێستادا كاری ئۆپۆزسیۆنی سیاسی چۆنە، سروشتی مامەڵەكردنی دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵیدا چۆنە، ئایا دەسەڵات توانیویەتی لەگەڵ ئەو واقیعە نوێیەدا خۆی بگونجێنێت؟ دیارترین هۆكارەكانی سنووردار كردنی كار و چالاكیی ئۆپۆزسیۆن چین، دیارترین ئەو هۆكارانەی پشتیوانیی لێ دەكەن و هانی دەدەن چین؟ لە كۆتاییشدا داهاتووی ئەو ئۆپۆزسیۆنە و ئاسۆكانی چین و بەرەو كوێن؟

ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات وەڵامی ئەو پرسیارە سەرەكییانە و چەندین پرسیاری تری لاوەكی بداتەوە، لە ڕێگەی گریمانەكردنی ئەوەی كە: "كارلێككردنی چەند گۆڕاوێك لەگەڵ یەكتریدا، بووە هۆی دەركەوتنی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا و بە هێواشی سەرپێكەوتنی، هەروەها دەركەوتنی ئۆپۆزسیۆن لە پاش هەڵبژاردنە پەرلەمانی و سەرۆكایەتییەكەی تەمووزی ساڵی و دەستبەكاربوونی لە مەیدانی سیاسیدا، دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی ئەزموونی حوكمڕانیی سیاسی لە هەرێمدا."

سروشتی توێژینەوەكەمان وای خواست، كە میتۆدی مێژوویی و شیكاریی سیستەماتیكی بەكار ببەین، تا بتوانین ڕیشەكانی پرۆسەی سیاسی لە

هەرێمی‌کوردستاندا بدۆزینەوە و دیارترین دەرهاویشتەکانی‌بزانین، تا لەوێشەوە ڕۆڵی‌ئۆپۆزسیۆن تیایدا ڕوون بکەینەوە و میکانیزمی‌کارکردنی‌دیاری بکەین.

بەو هۆیەیشەوە توێژینەوەکەمان کرد بەم بەشانەی‌خوارەوە:

١: ئۆپۆزسیۆن لە سەرەتای‌دامەزراندنی‌هەرێمی‌کوردستانەوە (١٩٩٢ بۆ ٢٠٠٥)،

٢: نیشانەکانی‌سەرهەڵدانی‌ئۆپۆزسیۆن، خولی‌دووەمی‌پەرلەمانی‌کوردستان (٢٠٠٥ بۆ ٢٠٠٩)،

٣: دەرکەوتنی‌ڕۆڵی‌ئۆپۆزسیۆن، خولی‌سێیەمی‌پەرلەمانی‌کوردستان،

٤: دەستکەوتەکانی‌ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسی‌و بەربەستەکانی‌و داهاتووی‌لە هەرێمی‌کوردستاندا.

## ١: ئۆپۆزسیۆن لە سەرەتای‌دامەزراندنی‌هەرێمی‌کوردستانەوە ( ١٩٩٢ تا ٢٠٠٥ ):

ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسی‌لە هەرێمی‌کوردستاندا لە بۆشاییەوە نەخوڵقاوە، زادەی‌قۆناغی‌دامەزراندنی‌هەرێمی‌کوردستانیش نییە، بەڵکو ڕیشەکانی‌ئۆپۆزسیۆنی‌کوردی‌دەگەڕێتەوە سەر دامەزراندنی‌دەوڵەتی‌عێراق لە ١٩٢١دا. بەڵام ئەو ئۆپۆزسیۆنە دژی‌ڕژێمە سیاسییە یەك لە دوای‌یەکەکانی‌عێراق بوو، بە شێوەیەکی‌تایبەتیش دژی‌حوکمی‌ڕژێمی‌پێشووی‌سەددام حسێن چالاك بوو، کە لە سەردەمی‌ئەودا هەموو شێوەکانی‌ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی‌کوردستاندا دروستبوون.

جێی‌ئاماژەپێدانە، ئەزموونی‌حوکمڕانی‌لە هەرێمی‌کوردستاندا لە ئەنجامی‌ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی‌ئاداری‌ساڵی‌دروستبوو، کاتێك دەوڵەتی‌عێراق هەموو دامودەزگا ئیداری‌و سیاسی‌و سەربازییەکانی‌خۆی‌لە تشرینی‌دووەمی‌هەمان

ساڵدا لە هەرێم کشاندەوە، ئەوەیش وای لە سەرکردایەتیی سیاسیی کورد کرد، بڕیاری دروستکردنی دامەزراوەی یاسادانان و جێبەجێکردن و ئیداریی تایبەت بە هەرێمی کوردستان دەر بکات. سەرکردایەتیی سیاسی بەرەی کوردستانیش[1] _ بە حوکمی ئەوەی دەسەڵاتی دیفاکتۆ بوو_ لە ٨ی نیسانی یەکەم یاسای بە ناوی یاسای ئەنجومەنی نیشتیمانیی ژمارە ١ی ساڵی دەر کرد. یاسای دووەمیشی بە ناوی یاسای هەڵبژاردنی سەرکردەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردستان ژمارە ٢ی ساڵی دەر کرد.

ئەوەی یارمەتیدەری سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان بوو لە ئەنجامدانی ئەو کارانەدا، دەستوەردانی نێودەوڵەتی ساڵی بوو لە عێراق، بە پێی بڕیاری ژمارە (٦٨٨)[2] و دانانی پڕۆژەی دابینکردنی ئاسوودەیی (Provide Comfort) پاش ئەو بڕیارە[3]. ئەوەیش بووە هۆی جیابوونەوەیەکی کردەیی ئەو زەوییانەی لە ژێر

---

1. ئەو بەرەیە لە ١٢ی حوزەیرانی، پاش کۆتاییهاتنی جەنگی ئێران عێراق و دوای هەڵمەتی کۆمەڵکوژیی و بۆردومانی کیمیاویی ڕژێمی پێشووی عێراق دژ بە گەلی کورد لە کوردستانی عێراق، بۆ هەماهەنگیکردن لە نێوان حیزبە کوردییەکان پێك هات، بۆیە هەشت حیزب هاتنە ناو ئەو بەرەیەوە، کە ڕێبەرایەتیی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکی ئاداریی کرد، ئەوانیش، پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حیزبی شیوعیی عێراقی، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستانی، حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی، حیزبی سۆسیالیستی کوردی (پاسۆك)، حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و بزووتنەوەی دیموکراتیی ئاشووری. بڕوانە نووسینەکانی تۆما تۆماس (٣٨)، لە سەر :

2. بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر ناوەڕۆکی ئەو بڕیارە و ئامانجەکانی بڕوانە، د. عەبدولحوسێن شەعبان، سەروەری و بنەمای دەستوەردانی مرۆیی (هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٩)، ل ٢٦.

3. ئەوەیش کاتێك سەدان هەزار لە کوردان ناچار بوون، پاش ئەو ڕاپەڕینەی لە باکوورەوە تا باشووری عێراقی گرتەوە، شار و گوندەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و پەنا بۆ شاخەکانی سەر سنووری ئێران و تورکیا ببەن، بۆ ئەوەی خۆیان لە تۆڵەسەندنەوەی ڕژێمی عێراقی بە دوور بگرن. دواتر هێزە هاوپەیمانەکانی خۆرئاوا لە سەر داوای فەرەنسا هاتنە مەسەلەکەوە و چەند ناوچەیەکیان بۆ پاراستنی خەڵکی لە هێرشەکانی ڕژێمی عێراقی دروست کرد. بۆ زانیاری بڕوانە، غەسان عزی، سیاسەتی هێز- چارەنووسی سیستەمی نێودەوڵەتی و زلهێزەکان، (بەیروت، سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکان و توێژینەوە و بەدۆکیومێنتکردن، ٢٠٠٠)، ل ٦١.

دەستی دەسەڵاتی سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستاندا بوو، کە خۆی لە بەرەی کوردستانیدا دەبینییەوە لە باقی ناوچەکانی تری عێراق.

لە ١٩ی ئایاری هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانیی هەرێم بەڕێوەچوو، هەشت لیستی کوردی و چوار لیستی ئاشووری بەشدارییان تێدا کرد، چوار کەسیش خۆیان بۆ هەڵبژاردنی سەرکردەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان کاندید کرد. هەڵبژارنەکان لە دۆخێکی نەگونجاوی سیاسی و ئیدیۆلۆژیدا ئەنجام دران، هەر بۆیە کەموکورتی[1] و ساختەکارییەکی[2] زۆریان بەخۆوە بینی. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا بە یەکێك لە دیموکراسیترین هەڵبژاردنەکانی ئەو کاتەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە قەڵەم درا[3]، چونکە حیزب و هێزە کوردی و ئاشوورییەکان _بە هەموو ئاراستە جیاوازەکانیانەوە_ بە ئازادی ڕکابەرییان لە سەر دەنگی هاوڵاتییان دەکرد. هاوکات چاودێرانی بیانیی سەربەخۆ پێیان وا بوو، بەشداریکردنی چڕی هاوڵاتییان لەو هەڵبژاردنەدا "ئاماژەیە بە درککردنی قوڵی ئەوان بە بنەما دیموکراسییەکان و بەڵگەیە لە سەر ڕەتکردنەوەی ڕژێمی سەدام[4].

---

[1]. لەو کەموکوڕییانە: نەبوونی تۆمارێکی ڕێکوپێکی دەنگدەران، چونکە ئامارێکی دانیشتوان بوونی نەبوو، دابەشکردنی نادادپەروەرانەی ناوەندەکانی هەڵبژاردن بەسەر بازنەکانی هەڵبژاردندا، جگە لە خراپیی مەرەکەبی دەنگدانەکە. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، ناکۆکییەکانی پارتی و یەکێتی، ئامادەکردنی لوقمان عەباس، (هانکۆ، فنلەندا، بە بێ ناوی چاپخانە، ١٩٩٥) ل ١٧_٢٣. هەوەرها بڕوانە، ئاراس عەبدولڕەحمان مستەفا، ڕاپەڕینی ئاداری باشووری کوردستان، (سلێمانی، دەزگای حەمدی بۆ بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٩) ل ٤٥١. بۆ زانینی چۆنێتیی دابەشکردنی ناوەندەکانی دەنگدان بە سەر هەر سێ پارێزگاکەی هەرێمدا، بڕوانە: گراس ئار.ڤی ستانسفێڵد، کوردستانی عێراق گۆڕانکارییە سیاسییەکان و گەشەی دیموکراسی، وەرگێڕانی، د. یاسین سەردەشتی، (سلێمانی، چاپخانەی سیما، ٢٠١٠) ل ٢٩٩.

[2]. ساختەکاری گەیشتە ڕادەیەك، لە هەندێك ناوچەکەدا، بە تایبەتی لە پارێزگای دهۆك کە ژمارەی دەنگەکان لە ژمارەی دەنگدەران زیاتر بوو، ڕێژەی دەنگدان لەو پارێزگایەدا گەیشتە ١٢٤٪. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، ئەنجامی هەڵبژاردنە گشتییەکانی کوردستان، لەسەر:

[3]. ستانسفێڵد، ل ٢٩٨.

[4]. هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٩.

لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان و ڕێکەوتنی نێوان یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان (یەکێتی) و پارتی دیموکراتی کوردستان (پارتی)، کورسییەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی (جگە لە پێنج کورسیی براوەی ئاشوورییەکان) بە شێوەی پەنجا بە پەنجا لە نێوان ئەو دوو حیزبەدا دابەشکران و هەریەکەیان پەنجا کورسییان بەرکەوت. لە کاتێکدا هیچ کام لە پێنج حیزبە کوردییەی تر هیچ کورسییەکیان نەبردەوە، چونکە هیچ کامیان نەیتوانیبوو ڕێژەی پێویستی ٪ی دەنگەکان بە دەست بهێنێت[1].

دەکرێت ئەو قۆناغە لە ڕووی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی سیاسی لە هەرێمدا، بکەینە دوو بەشی سەرەکییەوە:

یەکەم: ئۆپۆزسیۆن لە دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتیمانی هەرێمەوە تا ٣١ی ئابی.

دووەم: ئۆپۆزسیۆن لە ١٩٩٦وە تا کانوونی دووەمی، واتە تا هەڵبژاردنی خولی دووەمی پەرلەمانی هەرێم. ئەوەیش لە دوو تەوەردا دەخەینە ڕوو.

---

[1]. مادەی، برگەی لە یاسای ئەنجومەنی نیشتیمانی ژمارە (١) دەڵێت، {هەر لیستێك ڕێژەی٪ یان زیاتری دەنگەکان بە دەست نەهێنێت، هیچ کورسییەکی ئەنجومەنی بۆ نابێت و دەنگەکانیشی بەسەر لیستە براوەکاندا، بە پێی ڕێژەی بردنەوەی ئەو لیستانە دابەش دەکرێت} . ئەو برگەیە بە پێی مادەی لە یاسای هەموارکردنەوەی سێیەمی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستانی عێراق ژمارە (٤٧)ی ساڵی هەموارکرایەوە و بەم شێوەیەی لێ هات، {ئەگەر هیچ کام لەو حیزبانەی ناو گروپێك، کە بە ناوی نەتەوەیەکەوە ڕکابەریی دەکەن (تورکمان و کلدان و ئاشووری و ئەرمەن و عەرەب) نەیتوانی تێکڕای هەڵبژاردن بە دەست بهێنێت، ئەو حیزبەی لە ناو ئەو گروپەدا زۆرترین دەنگی بە دەست هێناوە، کورسییەکی پێ دەدرێت} . بڕوانە، ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستانی عێراق، کۆمەڵەی یاسا و بڕیارەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانیی عێراق، بەرگی دووەم، چ١، ١٩٩٧.

**١-١: ئۆپۆزسیۆن لە دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتیمانیی هەرێمەوە تا ٣١ ی ئابی:**

ئەم قۆناغە بە پێکهێنانی یەکەمین کابینەی حکومەت بە سەرۆکایەتیی د.فوئاد مەعسوم، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی دەستی پێ کرد[1]. حکومەتەکەیش ئیئتیلافی بوو، هەریەکە لە پارتی و یەکێتی و نوێنەرانی حیزب و لایەنەکانی تریشی تێدا بوو. ڕاستییەکەی "پارتی و یەکێتی لە سەر دابەشکردنی پەنجا بە پەنجای وەزارەتەکان ڕێ کەوتن و هەندێك لە وەزارەتەکانیشیان دا بە حیزبەکانی تر تا بێدەنگیان بکەن "[2]. لەبەر ئەوەیشە لەو قۆناغەدا، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە ناو ئەنجومەنی نیشتیمانیدا دروست نەبوو. هەرچەندە چەند دەنگێك لە ناو سەرکردایەتیی یەکێتی هەبوو، داوایان دەکرد لە حکومەت بکشێنەوە و ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانی پێك بهێنن، بەڵام کەس گوێی لێیان نەگرتن، بەڵام لە دەرەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی، بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق[3] بەشداریکردنی لە حکومەتدا ڕەت کردەوە، هەرچەندە لیستەکەیان _کە ئیسلامییە سەربەخۆکان و بە تایبەتییش ڕەوتی ئیخوان موسلیمینی لە کوردستاندا لەخۆ دەگرت _ لە هەڵبژاردنەکەی ئایاری دا پلەی سێیەمی بە دەست هێنابوو. بەو شێوەیەیش بزووتنەوەی ئیسلامی، بوو بە

---

1. ئەو حکومەتە لە ١٩٩٢ دەستی لە کار کێشایەوە و حکومەتێکی تری هاوشێوەی ئەوەی پێشوو بە سەرۆکایەتیی کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی پێك هێنرا.

2. نەوشیروان مستەفا، حیزب و حوکم ئەزموونی هەرێمی کوردستان، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/ArticleParts.aspx?PartID=25&ArticleID=485&AuthorID=36

3. بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی جیهادییە، ساڵی لە ڕەوتی ئیخوان موسلمین لە کوردستان جیابووەوە و شان بە شانی هێزە کوردییەکانی تر دژی ڕژێمی پێشووی عێراق جەنگاوە. تا ئێستایش چەند گروپێکی لێ جیابووەتەوە، وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان و گروپی ئەنساری ئیسلام. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، جەزیرە، بزووتنەوەی ئیسلامیی هەرێمی کوردستانی عێراق، لە سەر سایتی:
http://www.aljazeera.net/NR/exeres/8D1C10BA-5216-40D4-BCD8-01B2E0BC7CA4.htm

ئۆپۆزسیۆنی دەرەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی. لەبەر ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە چەكدار بوو، مەیلێكی جەنگاوەرانەیشی هەبوو، دەبینین لە ساڵانی تا ١٩٩٩ چەند جارێك لەگەڵ دوو حیزبە سەرەكییەكەدا، بە تایبەتییش یەكێتی، پێكدادانی سەربازییان هەبووە.

هەندێك پێیان وایە ئۆپۆزسیۆنی بزووتنەوەی ئیسلامی، ئۆپۆزسیۆنێكی سیاسیی دژ بە سیستەمی حوكمڕانی نەبووە، هێندەی ئەوەی ئۆپۆزسیۆنێكی عەقیدەییانە بووە و دژی هەموو شێوازەكانی سیستەمی سیاسی لە دەرەوەی سیستەمی ئیسلامی بووە.

ئەو ڕاستییەیش نەوشیراون مستەفا تەئكیدی كردەوە، كاتێك وتی: "بزووتنەوەی ئیسلامی لەو سەردەمەدا بە ئۆپۆزسیۆن ناژمێردرێت، چونكە توندڕەو بوون لە حكومەتێكی نائیسلامیدا بەشدار نەدەبوون، بە سیستەمێكی سیاسیی عەلمانیش ڕازی نەدەبوون، خۆیشیان خاوەنی ئاراستەیەكی سیاسیی دیاریكراو نەبوون، بە پاڵپشتی ئێرانیش دەستیان دایە چەك و خەباتی چەكداری"[١].

وا بڕیار بوو _بە پێی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانی_ لە ساڵی دا هەڵبژاردنی ئەنجومەن بەڕێوە بچێت، چونكە بە پێی مادەی یاساكە: ماوەی مانەوەی ئەنجومەن سێ ساڵ دەبێت، بەڵام هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لە نێوان حیزبە كوردییەكاندا، بە تایبەتییش پارتی و یەكێتی، بووە هۆی ئەوەی ئەنجامدانی ئەو هەڵبژاردنە كاری نەكردە بێت، بۆیە ماوەی مانەوەكەی تا ساڵی درێژ كرایەوە[٢].

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، پەیمانەیەكی شەخسی، كتێبی.

[2]. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هەڵبژاردنەكانی كوردستان، لە سەر سایتی:

http://www.reform-kurd.com/politics1.asp?processId=2

پشتبەست بەوەی باسمان کرد، دەتوانین بڵێین ئەو قۆناغە هیچ ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی ئاشتییانەی بەخۆوە نەبینی، بەڵکو ئۆپۆزسیۆنێکی چەکدار هەبوو، کە خۆی لە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراقدا دەبینییەوە. ئەوەیش بە سروشتی حاڵ، ناچێتە خانەی تێگەیشتنی مۆدێرنانەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسییەوە، کە یەکێك لە مەرج و پایەکانی دوورکەوتنەوەیە لە چەك و چەکداری.

## ١-٢: لە ٣١ی ئابی بۆ کانوونی دووەمی:

لە ٣١ی ئابی هێزەکانی پارتی، بە یارمەتیی ڕژێمی پێشووی عێراق، هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانیان داگیر کرد[1]. یەکەم کارێکیش (پارتی) کردی، کاراکردنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی بوو، کە بەهۆی بەردەوامیی شەڕی ناوخۆوە ئیفلیج ببوو. هەروەك حکومەتێکیشی بە سەرۆکایەتیی د. ڕۆژ نووری شاوەیس و بەشداریی چەند حیزبێکی تر پێك هێنا، لەوانەیش: بزووتنەوەی ئیسلامیی هەرێمی کوردستان و یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان[2] و حیزبی شیوعی، بەڵام یەکێتی بەشداریی نەکرد.

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: لڤین، وردەکارییەکانی ڕووداوی ٣١ی ئاب، گۆڤاری لڤین، ژمارە ٧٤ (١ی ئەیلولی)، ل ٣١_٢٥. هەر بۆ زانینتان، پارتی داوای یارمەتیی لە ڕژێمی سەدام کرد، بە بیانووی ئەوەی یەکێتیی نیشتیمانی یارمەتیی لە ئێران وەرگرتووە و بەو هۆیەوە کۆنترۆڵی ناوچەگەلێکی زۆری کوردستانی کردوە. نەوشیروان مستەفایش دەڵێت: هەر دوو حیزب پەیوەندیی باشیان لەگەڵ ئێران هەبوو، هەندێك جار یەکێك لە حیزبەکان لێیان یاخی دەبێت و ئەوانیش هەوڵی دووبارە کۆنترۆڵکردنەوەی دەدەن، ئەوەیش سیفەتی سیاسییەتی ئێرانییە، کە ناهێڵێت هیچ کام لە لایەنەکان کۆنترۆڵی ئەوی تر بکات". نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی شەخسی.

[2]. یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لە ٦ی شوباتی ڕاگەیەنرا، بە حیزبێکی نزیك لە ئاراستە فیکرییەکانی کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین لە میسر دادەنرێت. لە سەرەتای شەڕەکانی ناوخۆی کوردستانەوە لە هەوڵی بەرقەرارکردنی ئاشتی لە نێوان لایەنەکاندا بەشداربووە و لە هیچ کام لەو شەڕانەدا بەشداریی نەکردوە. بۆ زانیاری لە سەر ئەو حیزبە و ئاراستە سیاسی و فیکرییەکانی بڕوانە: یەکگرتووو، ئێمە کێین؟ لە سەر سایتی فەرمی حیزبەکەیان:

http://www.kurdiu.org/ar/aboutus.php

ئەم هەنگاوەیش دوو ئەنجامی سەرەکیی لێ کەوتەوە:

هیچ حیزب یان هێزێکی سیاسیی کوردی لە دەرەوەی حکومەتدا نەمایەوە، بە تایبەتییش پاش ئەوەی یەکێتی لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی خۆیدا، حکومەتێکی بە سەرۆکایەتیی کۆسرەت ڕەسول عەلی بەشداریکردنی چەند حیزبێک، لەوانەیش حیزبی زەحمەتکێشان و حیزبی سۆسیالیست دیموکرات، پێک هێنا، بەوەیش هەموو حیزبە کوردییەکان بوون بە بەشێک لە دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە هەرێمدا نەبوو.

لەوێیشەوە هەرێمی کوردستان لە ڕووی ئیداری و سیاسییەوە دابەشبوو، لە کاتێکدا هەرێم بە هۆی شەڕی ناوخۆوە بووبوو بە چەند بەشێکەوە: بەشێک لە ژێر دەسەلاتی پارتی، بەشێکی تر لە ژێر دەسەلاتی یەکێتی و سێیەمیش لە ژێر دەسەلاتی بزووتنەوەی ئیسلامیدا بوو[1]. ئەو دابەشبوونە جوگرافی و سیاسی و ئیدارییە، دابەشبوونێکی یاساییشی لێ کەوتەوە، پاش ئەوەی لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی یەکێتی، جەلال تاڵەبانیی سکرتێری گشتیی ئەو حیزبە، کرا بە سەرۆکی هەرێم و لە ساڵی دادگای تێهەڵچوونەوە لە هەمان ناوچەدا دروست کرا[2].

وەک ئەنجامێکی ڕێکەوتننامەی ئاشتیی واشنتۆنی ساڵی نێوان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی، کە بە ئامادەبوونی مادلین ئۆلبرایت، وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئەمریکا مۆر کرابوو، لە کۆتاییی ساڵی وە پرۆسەی یەکخستنەوە و یەکگرتنەوەی هەرێمی کوردستان دەستی پێ کرد. یەکەم هەنگاویش بریتیبوو لە یەکخستنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستانی، کە لە ٤ی تشرینی یەکەمی دا

---

[1]. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، حیزب و حوکم.

[2]. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، لە نێوان من و مام جەلال ئاداری_شوباتی، (سلێمانی، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠٠٩) ل ٩٦. هاوکات لە سەر سایتی نزیک لە بزووتنەوەی گۆڕان:

http://sbeiy.com/ku/ArticleParts.aspx?PartID=39&ArticleID=2426&AuthorID=36

یەکـــەم کۆبوونـــەوەی یـــەکگرتووی خـــۆی گـــرێ دا[1] لەگـــەڵ ئەوەیـــشدا یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ٧ی ئایاری[2] دواکەوت، واتە بۆ زیاتر لە ساڵێك لە دوای هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان لـە ٣١ی ئایاری دا.

جێی ئاماژەیە ئەم قۆناغەیش ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی چەکداری بەخۆوە بینی، کە گروپی (ئەنسارولئیسلام) ڕێبەرێتییان دەکرد، کە لـە ٥ی کانوونی یەکـەمی و لـە لایـــەن (جوندولئیـــسلام) بـــە ڕێبەرایـــەتیی ئـــەبی عەبـــدوڵڵای شـــافیعی و ( بزووتنەوەی چاکسازی) بـە ڕێبەرایـەتیی نەجمـەدین فـەرەج ئەحمـەد، ناسـراو بـە "مەلا کرێکار" کە لە بزووتنەوەی ئیسلامی جیابووەوە، پێك هات. ئەو گروپـەیش، سەلەفیی جیهادی بوون و داوای جێبەجێکردن و چەسپاندنی شـەریعەتی ئیـسلامییان دەکـرد و بەرهەڵـستی هـەموو سیـستەمی سیاسـیی هـەرێمی کوردسـتانیان دەکـرد و دژی دەجەنگان و بەشداریکردنیان تیایدا ڕەت دەکردەوە.

ساڵی ئەو گروپە چەند شارۆچـکە و گونـدێکی سـەر سـنووری عێـراق_ئێرانیـان کۆنترۆڵ کرد و کردیان بە سەربازگە و شوێنی ڕاهێنـانی خۆیـان. لـە ٢٧ی نیـسانی، نـاوی گروپەکـە خرایـە لیـستی تـیرۆری وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکاوە و وەك پـشتیوانێکی ڕێکخـراوی تیرۆریـستیی قاعیـدە، بـە ڕێبەرایـەتیی ئوسـامە بـن لادن ناسێنرا. ئەمریکا لە زاری کۆڵن پاوڵ، وەزیـری دەرەوەی ئەوکاتـەی ئـەمریکاوە ڕای گەیانـد، گروپـی نـاوبراو سـەربازگەیەکی تایبـەتی بـە بەرهـەمهێنانی ژەهـر هەیـە و پەیوەندیی بە سەدام حسێن، سەرۆکی پێشووی عێراقەوە هەیە، گروپـی نـاوبراویش هـەموو ئـەو تۆمەتانـەی ڕەت کـردەوە. کاتێـك لـە شـەوی/٢٣ی ئـاداری ئـەمریکا

---

[1]. بڕوانە، مێژوی هەڵبژاردنەکانی خولی یەکەم ١٩٩٢، لە سەر سایتی پەرلەمانی کوردستان:
http://www.kurdistan-parliament.org/default.aspx?page=sitecontents&c=Parliament-History1992

[2]. بڕوانە، یاسین ساڵەح، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، (سلێمانی، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠٠٩) ل ٣٣٠.

جەنگی ڕزگارکردنی عێراقی دەست پێ کرد، هێزەکانی لە بنکەکانیانەوە لە سەر دەریای سپی ناوەڕاست و دەریای سوورەوە، بنکە و حەشارگەکانی گروپەکەیان بە نزیکەی حەفتا موشەکی دوورمەودا بۆردوومان کرد. دوای ئەوەیش هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا، بە هاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی، هێرشی زەمینییان کردە سەر ناوچەی دەسەڵاتی گروپەکە، بەوەیش چیتر حەشارگەیان نەما و سەرکردەکانیان بەرەو ئێران و ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق هەڵاتن، ئەو ناوچانەی کە تازە بە تازە گروپە تیرۆریستییەکان و بزووتنەوەی یاخیگەرییەکان دەستیان بە چالاکی کردبوو[1].

لەوەی ڕابورد دەردەکەوێت، لەو قۆناغەدا، بە هەر دوو بەشەکەیەوە، ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی چالاك و کاریگەر لە هەرێمدا دروست نەوبو، ئەوەیش چەند هۆکارێکی هەبوو، لەوانە:

1. حیزبە کوردییەکان، بە تایبەتییش پارتی و یەکێتی نزیکەی سی ساڵ ئۆپۆزسیۆنی ڕژێمی پێشووی عێراق بوون، کە ئەوانیش دەیانویست بگەنە دەسەڵات و تیایدا بەشداربن، بۆیە هیچ لایەکیان بە ئاسانی قبوڵی نەدەکرد ببێتە ئۆپۆزسیۆن.

2. ئەم حیزبانەیش ئەزموونێکی حوکمڕانیی دیموکراسییان نەبوو. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو خەڵکی کوردستان هیچ ئەزموونێکی حوکمڕانییان نەبوو، جگە لە حکومەتەکەی شێخ مەحمودی حەفید لە ساڵی، کە نزیکەی تەنیا ساڵێك

1. باوەڕ وایە کە گروپەکە لە چەندین کردەوەی باکووری عێراق بەرپرس بێت، لەوانەیش هەوڵی تیرۆرکردنی بەرهەم ساڵح، سەرۆکی حکومەتی هەرێم/ ئیدارەی ئەو کاتەی سلێمانی لە ٢ی نیسانی، لەگەڵ ئەو کردەوەیەی لە ٢٦ی شوباتی لە یەکێك لە زاڵگەکانی هێزی پێشمەرگە ڕووی دا و ئەو کردەوەیەیشی کە لە ٩ی ئەیلولی بارەگای هێزەکانی ئەمریکای لە هەولێر کردە ئامانج و ئەو هێرشەی لە ١ی نیسانی کرایە سەر بارەگاکانی پارتی و یەکێتی لە هەولێر و ١٠٩ کەسی تێدا کوژرا و ٢٠٠ی تریش بریندار بوون. بڕوانە، یوسف گۆران، دەرکەوتنی ڕێکخراوی قاعیدە لە کوردستانی عێراق، (سلێمانی، مەکتەبی بیر و هۆشیاریی یەکێتیی نیشتیمانی، ٢٠٠٩) ل ٤٢_٤٧.

تەمەنی کرد، چونکە داگیرکەری بەریتانی شکستی پێ هێنا. لەگەڵ حکومەتەکەی کۆماری مەهاباد، کە قازی محەمەد لە ساڵی پێکی هێنا و تەمەنی نەگەیشتە ساڵێك، چونکە سوپای ئێرانی شکستی پێ هێنا و قازی و هاوەڵانیشی لە سێدارە دا[1]. ئەم ئەزموونییەیش بە سەر کەلتووری ئۆپۆزسیۆنی سیاسی و چۆنێتیی بەڕێوەبردنی قەیرانە سیاسییەکان و چەسپاندنی بنەما و پایە دیموکراسییەکانیشدا پیادە دەبێت، بە تایبەتییش پرسی دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات لە نێوان هێزە سیاسییەکاندا.

٣. حیزبە کوردییەکان ئەزموونێکی تاڵی ململانێ و شەڕی ناوخۆییان هەیە، تەنانەت کاتێکیش لە شاخ بوون و دژی ڕژێمی سەدام جەنگاون. ئەو جۆرە ململانێ و شەڕانەیش بێ متمانەییی لە نێوان هێزەکاندا، بە تایبەتی دوو حیزبە سەرەکییەکە دروست کردووە. بە هۆی ئەو حاڵەتەیشەوە ساختەکارییەکی زۆر لە هەڵبژاردنەکەی ساڵی دا کرا، وەك چۆن هۆکارێکیش بوو بۆ خۆشکردنی ئاگری شەڕی ناوخۆ لە ساڵی وە تا ١٩٩٩. بەو هۆیەیشەوە هیچ کام لە حیزبە سەرەکییەکان ڕازی نەبوون لە حکومەت بکشێنەوە و بە ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانی هەستن، چونکە دەترسان لەوەی لایەنەکەی تر دەسەڵات بۆ خۆی قۆرخ بکات. هەروەها ئەزموونی حوکمڕانی لە عێراقدا هۆکارێکی تری ئەو بێ متمانەییەی حیزبە کوردییەکان بوو بەرامبەر بە یەکتری، چونکە هەمیشە کەمینەیەکی کەم دەسەڵاتی قۆرخ دەکرد و ئەوانەی تری دووردەخستەوە، بەوانەیشەوە کە لە کاتی گرتنە دەستی دەسەڵاتدا هاوپەیمانێتی لەگەڵ کردوون.

٤. ئەو قۆناغە، قۆناغی بنیاتنان و دامەزراندن بوو، بۆیە ئاساییە هەمووان لە بنیاتنانی ئەزموونێکی نوێی دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەشدارین، بەڵام

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، حیزب و حوکم، سەرچاوەی پێشوو.

شەڕی‌ناوخۆ بوو بە هۆی‌ئەوەی‌ئەو ئەزموونە لە ڕێڕەوی‌خۆی‌لا بدات. نەوشیروان مستەفا لە شیکردنەوەی‌ئەو حاڵەتەدا دەڵێت: "ئێمە لەو کاتەدا بیرمان لە بزووتنەوەیەکی‌ئۆپۆزسیۆن نەکردەوە، چونکە ئەوە قۆناغی‌بنیاتنان بوو، ئەولەویەتمان دامەزراندن و چەسپاندنی‌دامودەزگا کوردییەکان بوو لە هەرێمدا، چاومان لە زۆر شت پۆشی، یەکێك لەوانە پێکهێنانی‌بزووتنەوەیەکی‌ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسی‌بوو"[1].

## ٢: نیشانەکانی‌سەرهەڵدانی‌ئۆپۆزسیۆن_ خولی‌دووەمی‌ئەنجومەنی‌نیشتیمانیی کوردستان (٢٠٠٥ بۆ ٢٠٠٩):

ساڵی‌ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی‌عێراقیان داگیرکرد و ڕژێمی‌پێشووی‌سەدام حسێنیان ڕووخاند، دواتر دەست کرا بە سەر لە نوێ بنیاتنانەوەی‌عێراق و دامەزراندنی‌پێڕەوێکی‌سیاسیی‌دیموکراسی‌تیایدا. ئەوەیش خۆی‌لە دامەزراندنی‌ئەنجومەنی‌حوکم لە تەمووزی‌و ئامادەکردنی‌یاسای‌بەڕێوەبردنی‌دەوڵەت لە قۆناغی‌گواستنەوە و پێکهێنانی‌حکومەتی‌کاتی‌بە سەرۆکایەتیی‌ئەیاد عەلاوی‌و دواتریش حکومەتی‌کاتی‌بە سەرۆکایەتیی‌ئیبراهیم جەعفەری‌و نووسینەوەی‌دەستووری‌هەمیشەیی‌عێراق و ڕاپرسی‌لەسەرکردنی‌و هەڵبژاردنی‌ئەنجومەنی‌نوێنەران لە ٢٠٠٥دا دەبینێتەوە. حیزبە کوردییە سەرەکییەکان، بە تایبەتییش پارتی‌و یەکێتی‌و یەکگرتوو لە هەموو ئەو گۆڕانکارییانەدا بەشدار بوون[2].

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی‌شەخسی.

[2]. بۆ زانیاری‌لە سەر بەشداریکردنی‌حیزبە کوردییەکان لە بونیاتنانەوەی‌دەوڵەتی‌عێراقدا، بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، یاداشتەکانم لە ئەنجومەنی‌حوکم، (سلێمانی، سەنتەری‌جەمال باپیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە) بەبێ ساڵی‌چاپ.

لەسەر ئاستی هەرێمیش، لە ٣٠ی کانوونی دووەمی هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان بەڕێوەچوو. لە ترسی ئەوەی بەهۆی هەڵبژاردنەکان و ئەنجامەکانیەوە جارێکی تر ململانێ و ناکۆکی سەر هەڵبدەنەوە، پارتی و یەکێتی لەگەڵ حیزبە کوردییەکاندا، جگە لە حیزبی زەحمەتکێشان و کۆمەڵی ئیسلامی[1] و پارتی چارەسەر، بە یەك لیست بەشدارییان لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانیدا کرد[2].

لە ٧ی کانوونی دووەمی پارتی و یەکێتی لە سەر دابەشکردنی پۆستە سەرەکییەکان لە هەرێم و حکومەتی فیدراڵیشدا، ڕێ کەوتن[3]. لە ٧ی ئایاری هەمان ساڵیشدا حکومەتی هەرێم بە سەرۆکایەتیی نێچیرڤان بارزانی، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان و وەك یەکەم حکومەتی یەکگرتوو دوای ڕووداوەکانی ئابی‌وە، پێك هات. هەموو حیزبەکانی ناو ئەنجومەنی نیشتیمانییش لەو حکومەتەدا بەشدار بوون، چەند حیزبێکی تر هەبوون لە دەرەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی‌مانەوە و بەشدارییان لە حکومەتیشدا نەکرد. لەوانەیش بزووتنەوەی ئیسلامی، کە لەو کاتەدا کێشەی ناوخۆیی هەبوو و

---

1. کۆمەڵی ئیسلامی بە ڕێبەرایەتیی عەلی باپیر لە هەناوی بزووتنەوەی ئیسلامی یان بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامییەوە هاتەدەر، کە بریتی بوو لە تێکەڵبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی نەهزەی ئیسلامی. ناتوانین بڵێین کۆمەڵ و بزووتنەوە جیاوازییەکی فیکرییان هەبووە، بەڵکو ناکۆکی لە سەر سەرکردایەتیی بزووتنەوەی یەکبوون بووە هۆی جیابوونەوەکەی نێوانیان لە ٢٠٠١دا. بڕوانە، جەزیرە، کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستانی عێراق، لە سەر سایتی:
http://www.aljazeera.net/NR/exeres/065300DE-1908-49B8-9C15-BFD6676858FC.htm

2. بۆ زانیاری لە سەر ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە، بڕوانە، ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی، لە سەر سایتی پەرلەمانی کوردستان:
http://perleman.org/default.aspx?page=sitecontents&c=Parliament-History

3. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، یاسین ساڵح، ل ٣٣٠.

ئـەوەیش لاوازیکردبـوو، لـە هەڵبژاردنـەکانی کـانوونی دووەمـی بەشـدار نـەبوو، پـارتی چارەسـەریش بـە هـۆی کـەمیی دەنگەکانییـەوە نـەیتوانی بگاتـە ئەنجومەنی نیشتیمانی.

لەوەی بـاس کـرا دەگەینـە ئـەوەی، بەشـداربوونی کوتلـە پەرلەمانییـەکان لـە حکومەتـدا و نـەبوونی هێزێکـی کـارا و کاریگـەر لـە دەرەوەی حکومەتـدا وای کـرد، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا دروست نەبێت.

لەو چوارچێوەیەیشدا دەتوانین ئاماژە بە چەند فاکتەرێك بـدەین، کـە بوونـە هۆی دروست نەبوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لەم قۆناغەی هەرێمدا:

١. مۆتەکەی دووبارەبوونەوەی شەڕی ناوخۆ لـە زەیـنی لایەنەکانـدا مـابوو، بـە تایبەتی کە هێشتا چەك لای کادرە حیزبییەکان بوو. لەدەستدانی متمانـە لـە نێـوان حیزبـە سیاسییەکانیـشدا، بـە تایبـەتی پـارتی و یـەکێتی هۆکـارێکی تـری نیگـەرانی و دوودڵیی ئەو دوو حیزبە بوو، کە وای کـرد خۆیـان لـە ململانـێ بـەدوور بگـرن و بـە کـارێکی وەهـا هەڵنەسـن کـە سـیناریۆی شـەڕ و پێکـدادان زینـدوو بکاتـەوە، وەك بەشـداریکردن بـە لیـستی جیـاواز و مانـەوەی یـەکێکیان وەك ئۆپۆزسـیۆن و پێکهێنانی حکومەت لە لایەن ئەوی تریانەوە.

٢. جێگیرنـــەکردنی بودجـــەی حیزبـــەکان لـــە یاســـایەکدا (سەرەڕای بوونی یاسای حیزبـە سیاسـییەکان ژمـارە ١٧ی سـاڵی)[1] هۆکـار بـوو بـۆ سـنووردارکردنی جوڵـە و کـارایی و ئـازادیی حیزبـەکانی تـر، بـەڵام بـۆ دوو حیزبـە

[1]. مادە ١٤ برگەی یەکەمی ئەو یاسایە دەڵێت، ئەو مینحەیەی لە بودجەی هەرێمی کوردستان بۆ حیزبـەکان تەرخان دەکرێت، بە پێی کۆمەڵێك پێوەر و ڕێوشوێن کە ئەنجومـەنی نیشتیمانیی کوردستان بڕیاریان لێ دەدات بە سەریاندا دابەش دەکرێت، بەڵام هەر دوو حیزب تا ئێستا ڕێگەیان نـەداوە ئـەو یاسایە پەسـەند بکرێت. بـۆ بینینی دەقی یاسای حیزبـەکانی هـەرێمی کوردستان ژمـارە ١٧ی ساڵی، بڕوانـە سایتی بنکـەی یاسا عێراقییەکان:

http://www.iraq-ild.org/LoadLawBook.aspx?SP=ALL&SC=171020077683857

سەرەکییەکە وا نەبوو، چونکە ئەو دوو حیزبە ئەوسا و ئێستایش، دەتوانن مینحەی‌دارایی‌حیزبەکان وەك کارتی‌فشار لە دژیان بەکار بهێنن.

٣. لەو قۆناغەدا ئازادییە سیاسییەکان و ئازادیی‌کارکردنی‌حیزب و هێزە سیاسییەکانی‌تر، بەدوور لە ویست و ئارەزووی‌دوو حیزبە سەرەکییەکە نەچەسپیبوو. بۆ نموونە، کاتێك یەکگرتووی‌ئیسلامی‌بڕیاری دا بە لیستێکی‌سەربەخۆ بەشداری‌لە هەڵبژاردنەکانی‌ئەنجومەنی‌نوێنەرانی‌عێراق لە ١٥ی‌کانوونی‌یەکەمی‌دا بکات، لە ٦ی‌کانوونی‌یەکەمی‌گروپێك لە چەماوەرانی‌پارتی‌سێ کارمەندی‌ئەو حیزبەیان کوشت و بارەگاکانیان لە چەند ناوچەیەکی‌پارێزگای‌دهۆك تێك دا و سووتاند[1]. واتە حیزبەکانی‌تر بواریکی‌فراوانی‌جوڵەی‌ئازادانەیان نەبوو، بە جۆرێك کە بتوانن ئۆپۆزسیۆنێکی‌سیاسیی‌کارا لە هەرێمدا پێك بهێنن.

٤. هەردوو حیزبی فەرمانڕەوا بیانووی‌چاکسازی‌نەکردنیان لە ڕێڕەوی‌پرۆسەی‌دیموکراسی‌لە هەرێمدا بەوە دەهێنایەوە، گوایە سەرقاڵی‌چەسپاندنی‌مافە سیاسییە نەتەوەییەکان و بنیاتنانەوەی‌دەوڵەتی‌عێراقن، بەڵام ڕاستییەکەی‌ئەوانە ڕێگر نەبوون لەوەی‌شان بە شانی‌گرینگیدان بە مافە نەتەوەییەکان، چاکسازی‌و بنیاتنانی‌دامەزراوەگەلی‌بەهێز بۆ پتەوکردنی‌دۆخی‌سیاسیی‌ناوخۆیی‌لە هەرێم ئەنجام بدرێت.

هەرچەندە ناتوانین لەم قۆناغەدا باس لە ئۆپۆزسیۆنێکی‌حیزبی‌بکەین، بەڵام ئەم قۆناغە سەرەتا و ڕێگەخۆشکردنێك بوو بۆ سەرهەڵدانی‌ئۆپۆزسیۆنێکی‌سیاسیی‌کوردی‌لە هەرێمی‌کوردستانی‌عێراقدا.

---

[1]. بۆ زانیاریی‌زیاتر بڕوانە، دوو بەیاننامەی‌یەکگرتووی‌ئیسلامی‌لە بارەی ئەو ڕووداوانەوە، لە ئەرشیفی‌سایتی kurdistannet.org لە ڕۆژانی‌و ٨ی‌کانوونی‌یەکەمی.

نەبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی کارا لەو قۆناغەدا ڕێگر نەبوو لە سەرهەڵدانی چەند جۆرێکی تری ئۆپۆزسیۆن، وەك: ناڕەزایەتییە جەماوەرییەکان، ئۆپۆزسیۆنی مەدەنی، ئۆپۆزسیۆنی ناو حکومەت، ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆی حیزبەکان و میدیای ئازاد. هەندێك لەو جموجوڵانە، لە قۆناغێکی دواتردا، بوونە هۆی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا. ئەم ئۆپۆزسیۆنەیش چەند شێوەیەکی هەبوو، دەکرێت گرینگترینیان بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

### ٢-١: ئۆپۆزسیۆنی جەماوەری و مەدەنی:

لەم قۆناغەدا بزووتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی دەستی پێ کرد، کە خۆی لە نووسینی ڕەخنەیی و دامەزراندنی میدیای ئازاد و پێکهێنانی بزووتنەوە مەدەنییەکان و سەرهەڵدانی ناڕەزایەتییە جەماوەرییەکاندا دەبینییەوە. لەم ڕووەوە دەکرێت ئاماژە بە نووسینی گوتاری چەند گروپێکی ڕۆشنبیر و ئەکادیمیانی کورد لە نموونەی (گروپی ڕەهەند)[1] چەندینی تریش بدەین، کە بنیاتی گوتارێکی ڕەخنەیی و ئۆپۆزسیۆنییان دانا. ئەو گوتارەیش زۆر کاری لە خوێنەرانی، بە تایبەتییش گەنجان کرد، بە جۆرێك ڕەخنەلێگرتنی حکومەت و دەسەڵات بوو بە شێوازێکی سیاسی و ڕۆشنبیریی لە هەرێمدا[2]. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو هەندێك لەو ڕۆشنبیر و نووسەرانە گۆڕانکارییان تیۆریزە دەکرد و هەلیان بۆ دەرکەوتنی بزووتنەوەی گۆڕان لە قۆناغێکی دواتردا خۆش کرد[3].

---

[1]. ئەوانە کۆمەڵێك نووسەر و ڕۆشنبیرن، وەکو بەختیار عەلی و مەریوان وریا قانع و ئاراس فەتاح و ڕێبین هەردی، کە لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووەوە هەوڵیاندا فیکرێکی ڕەخنەیی عەلمانی تیۆریزە بکەن. بڕوانە سایتەکەیان:

http://www.rahand.com/

[2]. زوبێر ڕەسوڵ، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمی کوردستان، گۆڤاری ڕۆشنگەری، ژمارە ٢٧، زستانی، ل ٧٦.

[3]. بۆ نموونە بڕوانە ئەم توێژینەوانە:

بەختیار عەلی، هەڵهاتن لە بۆشایی، لە سەر سایتی:

لە لایەکی ترەوە میدیای ئازاد و ئەهلی، ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە خستنە ڕووی ڕای گشتیی بەرهەڵستکاریی هەرێم لەو دۆخە باوە، هەموو لایەنەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاریشی دەگرتەوە. پێشتر هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە سەر حیزبە سیاسییەکان قۆرخ کرابوون، بەڵام لەوە بەدوا چەند کەناڵێکی ئازاد دروستبوون، کە بە لەدایکبوونی یەکەم ڕۆژنامەی ئازاد لە ساڵی و بە ناوی(هاوڵاتی)یەوە دەستی پێ کرد[1]. دواتریش کەناڵە میدیاییە ئازادەکان، چ وەك چەندێتی و چ وەك چۆنێتیش، زیادیان کرد و ژمارەیان گەیشتە دەیان گۆڤاری ئازاد، وەك (لڤین[2] و ڕێگا و جیهان و... هتد) و چەند کەناڵێکی ڕادیۆیی، وەك ڕادیۆی(نەوا) [3] و سەرەڕای بوونی چەندین سایتی ئەلیکترۆنی، وەك (ستاندارد[4] و کوردستان پۆست[5] و کوردستان نێت[6] و... هتد).

---

http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=1664&AuthorID=201

هەروەها بڕوانە:

مەریوان وریا قانیع، دەرچوون لە میتافیزیکا، چۆن گۆڕان تیوریزە بکەین؟ لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=1853&AuthorID=482

1. هاوڵاتی، ڕۆژنامەیەکی سیاسیی سەربەخۆی ئازادی ئەهلییە، ژمارە سفری لە ٥ی تشرینی دووەمی لە شاری سلێمانی دەرچوو. هاوڵاتی بە مەبەستی بە دەست هێنانی مافی هاوڵاتیبوون بۆ هەموان و دابینکردنی ئازادیی ڕادەربڕین و بە دەست هێنانی مافەکانی مرۆڤ و گەشەپێدانی ڕۆحی دیموکراسی و گفتوگۆ دامەزرا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

http://hawlati.info/Ar/AboutUs.aspx

2. بڕوانە:

http://lvinpress.com/Arabic.aspx

3. بڕوانە سایتی ڕادیۆکە لە سەر ئینتەرنێت:

http://radionawa.com/ar/arabic.aspx

4. بڕوانە:

http://standardkurd.org/English.aspx

5. بڕوانە:

http://www.kurdistanpost.com/about.asp

6. بڕوانە:

ئەم کەناڵانە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە تیشکخستنە سەر کێشە و قەیرانە ناوخۆییو دەرەکییەکانی هەرێم، هاوکات مینبەرێکی ئازادیان بۆ ئەو ڕۆشنبیر و نووسەرانەیش کردەوە، کە مەیلێکی ئۆپۆزسیۆنانەیان هەبوو، تەنانەت پێش سەرهەڵدانی بزووتنەوەی گۆڕانیش لە هەرێم، ئەوەیش لە خولقاندنی ڕایەکی گشتیی ئۆپۆزسیۆنانەدا، بەشدارییەکی باشی هەبوو. ئەو کەناڵە میدیاییە ئەهلییانە (چ بیستراو و چ خوێنراو) ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە ئاشکراکردنی زانیارییە شاردراوەکان و ئاگادارکردنەوەی هاوڵاتییان لەوەی لە پشت پەردەوە دەگوزەرا و زەقکردنەوەی کێشەی کەمیی خزمەتگوزارییەکان و شێوازە جیاوازەکانی گەندەڵیدا. ئەوەیش لە باریدا بوو ڕایەکی گشتیی ئامادە بۆ گۆڕانکاری بسازێنێت، کە ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە قۆناغی دواتردا توانی سەرکردایەتی بکات و لە هەڵبژاردنەکاندا ئاڕاستەی بکات، لەو ڕێگەیەیشەوە هەوڵی گۆڕینی هاوکێشەی سیاسی لە هەرێمدا بدات.

نابێت هەموو ئەوانە وامان لێ بکەن، ڕۆڵی گەورەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو بزووتنەوە مەدەنییەکان لە هۆشیارکردنەوەی هاوڵاتییان و ڕەخساندنی زەمینەیەکی گونجاو بۆ سەرهەڵدانی ڕەوتێکی ئۆپۆزسیۆن لە ناوخۆی هەرێمدا، لە بیر بکەین.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەین ناڕەزایەتییە جەماوەرییەکان، لە ئەنجامی خراپیی باری ئابووریو کۆمەڵایەتیی هەرێم کەوتنەوە و داوای جێگیرکردنی دامەزراوەو دۆخی سیاسیی هەرێمیان دەکرد. دۆخەکە لە بواری خزمەتگوزاریی ئاو و کارەبا و سووتەمەنیدا هەر بە خراپی مایەوە، ئەوەیش لە کۆتاییی ساڵیو سەرەتای دا زنجیرەیەك ناڕەزاییی جەماوەریی لە کەلار و ڕانیە و سلێمانیو ئاکرێ و هەڵەبجەی شەهید لێ کەوتەوە، بە هۆی جێبەجێنەکردنی ئەو

http://www.kurdistannet.info/net/index.php

بەڵێنانەی دەسەڵات لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی دا بە جەماوەری دابوون. هەرچەندە ئەم خۆپیشاندان و ناڕەزایەتییانە هیچ ئامانجێکی سیاسییان لەپشتەوە نەبوو، ئامانجی سەرەکییان دابینکردنی پێویستی و خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتییان بوو، کەچی دەسەڵات بە ڕەقی و بە توندوتیژی وەڵامی دانەوە و سەرکوتی کردن، ڕەدووی ڕێکخەرانی خۆپیشاندانەکان کەوت و تەنانەت لە هەندێك ناوچەدا کار گەیشتە ئەوەی تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد[1].

لە ٥ی ئایاری بزووتنەوەی (هەتا کەی) ڕاگەیەنرا، کە لە یەککگرتنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ژمارەیەك کەسایەتیی یاسایی و ئەکادیمی و سیاسی و ڕۆشنبیری و میدیایی پێکهاتبوو، مەبەستی بوو لە ڕێگەی فشاری ئاشتییانەوە بۆ سەر دەسەڵاتی سیاسی، پایە ڕاستەقینەکانی دیموکراسی بچەسپێنێت و ماف و ڕێزی هاوڵاتییان بپارێزێت، خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانیان بۆ دابین بکرێت و دژی گەندەڵیی بوەستێتەوە[2].

ئەو بزووتنەوەیە دوو پرۆژەی بۆ کاراکردنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پێشوەخت لە هەرێمدا خستەڕوو. هەموو گروپە ئۆپۆزسیۆنەکانی پارێزگای سلێمانیی لە سایەی خۆیدا کۆکردەوە و هاوڵاتییانی لە

---

1. بڕوانە، یاسین ساڵح، ل ٣٣٤_٣٦.

2. بڕوانە، ڕەحمان غەریب، ڕاگەیاندنی بزووتنەوەیەکی مەدەنیی نوێ لە سلێمانی، لە سەر سایتی حیزبی شیوعی:

http://tareekalshaab.blogspot.com/2007_05_06_archive.html

هەروەها بڕوانە، ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی (هەتا کەی) لە کوردستان، لە سەر سایتی:

http://www.wna-news.com/inanews/news.php?item.2053.10

لە دیارترین دامەزرێنەرانی بزووتنەوەکە بریتی بوون لە (د. لەتیف مستەفا، یوسف محەمەد سادق، سەروەر عەلی جەعفەر، شۆڕش ئەمین، ئارام جەمال، ئاڵا کەمال و چەندانی تریش)، وەرگیراوە لە : د. لەتیف مستەفا، دیمانەیەکی تایبەتی، سلێمانی، ٥ی ئایی.

مافەکانیان و چۆنێتیی بەرگریلێکردنیان بە شێوەیئاشتییانە، هۆشیار کردەوە. هەرچەندە تەمەنیبزووتنەوەکە کورت بوو، بەڵام توانیفشار بخاتە سەر حکومەت و ناچاریبکات چەند چاکسازییەك لە بوارەکانیخزمەتگوزاریو دژایەتیکردنیگەندەڵیدا بکات. هەروەها حیزبە سیاسییەکانیناچار کرد بە ڕۆڵیخۆیان هەستن و ئۆپۆزسیۆنێکیسیاسیجیدیو بەهێز پێك بهێنن. دەتوانین بڵێین دروستبوونیئەو بزووتنەوەیە سەرەتایەکیگرینگ بوو لە هاندان و بزواندنیچوار حیزبەکە (کە دواتر باسیان دەکەین) و هەندێك لە کادرانیبزووتنەوەکە، لە داهاتوودا بوون بە ئەندامیکارا و چالاکیئۆپۆزسیۆنیسیاسیی( بزووتنەوەیگۆڕان)دا[1]. واتە دەتوانین بزووتنەوەی(هەتا کەی) بە بەردێکیبنەڕەتییئەو ئۆپۆزسیۆنە سیاسییە لە قەڵەم بدەین، کە دواتر لە هەرێمدا دروستبوو.

بەڵام چەند شتێك بوونە هۆیهەڵوەشاندنەوەیبزووتنەوەکە، کە د. لەتیف مستەفا هەندێکیانیباس کردووە، لەوانەیش: "گرتنە ئەستۆیئەرکێکیقورس و گران لە لایەن دامەزرێنەرانیبزووتنەوەکەوە، بە تایبەتییش یوسف محەمەد سادق، کە ڕێکخەریبزووتنەوەکە بوو، هەروەها سەرقاڵبوونیبزووتنەوەکە بە کاریلاوەکییەوە لە سەر حسابیکاریئۆپۆزسیۆنیو دژایەتیکردنیان لە لایەن هەر دوو حیزبە سەرەکییەکەیهەرێمیکوردستانەوە، ئەوەیش سەرەڕایلاوازییدارایییبزووتنەوەکە"[2].

---

[1]. بۆ نموونە، دوو کەس لە ئەندامانیدەستەیڕابەرایەتییبزووتنەوەکەی(هەتا کەی)، کە ئەوانیش د. لەتیف مستەفا و یوسف محەمەد سادقن، لە لیستیگۆڕاندا بوون بۆ هەڵبژاردنیئەنجومەنینوێنەرانیعێراق لە ٢٠١٠دا. هاوکات د. لەتیف مستەفا سەرۆکیلیستیگۆڕان بوو لە پارێزگایسلێمانیو زۆرترین دەنگیلە سەر ئاستیهەرێم و شەشەمینیلە سەر ئاستیعێراق بە دەست هێنا بە کۆکردنەوەیهەزار و ١٦٩ دەنگ. بڕوانە؛ دەرباز محەمەد، شیکاریئەنجامەکانیهەڵبژاردنیئەنجومەنینوێنەرانیعێراق لە ٧یئاداری، (سلێمانی، ژووریلێکۆڵینەوەیسیاسییبزووتنەوەیگۆڕان، ٢٠١٠) ل ٤٠.

[2]. د. لەتیف مستەفا، دیمانەیەکیشەخسی.

## ٢-٢: ئۆپۆزسیۆنیسیاسی لە ناوخۆیحکومەتدا:

هـەنگاویدووەمـیپێکهێنـانیئۆپۆزسـیۆنێکیسیاسـیڕاسـتەقینە لـەم قۆناغەیمێژوویهەرێمدا، خۆیلە ئۆپۆزسیۆنیناوخۆییان ڕەخنەلەخۆگرتن لە نـاوخۆییـەکێتییـنیـشتیمانییکوردسـتاندا دەبینێتـەوە. سـەرەتاکانیئـەم پرۆسـەیەیش دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی یەکـەمیڕاپەڕینـە جەماوەرییەکـەیهـەرێمیکوردسـتان تـا پـێش دروسـتبوونیدامودەزگـا سیاسـییەکانیهـەرێمیکوردسـتان[1]. نەوشـیروان مـستەفا باسـیلـەوە کـردووە، دەڵێت: "لە سەرەتایپێکهێنـانییەکـەم حکومـەتیکوردیـدا، پێشنیازێکم خـستە بەردەست مەکتەبیسیاسییەکێتیینیشتیمانی، کە لەگەڵ پـارتی ڕێـك بکـەوین و یەکێکمان ببێتە دەسەلاَت و ئـەویتریـشمان وەك ئۆپۆزسـیۆن بمێنێتـەوە، بـەڵام هەڤاڵان لەبەر دوو هۆکاریسەرەکیڕازینەبوون، ئەوانیش کۆمەڵگـەیکـوردی، بـە حیزبەکانیـشەوە چـەکدار بـوون و لـە دووبارەبوونـەوەیشـەڕ دەترسـان. هۆکـارێکیتـریش ئـابووریبـوو، ئـەو حیزبـەیدەبـووە ئۆپۆزسـیۆن، تـەواو لاواز دەبوو[2].

لـە لایـەکیتـرەوە، نەوشـیروان مـستەفا پێـشنیازێکیتـریخـستە بەردەستیحیـزب، بـەوەیکەسـانێکیتـەکنۆکرات حکومـەت بگرنـە دەسـت، نـەك سەرکردەکانیمەکتەبیسیاسی، چونکە باوەڕیوابوو ئـەو سـەرکردانە پیـاویشـەڕ بـوون، نـەك پیـاویدەوڵـەت. هـەروەك پێـشنیازیئەوەیـشیکـرد ئەنجومەنینیشتیمانیچاودێریحکومەت بکات، بەڵام ئەم بیرۆکەیەیشیلە لایـەن حیزبەوە پەسەند نەکرا[3].

---

1. بڕوانە، نەوشیروان مستەفا، لە نێوان من و مام جەلال، ل ٤_٦.
2. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکیشەخسی.
3. هەمان سەرچاوە.

هەر بەوەندەیش تەواو نەبو، بەڵکو لە کۆتاییی ساڵی ژمارەیەك ئەندامی مەکتەبی سیاسییەکیتی نامەیەکیان ئاراستەی جەلال تاڵەبانی، سکرتێری گشتیی یەکێتی کرد و تیایدا داواکار بوون گۆڕانکاریی ریشەیی لە ناو حیزبدا ئەنجام بدرێت و دەسەڵاتەکانی سکرتێری گشتی کەم بکرێنەوە، مەکتەبی سیاسی کارا بکرێت و هەڵبژاردنی ڕەسمی لەناوخۆی حیزبدا ئەنجام بدرێت و چاکسازیی گشتی بکرێت، لەگەڵ کاراکردنی حکومەت و دابینکردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکان بۆ هاوڵاتییان.

لەو بارەیەوە نەوشیروان مستەفا وتی: "سکرتێری حیزب هەموو دەسەڵاتێکی هەبوو، هەر خۆیشی فەرماندەی گشتیی هێزەکانی پێشمەرگە و بەرپرسی دەزگای ڕاگەیاندن و هەواڵگرییش بوو. هیچ کەسێکیش، تەنانەت ئەندامانی مەکتەبی سیاسییش هیچیان لە بارەی داراییو قەبارەی سەرمایەی حیزب و چۆنێتیی بەڕێوەبردنی ئەو داراییە نەدەزانی، ئەوە بۆ دەزگای ئاساییشیش هەر ڕاست بوو، هاوکات هەر ئەویش سەرۆك کۆماری عێراقە، ئیتر چۆن دەتوانێت بەو هەموو کارەدا بگات، کەچی ئامادەنەبوو واز لە هیچ کام لەو دەسەڵاتانە بهێنێت"[1].

لە کۆتاییی ئەو ساڵەدا نەوشیروان مستەفا ئەمین، جێگری سکرتێری گشتیی یەکێتی دەستی لە هەموو پۆستەکانی لە ناو ئەو حیزبەدا کشاندەوە[2]. لە ئاداری کۆمپانیایەکی ڕاگەیاندنی بە ناوی (کۆمپانیای وشە) دامەزراند[3]. کە لە سایتێکی ئەلیکترۆنیو ڕۆژنامەیەك و ڕادیۆیەك و

---

1. هەمان سەرچاوە.

2. بڕوانە: ئاوێنە، نەوشیروان مستەفا لە گروپێکی ڕەخنەگرانەوە بۆ ئۆپۆزسیۆن، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ژمارە ١٤١، ٢٩ی ئەیلولی.

هەروەها، نهێنییەکانی دەست لە کارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفا، لە سەر سایتی:
http://www.iraqcenter.net/vb/28938.html

3. بڕوانە:

کەناڵێکی ئاسمانی و چاپخانەیەك پێکهاتبوو. لەو کاتەیشەوە نەوشیروان مستەفا، لە ڕێگەی دروستکردنی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی بەهێزەوە، هەموو هەوڵی خۆی بۆ هێنانەدی گۆڕانکاریی سەرلەبەری سیستەمی سیاسیی هەرێمدا تەرخان کردووە. بۆ خۆی هۆکاری وازهێنانی لە یەکێتی ئاوا لێك دەداتەوە: " پێم وابوو چاکسازیکردن لە حکومەتدا لە سەر چاکسازیکردن لە حیزبدا وەستاوە، بەڵام دواتر لەوە نائومێد بووم و وازم لە حیزب هێنا و هاوڕێیانی تریش مانەوە"[1].

ئەو و هاوڕێیانی تری لە هەڵبژاردنەکەی تەمووزی بە لیستێکی نوێ بەشدارییان کرد و لیستەکەیشی پلەی دووەمی بە دەست هێنا و ٢٥ کورسیی پەرلەمانی بردەوە.

لەوەی ڕابورد دەتوانین بڵێین، سەرەڕای نەبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی کارا لەو قۆناغەی هەرێمدا، جا لە پەرلەماندا بێت یان لە حکومەتدا، بەڵام هەرێم سەرەتایەکی فیکری و کۆمەڵایەتی و بزووتنەوەیەکی سیاسی و جەماوەری و مەدەنی و میدیایی ئەوتۆی بەخۆوە بینی، کە ڕێگەی بۆ دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی ڕاستەقینە لە قۆناغی دواتردا خۆش کرد.

### ٣: دەرکەوتنی ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن _ خولی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان:

ئەم قۆناغە پەرەسەندنێکی گەورەی لە ڕووی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا بەخۆوە بینی، ئەوە بوو چەند حیزبێکی ئۆپۆزسیۆنی ڕەسمی دروست بوون. پەیوەندییان پێکەوە بەرەو پێش چوو و ئاستی هەماهەنگیی نێوانیشیان زیادی کرد. دەکرێت لە چەند تەوەرێکدا باسەکە کورت بکەینەوە:

---

http://www.wusha.net/Content.aspx?LinkID=1

[1]. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی شەخسی.

### ٣-١: حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی هەرێمی کوردستان:

لە ئێستادا دوو ڕەوت نوێنەرایەتیی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا دەکەن: یەکێکیان عەلمانییە کە گۆڕانە، ئەوی دیکەیشیان ئیسلامییە کە لە یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی پێك هاتووە.

### یەکەم: بزووتنەوەی گۆڕان[1].

نەوشیروان مستەفا ئەمین، جێگری پێشووی سکرتێری گشتیی یەکێتی و ڕێکخەری ئێستای بزووتنەوەی گۆڕان، پاش ئەوەی خۆی و هاوڕێیانی لە یەکێتی کشانەوە، بە هۆی ئەو مێژووە پڕ لە خەبات و سیاسەت و ڕۆشنبیرییەی هەیەتی، بە بزوێنەری سەرەکیی بزووتنەوە نوێیەکە دادەنرێت[2]. هەر ئەو بوو سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ڕەخنە لەخۆگرتنی لەناوخۆی یەکێتیدا کرد، کە بە باڵی ڕیفۆرم ناسرابوو. کاتێکیش چاکسازی لە ناوخۆی حیزبدا گەیشتە ڕێگەیەکی بنبەست، نەوشیروان و چەند ئەندامێکی یەکێتی پێیان باشبوو دەست لە پۆستەکانیان بکشێننەوە و بزووتنەوەیەکی نوێ بە ناوی بزووتنەوەی (گۆڕان)ەوە دابمەزرێنن.

نەوشیروان مستەفا لە ساڵیدا زنجیرەیەك وتاری بە ناوی "ئێمە و ئەوان: ناکۆکییەکانمان لە سەر چین" بڵاو کردەوە[3]. دەتوانین ئەو زنجیرە وتارە بە

---

[1]. بۆ زانینی بەیاننامە و ئەدەبیاتی سیاسیی بزووتنەوەکە، بڕوانە ئەم لینکە،
http://gorran.net/Ar/Content.aspx?LinkID=47&Action=4

[2]. هەمووان دەزانین کە نەوشیروان مستەفا، یەکێکە لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتیی نیشتیمانی و هێزەکانی پێشمەرگە و ئەندازیاری ڕاپەڕینەکەی کوردستانی عێراقی ساڵیش بوو. جگە لەوەیش چەند کتێبێکی لە سەر مێژووی کوردستان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکەی بە زمانی کوردی هەیە، لەوانە (کورد و عەجەم، ئیمارەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم، لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، پەنجەکان یەکتری دەشکێنن و...هتد).

[3]. بڕوانە دەقی ئەو زنجیرەیە: نەوشیروان مستەفا، ئێمە و ئەوان، ناکۆکییەکانمان لە سەر چین؟، لە سایتی:

تیۆریزەکردنی هۆکارەکانی دامەزراندنی بزووتنەوەی گۆڕان بزانین، نەوشیروان مستەفا دەڵێت: "ئێمە دەمانەوێت حیزب دەستوەرنەداتە کاروباری دامودەزگا حکومییەکان و زانکۆکان و دادگاکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، بەڵام ئەوان دەیانەوێت کۆنترۆڵ زیاتر بکەن و دەست لە کاروباری ڕۆژانەی هاوڵاتییان وەربدەن. ئێمە دەمانەوێت لە دابەشکردنی سامان و مووچە و زەوی و کار لە هەرێمدا دادپەروەری هەبێت، کەچی ئەوان دەیانەوێت سامانی وڵات بەکار بهێنن و کار بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان بکەن و سەروەت و سامان وەك ئامرازێك بۆ ملکەچکردنی هاوڵاتییان بەکار بهێنن. ئێمە دەمانەوێت کاروباری دارایی و ئابووری و بازرگانی و سیاسی حکومەت شەفاف بن، ئەوان دەیانەوێت ئەم مەسەلانە بە نهێنی و لە پشت پەردەدا بهێڵنەوە[1].

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "ئێمە چاکسازیی ڕیشەییمان دەوێت، چاکسازیی ڕیشەیش لای ئێمە واتە گۆڕینی حکومەتی تاکە حیزبی شمولی (یەکێتی لە سلێمانی و پارتی لە هەولێر و دهۆك) بە حکومەتێکی دامەزراوەیی نیشتیمانیی کوردستانی[2].

بەڵام ئەوەی لە ناو یەکێتیدا پێی دەوترا (باڵی ڕیفۆرم) تاکە سەرچاوەی بزووتنەوەی گۆڕان نییە، ناتوانین بزووتنەوە مەدەنی و سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکانی هەرێم لە قۆناغەکانی ڕابردووی پرۆسەی سیاسیدا لە بیر بکەین، بە تایبەتی کە ئەوسا و ئێستایش ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە مشتومالکردنی ڕەوتی بەدیل بۆ ئەو قەیران و کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییانەی لە هەرێمدا هەن.

---

http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=778&AuthorID=36

1. بڕوانە هەمان سەرچاوە.

2. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، ئێمە دەزانین چیمان دەوێت، لە سایتی:
http://www.sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=4645&AuthorID=36

لە ٢٥ی تەمووزی هەڵبژاردنی پەرلەمانی و سەرۆکایەتیی هەرێم بەڕێوەچوون، (١٥) لیست لە سەر (١٠٠) کورسیی پەرلەمان و نۆ لیستی تورکمان و کلدان و ئاشووریش لە سەر (١١) کورسیی پێکهاتە غەیرە کوردییەکان[١] ڕکابەرییان کرد. هاوکات پێنج کەسیش، کە بریتیبوون لە: ئەحمەد محەمەد ڕەسول نەبی (سەفین حاجی شێخ محەمەد)، مەسعود بارزانی، حسێن گەرمیانی، هەڵۆ ئیبراهیم ئەحمەد و د.کەمال میراودەلی ڕکابەرییان لە سەر پۆستی سەرۆکی هەرێم کرد. پێویستە دان بەوەدا بنێین، کە هەڵمەتی هەڵبژاردن و ڕۆژی دەنگدان چەندین سەرپێچی و ساختەکارییان بەخۆوە بینی، لەوانەیش گواستنەوەی بەزۆری مەنهەجییانەی هاوڵاتییان، تەنیا لەبەر ئینتیمای سیاسییان[٢] و دەرکردنی چەندین فەرمانبەری دەوڵەت[٣] و لابردنی چەندینی تریش لە پۆستەکانیان، کە لەناویاندا ڕاگر و سەرۆک بەشی وەزارەتی خوێندنی باڵا

---

[1]. بە پێی هەمووارکردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان (١١) کورسی بۆ پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی تری هەرێمی کوردستان دابین کرا، بەم شێوەیە: (٥) کورسی بۆ کاندیدەکانی سریان و کلدان و ئاشووری و (٥) کورسییش بۆ تورکمان و کورسییەکیش بۆ ئەرمەنەکان.

[2]. کاتێك دەڵێین ئەو پرۆسەیە پلان بۆ داڕێژراو بووە، مەبەستمانە بڵێین لایەنی کەم لە ناو یەکێتیدا بڕیارێك هەبوو بۆ فشارخستنە سەر لیستەکانی تر، بە تایبەتییش لیستی گۆڕان، لە ڕێگەی دەرکردن لە وەزیفە یان گواستنەوەی بە زۆری کادرەکانی لە ناو دامودەزگا و فەرمانگە حکومییەکاندا. لەو بارەیەوە مەلا بەختیار، سەرکردە لە یەکێتیی نیشتیمانی لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی (ئاوێنە)دا وتی: هەر پۆستێك، جا گەورە بێت یان بچوك، لە بەڕێوەبەری ناحیە و پۆلیس و هێزە ئەمنییەکان و پێشمەرگە تا بە پۆستە گەورەکان دەگات، مادام کاندیدی یەکێتین بۆ ئەو پۆستانە، بۆیە مافی خۆیشیەتی بیانگۆڕێت و سزایان بدات و متمانەیان لێ وەربگرێتەوە". بۆ بینینی دەقی چاوپێکەوتنەکە بڕوانە: ئاوێنە، مەلا بەختیار، یەکێتی و پارتی سی ملیۆن دۆلار لە حکومەت وەردەگرن، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Babet&Cor=Chawpekewtin&jimare=715

[3]. بۆ نموونە بڕوانە، فەلاح ئەحمەد، بە پێچەوانەی یاسای هەڵبژاردنەکانەوە، یەکێتی بەردەوامە لە دەرکردنی فەرمانبەرە حکومییەکان، لە سەر سایتی :
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17525&cat=1

هەبوون[1]، جگە لە هەڕەشەکردن لە کادریچەندین لیستیجیاواز[2] سەرەڕایئەوانەیش لە ڕۆژیدەنگداندا ساختەکارییەکیزۆر کرا، بە تایبەتییش لە هەولێر و دهۆک[3] بێگومان ئەوەیش بوو بە هۆیساختەکردنیدەنگیدەنگدەران و

---

1. بۆ نموونە بڕوانە، دەرکردنیچەند مامۆستایەك بە هۆیلیستیگۆڕانەوە، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=3810
هەروەها بڕوانە، دلێر عەبدولخالق، ڕاگریکۆلێژیزانستە مرۆڤایەتییەکانیزانکۆیکۆیە لە پۆستەکەیدووردەخرێتەوە، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17397&cat=1
2. بۆ نموونە بڕوانە: سبەی، لە سکاڵایەکدا بۆ بەردەم ڕایگشتی، سەرۆکیلیستیچاکسازییکوردستان، ماوەیەکە فشار دەخرێتە سەر ئەو کەسانەیپارمەتیمان دەدەن، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17459&cat=1
هەروەها بڕوانە، هەلۆیست عوسمان و بەرهەم لەتیف، دیمانە لەگەڵ د. عەبدولوسەور بارزانی، گۆڤاریڕێگا، ژمارە ١٣، حوزەیرانی، ل ١٧-١٩.
3. جۆرێك لە کۆدەنگیلە ڕاپۆرتیتۆڕەکانیچاودێریهەڵبژاردنەکان لە سەر ڕوودانیساختەکارییەکیفراوان لەو هەڵبژاردنەدا هەیە، لێرەدا هەندێك لەو ڕاپۆرتانە دەخەینە بەرچاو کە ڕۆژنامە ناوخۆییو جیهانییەکان بەشێکیان لێ گواستوەتەوە.
The Economist print edition, The times they are a-Changing: on site:
http://www.economist.com/world/mideast-africa/displaystory.cfm?story_id=14140770

- هەروەها، ئاوێنە، پەیمانگەیمافەکانیمرۆڤ: ساختەکارییزۆر کراوە، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=4517
- هەروەها: ڕاپۆرتیکۆتاییڕێکخراویتەمووز لە بارەی هەڵبژاردنیسەرۆکایەتیو پەرلەمانیهەرێمیکوردستانییەوە، لە سەر سایتی:
http://www.tammuz.net/news/arabic/03-09-009a.pdf
- هەروەها، هاوڵاتی، نوێنەریسێ ڕێکخراوینێودەوڵەتی: لە لایەن حیزبیدەسەڵاتدارەوە پێشێلکارییزۆر کراوە، لە سەر سایتی :
http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=10224&LinkID=63
- هەروەها بڕوانە نامەیەکیکونسوڵیفەرەنسا بۆ سەڵاحەدین بەهادین، سەرۆکیلیستیچاکسازیو خزمەتگوزاری، لە سەر سایتی:
http://www.kurdiu.org/fileup3/3278french.pdf
- شتێك بە ناویبڵاوکراوەیەکیناوخۆییپارتییەوە بڵاوەیپێ کرا، کە تیایدا دان بە ئەنجامدانیساختەکاریلە لایەن هەندێك لە کادرانییەوە دەنێت، کە کاریگەرییخراپیبۆ سەر سومعەیپارتیهەبوو. بۆ زانیاریلە

شـــــــــــــێواندنی ئـــــــــــــــه نجامی هه ڵبژاردنـــــــــــــــه کان و ده رنه که وتنی ئه نجامی ڕاسته قینه ی پرۆسه ی ده نگدانه که.

سه ره ڕای ئه وانه، نه وشیروان مسته فا چه ند هۆکارێکی تر باس ده کات، که بوونه هۆی ده رنه که وتنی ئه نجامی ڕاسته قینه ی هه ڵبژاردنه کان، له وانه یش:

١. بوونی ناوچه گه لێکی عه شایه ری که له ژێر کۆنترۆڵی پارتی دان، له وانه یش سۆران و چۆمان و مێرگه سوور و بارزان و عه قره.

٢. ڕکابه رییه که ته نیا له گه ڵ پارتی و یه کێتی نه بوو، به ڵکو چه ند حیزبێکی تریش هه بوون، که هه رچه نده عێراقیش نه بوون، به ڵام ئه ندام و لایه نگرانیان ده نگیان به پارتی و یه کێتی دا، وه ك حیزبه کوردییه کانی ئێران و پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا[1].

سه ره ڕای هه موو ئه وانه یش، لیستی گۆڕان توانی هه زار و ٢٤ ده نگ، واته ٢٣,٧٢٪ ی ڕێژه ی ده نگه کانی به ده ست بهێنێت، له به رامبه ردا لیستی کوردستانی (هاوپه یمانیی پارتی و یه کێتی) یه ك ملیۆنێك و ٧٦ هه زار و ٣٧٠ ده نگ، واته ٥٧,٣٧٪ ی ڕێژه ی ده نگه کانی به ده ست هێنا[2]. به و ئه نجامه یش لیستی گۆڕان ٢٥ کورسیی په رله مان و لیستی چاکسازی و خزمه تگوزاری کورسی و لیستی کوردستانیش ٥٩ کورسییان به ده ست هێنا.

---

سەر ئەو بڵاوکراوەیە، بڕوانە: هاوڵاتی، پارتیدان بە ئەنجامدانیساختەکاریلە هەڵبژاردنەکانیتەمووزدا دەنێت، لە سەر سایتی:

http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=12191&LinkID=63

1. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکیشەخسی.

2. بڕوانە وردەکاریینەنجامیهەڵبژاردنەکانیسەرۆکایەتیو پەرلەمانیهەرێمیکوردستان لە سەر سایتیکۆمسیۆنیباڵایسەربەخۆیهەڵبژاردنەکان لە عێراق:

http://www.ihec.iq/Arabic/Parliamentary_elections_for_the_Kurdistan_region.aspx

سەرەڕای ئەو ئەنجامە تارادەیەك پۆزەتیڤەی بزووتنەوەی گۆڕان، دامەزرێنەری بزووتنەوەکە هۆکاری ئەو ئەنجامەی گەڕاندەوە بۆ ڕکابەرییەکی ناهاوتای نێوان هەر دوو لا، دەڵێت: ئێمە چووینە ڕکابەریی چەند حیزبێکەوە کە لە قەبارەی ئێمەدا نەبوون، چونکە ئەو حیزبانە سەرۆکایەتیی کۆماری عێراق و سەرۆکایەتیی هەرێم و سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم و جێگری سەرۆکی پەرلەمانی عێراق و چەندین وەزیریان لە بەغدا و هەرێمیش هەیە، سەرەڕای ئەوەی دەزگا میدیایی و ئەمنییەکانیان کۆنترۆڵ کردووە و سامانی گشتییان بۆ بردنەوەی ڕکابەرییەکە بەکار هێناوە، بەڵام ئێمە تاکە وەزیرێکیشمان نەبوو[1].

ئەگەر بەوردی لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنانە بڕوانین و بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان لە ٢٠٠٥ بەراوردی بکەین دەبینین، جیاوازییان لەوەدایە، هێزێك هاتووەتە پێشەوە کە پێشتر بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ژیانی سیاسیدا بەشداریی نەکردووە، کە ئەویش بزووتنەوەی گۆڕانە و توانییەك لە سەر چواری دەنگەکان بباتەوە. لە بەرامبەریشدا هێزە سەرەکییەکان چەند کورسییەکیان لەدەستدا[2]. ئەو هێزەیش بەشداریکردنی لە حکومەتدا ڕەت کردەوە و بڕیاری دا بە ٢٥ کورسیی خۆیەوە لەگەڵ هەریەکە لە یەکگرتووی ئیسلامی بە شەش کورسی و کۆمەڵی ئیسلامی بە چوار

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی شەخسی.

[2]. لە خولی دووەمی پەرلەمانی هەرێمدا، پارتی و یەکێتی کورسییان هەبوو، کەچی لە خولی سێیەمدا بوو بە ٥٩ کورسی، واتە ٩ کورسییان لە دەست دا. هاوکات یەکگرتووی ئیسلامییش کە وەك هێزی سێیەم لە هەرێمدا سەیر دەکرا، لە خولی دووەمدا ٩ کورسیی هەبوو، بەڵام لە خولی سێیەمدا بوو بە ٦ کورسی، واتە ٣ کورسیی دۆڕاند. بۆ زانیاری لە سەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی خولی دووەمی پەرلەمانی هەرێم بڕوانە: ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی خولی دووەم ٢٠٠٥، سەرچاوەی پێشوو، لەگەڵ ئەنجامەکانی خولی سێیەمدا بەراوردی بکە، کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە.

کورسی و لیستی ڕافیدەینی ئاشووری بە دوو کورسی، وەك ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانی بمێننەوە[1].

نەوشیروان مستەفا، ڕێکخەری گشتی بزووتنەوەی گۆڕان، هۆکاری بەشداری نەکردنی بزووتنەوەکەی لە حکومەتدا بەم شێوەیە ڕوون کردەوە: ئێمە بەدیل دەخەینە ڕوو لە چۆنێتیی بەڕێوەبردنی حکومەت و نەهێشتنی گەندەڵیی دارایی و ئیداری و سیاسی و ئەخلاقی و چەسپاندنی کۆڵەکەکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و بوونی شەفافیەت لە بودجەی هەرێمی کوردستان و پەیوەندییە سیاسییەکان و سنووردانان بۆ دەستوەردانی حیزب لە بەڕێوەبردنی ڕۆژانەی فەرمانگە حکومییەکان و بازاڕ و زانکۆ و مزگەوتەکان و گۆڕینی هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایش (هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیی) لە هێزگەلی حیزبییەوە بۆ دامەزراوە گەلێکی حکومیی بێلایەن لە هەڵبژاردنەکان و ململانێ حیزبییەکاندا و بخرێنە خزمەتی پاراستنی گەلەوە. حکومەتی ئێستای هەرێم بە هەمان پێوەرە کۆنەکان پێك هێنراوە و هەمان دیوە نێگەتیڤەکانی ڕابردووی تێدایە، بۆیە بەشداریمان تێدا نەکرد[2].

لە ئاداریدا بزووتنەوەی گۆڕان بە هەمان گوتاری سیاسیی خۆیەوە لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بەشداریی کرد و توانی، سەرەڕای ئەو فشارە زۆرەی لەسەری بوو، هەمان ئاستی جەماوەریی خۆی لە چوارچێوەی هەرێمدا

---

1. بڕوانە تانەکانی ئەو لیستە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی تەمووزی: سبەی، یونادیم کەنا؛ حکومەت بە پێشێلکاری تۆمەتبار دەکات، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=19023&cat=1

2. شێرزاد شێخانی، دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە کوردستانی عێراق، ڕۆژنامەی (شەرقولئەوسەت)، ژمارە ١١٣٨٦، شەممە ٣٠ی کانوونی دووەمی، لە سەر سایتی:
http://www.aawsat.com/details.asp?section=4&issueno=11386&article=555070&search=%D9%86%D9%88%D8%B4%D9%8A%D8%B1%D9%88%D8%A7%D9%86&state=true

بپارێزێت[1]. بەڵام بزووتنەوەکە لە ناوچەکانی تری عێراق و بە تایبەتییش لە ناوچە جێناکۆکەکانی موسڵ و کەرکووك و سەڵاحەدین و دیالە، نەیتوانی متمانەی دەنگدەران، بە تایبەتییش کوردەکان بە دەست بهێنێت یان هیچ کورسییەك بباتەوە. دەشێت هۆکاری ئەوەیش بریتی بێت لەوەی، بزووتنەوەی گۆڕان لەو ناوچانەدا هیچ گوتارێکی نەتەوەیی توندڕەوانە و وەهمییانەی نەگرتبووە بەر[2]، لە کاتێکدا پارتی و یەکێتی، چونکە لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا تەرکیزیان خستبووە سەر لایەنی نەتەوەیی، زۆربەی دەنگی کوردەکانی ئەو ناوچانەیان بردەوە. شایەنی باسە هەمان سیناریۆ لە ناوچە عەرەبی و جێناکۆکەکانیشدا دووبارە بووەوە، کە ئەو حیزبانەی گوتاری نەتەوەییان نەگرتبووە بەر، وەك حیزبی ئیسلامی و ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی، توشی شکستی گەورە بوون. لە بەرامبەردا ئەو لیستانەی گوتاری نەتەوەیی و سیاسیی توندیان گرتبووە بەر سەرکەوتن، وەك لیستی(گفتوگۆی نیشتیمانی) و لیستی(حەدبا).

[1]. لەو هەڵبژاردنەدا بزووتنەوەی گۆڕان ٤٢٥ هەزار و ٧٩٢ دەنگی لە هەر سێ پارێزگاکەی هەرێم بە دەست هێنا، کە دەکاتە نیزکەی٪ی دەنگەکان. ئەو ئەنجامەیش نزیکە لە دەنگەکانی ئەو بزووتنەوەیەوە لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان، کە تیایدا ٢٣,٧٢٪ی دەنگەکانی بە دەست هێنا. بڕوانە: دەرباز محەمەد، ل ٤٢.

[2]. بزووتنەوەکە هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، لە بەرنامەی سیاسیدا گوتارێکی میانڕەوانەی دەرهەق بە پەیوەندییەکانی هەرێم لەگەڵ بەغداد گرتە بەر. کرۆکی ئەو بەرنامەیەیش بریتی بوو لە پشتیوانیی بزووتنەوەکە لە بنیاتنانەوەی عێراقێکی دیموکراسیی پەرلەمانیی فرەیی و فیدراڵی، لەگەڵ بێزاندنی توندوتیژی و تیرۆر و دەمارگیری و جیاکاریی ئایینی و مەزهەبی و نەتەوەیی و ڕەگەزی و سیاسی. هەروەها بزووتنەوەکە بنەمای هاوبەشێتی و گفتوگۆ و لێك تێگەیشتنی بۆ چارەسەرکردنی کێشە هەڵپەسێراوەکانی نێوان هەرێم و بەغدا هەڵبژارد. ئەو بنەمایانەیش ڕەنگدانەوەیان لە سەر بەرنامەی هەڵبژاردنی بزووتنەوەی گۆڕان بۆ هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق هەبوو، بڕوانە، بەرنامەی هەڵبژاردنی لیستی گۆڕان بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/SEB_Raprsy.aspx?SubjectID=90

**دووەم: ڕەوتی ئیسلامی:**

حیزبە ئیسلامییەکان زادەی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستان نەبوون، بەڵکو ڕیشەی ئەو حیزبانە بۆ چەندین دەیە پێش ئێستا، بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، کاتێک ڕێکخستنەکانی بزووتنەوەی ئیخوان موسلمین گەیشتنە چەند ناوچەیەکی کوردستان. چەندین جار جیابوونەوەیشیان تێدا ڕووی داوە، دیارترینیان دامەزراندنی" بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق"ە لە ساڵی لە ئێران و بەشداریکردنی لە شەڕی دژ بە ڕژێمی پێشووی عێراقدا (ئەوەیش پاش یەکخستنی ماڵی بنەماڵەی عەبدولعەزیز بە ڕێبەرایەتی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز و باڵی عەلی باپیر و ڕابیتەی ئیسلامی بە ڕێبەرایەتیی شێخ محەمەد بەرزنجی). ئەو بزووتنەوەیە و چەند باڵێکی تری ئیسلامییش چەند جارێک شەڕی چەکدارییان دژی هێزە عەلمانییەکان، بە تایبەتییش یەکێتیی نیشتیمانی کرد، ئەوەیش زۆری لاواز کردن. ڕەوتێکی ئەو هێزانەیش هاوکاریکردنی ئەمریکایان لە داگیرکردنی عێراقدا ڕەت کردەوە، بەو هۆیەیشەوە گورزی سەربازیی کوشندەی لێ وەشێنرا.

ئەو گۆڕانکارییانە و چەندینی تریش بوونە هۆی دابەشبوون و کەرتبوونی هێزە ئیسلامییەکان، تا ئەوەی لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا لە سێ بزووتنەوەی سەرەکیدا گیرسانەوە:

- یەکگرتووی ئیسلامی بە ڕێبەرایەتیی سەلاحەدین محەمەد بەهادین (کە لە ئێستادا و دوای دوایین کۆنگرەیان، محەمەد فەرەج ئەمینداری گشتیی ئەو حیزبەیە _ وەرگێڕ).
- کۆمەڵی ئیسلامی بە ڕێبەرایەتیی عەلی باپیر.

- بزووتنەوەی ئیسلامی بە ڕێبەرایەتیی مالی عەبدولعەزیز[1].

لــە ئــاداریدا یــەکگرتووی ئیــسلامی و کۆمــەڵی ئیــسلامی لەگــەڵ چــەند حیزبێکــی عــەلمانی تــردا، کــە بریتیبــوون لــە حیزبــی سۆسیالیــست دیمــوکرات و حیزبیزەحمەتکێشان بەرەیەکیان لە ناو حکومەتدا پێك هێنا بۆ ئەوەی ڕەخنە لــە حکومــەت و سیــستەمی سیاســیی هــەرێم بــە گــشتی بگــرن، ئــەوەیش لــە ڕێگــەی ئامــادەکردنی پرۆژەیــەکی چاکسازی و پێــدانی بــە دەســتەی باڵــای حیزبــە سیاسییەکان[2]. ئەو حیزبانەیش لە ١٠ی کانوونی دووەمی ڕاپۆرتێکی تریان لە بارەی دۆخــی نــاوخۆییی هــەرێمی کوردســتان و کێــشە و قەیرانــەکانی هــەرێم و شێوازی چارەســەرکردنیان خستەڕوو[3]. ئــەو چــوار حیزبــە لــە ٢٥ی تــەمووزی بــە لیــستێکی یــەکگرتوو بــە نــاوی لیــستی چاکسازی و خزمــەتگوزاری بەشــدارییان لــە هەڵبژاردنی خولی سێیەمی پەرلەمانی کوردستاندا کرد و ٢٤٠ هەزار و ٨٤٢ دەنگیــان بــە دەســت هێنــا، کــە دەکاتــە ١٢,٨٤٪ی دەنگــەکان، کــە لــە دواییــدا ١٣ کورســــیی پەرلــــەمانی کــــرد[4]. بــــەڵام دواتــــر ئــــەو لیــــستە، بــــە هۆی بەشداریکردنی حیزبی سۆسیالیست دیموکرات و حیزبــی زەحمەتکێــشانەوە لــە حکومەتــدا، هەڵوەشــایەوە[5]، بــەو شــێوەیەیش تــەنیا یــەکگرتووی ئیــسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی وەك ئۆپۆزسیۆن مانەوە[1].

---

[1]. ناکرێــت بزووتنــەوەی ئیــسلامی لــە ســەر حیزبــە ئۆپۆزســیۆنەکان بێتــە ئــەژمار، چــونکە لــە حکومەتی هەرێمی پاش هەڵبژاردنەکانیدا بەشداریی کرد و وەزارەتی ئەوقافی وەرگرت.

[2]. یاسین ساڵەح، ل ٢٤١.

[3]. بڕوانە ڕاپۆرتەکە لە سایتی:

http://komalaorg.org/Direje_K.aspx?Cor=Witar&Jimare=40

[4]. بڕوانە ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان لە سەر سایتی:

http://www.ihec.iq/Arabic/news_election_of_kurdistan.aspx

[5]. بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر ناکۆکییەکانی ناو ئەو لیستە بڕوانە:

دلێر عەبدوڵڵا، کۆمەڵی ئیسلامی هۆکاری شکستهێنانی لیستە چوار حیزبییەکە بوو، گۆڤاری ڕێگا، ژمارە ١٣، حوزەیرانی، لا ١٠_١١.

بەو شێوەیە، پاش بەشداریکردنی دوو حیزبە عەلمانییەکەی لیستی چاکسازی و خزمەتگوزاری لە حکومەتدا، حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی هەرێم ئەمانەی خوارەوە بوون:

- بزووتنەوەی گۆڕان بە ٢٥ کورسی.
- یەکگرتووی ئیسلامی بە ٦ کورسی.
- کۆمەڵی ئیسلامی بە ٤ کورسی.

ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا نزیکەی سێ لە سەر یەکی کورسییەکانی پەرلەمانیان بە دەست هێنا، توانیشیان پەیوەندییەکانیان بەرەو پێشەوە ببەن و هەماهەنگیی زیاتر لە نێوان خۆیان و فراکسیۆنەکانیان لە پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، بە تایبەتیش پاش ڕووداوەکانی ی شوباتی، دروست بکەن.

---

هەورەها بڕوانە، یاسین تەها، جیابوونەوە و زیانەکانی ناو ڕیزەکانی ئۆپۆزسیۆنی کوردی، لە سەر سایتی:
http://www.niqash.org/content.php?contentTypeID=75&id=2544=1

[1]. ئەو دوو حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە ٢٠١٠دا بە لیستی سەربەخۆ بەشدارییان کرد و ٢٥٩ هەزار و ٢١٨ دەنگیان لە هەرێمدا بە دەست هێنا، بۆیە شەش کورسییان لە کۆی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بردەوە (٤ بۆ یەکگرتووی ئیسلامی و ٢ بۆ کۆمەڵی ئیسلامی). ئەوەیش واتە ڕێژەی دەنگەکانی ئەو دوو حیزبە ئیسلامییە زۆر زیادی کردوە، چونکە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمدا ٢٤٠ هەزار و ٧٢٨ دەنگیان بە دەست هێنا، واتە ١٢,٨٤٪ی کۆی دەنگەکان. بڕوانە، دەرباز محەمەد، ل ٤٢.

هۆکاری ئەو زیادبوونەیش ئەوەیە ئەو دوو حیزبە، دوای هەڵبژاردنەکانی هەرێم بە ئۆپۆزسیۆنیان هەڵبژارد، هەروەها هەر دوو حیزبەکە بە لیستی سەربەخۆ، دوور لە حیزبە عەلمانییەکان بەشدارییان کرد و ڕەمزە ئاینییەکانیان بەکارهێنا و کەسانێکی ئاینییان بۆ هەڵبژاردنەکان کاندید کرد، بەوەیش زۆربەی ئەو کەسانەی لە هەڵبژاردنی هەرێم دەنگیان بە بزووتنەوەی ئیسلامی دابوو، دەنگیان بەم دوو حیزبە دا، لە کاتێکدا بزووتنەوەی ئیسلامی بە هۆی هاوپەیمانێتییەوە لەگەڵ پارتی و یەکێتی و حیزبە عەلمانییەکانی تر لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، دەنگێکی زۆری لە دەست دا، بەو هۆیەیشەوە هیچ کورسییەکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی نەبردەوە.

لەوێشەوە دەتوانین گرینگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕەوتێکی ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی کوردستاندا، لەمانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

1. نەبوونی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی: هاوڵاتیی ئاسایی کوردی بە حاڵ دەتوانێت بژێویی و پێویستییەکانی ژیانێکی ئاسایی و سادە بۆ خێزانەکەی دابین بکات. لە بەرامبەردا چینێکی زۆر دەوڵەمەند لە سەرکردەکانی ئەو کاتەی هەر دوو حیزبی سەرەکی و کەسە نزیکەکانیان دروستبوە، کە لەوپەڕی ناز و نیعمەتدا دەژین. دەستوەردانی هەر دوو حیزب و سەرکردەکانیان و کۆمپانیا بازرگانییەکانیان لە جومگە ئابووری و بازرگانییەکانی ژیانی هاوڵاتییان و قۆرخکردنیان بۆ خۆیان، بوەتە هۆی دروستکردنی کێشەی زۆری چینایەتی لە هەرێم و دەرکەوتنی کۆمەڵێك جیاوازیی زۆر ئاشکرای کۆمەڵایەتی، ئەوەیش وای کرد ڕەوتێکی ئۆپۆزسیۆن لە ناو عامەی خەڵکدا دروستبێت. جگە لەوانەیش خراپیی خزمەتگوزارییەکان (لە ئاوی خواردنەوەی پاك و ئاوەڕۆ و کارەبا و تەندروستی و ڕێگاوبان و هەموو کەرتە خزمەتگوزارییەکانی تریش) تووڕەییەکی زۆری جەماوەری دژ بە دەسەڵات بە دوای خۆیدا هێنا و بە پشتیوانیکردن و بەشداریکردن لە ئۆپۆزسیۆندا دەریان بڕی.

2. لە لایەکی تریشەوە چەند پرسێکی یەکلایی نەکراوەی نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی فیدراڵی، هۆکاری سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن بوون. نەبوونی بەرەوپێشچوونێکی بەرچاو لەو پرسانە لە ساڵانی ڕابردوودا (واتە لە خولی یەکەم و دواتری ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا) و چاوپۆشین لە مادەی دەستووری عێراق بە تایبەتی، ڕۆڵی گەورەیان لە سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا هەبوو. ئەگەر دەسەڵاتی سیاسیی هەرێمی کوردستان هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو مادەیەی لەگەڵ حکومەتی فیدراڵیدا بدایە، ئەو کات دەیتوانی پاساو بۆ کەمتەرخەمییەکانی ناوخۆی هەرێم بهێنێتەوە،

بەڵام تەواو بە پێچەوانەوەیە، نەك تواناى چارەسەرکردنى کێشەکانى نەبووە، بەڵکو ئەو دۆسیەیانەى ناکۆکییان لەسەرە زیاتر بوون و چەندینى تریشیان هاتە سەر، لەوانەیش دۆسیەى نەوت و غاز و بودجە و پێشمەرگە و نوێنەرایەتییەکانى هەرێم لە دەرەوە.

٣. نەبوونى رەوتێکى ئۆپۆزسیۆنى بەهێزى خاوەن پرۆژەیەکى بەدیل بە درێژاییى قۆناغەکانى رابردووى مەیدانى سیاسیى هەرێم، رۆڵى لە دروستبوونى بزووتنەوەى گۆڕان و دەرکەوتنى وەك سەرکردایەتیى ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمدا هەبووە. لە لایەکەوە هیچ کام لە پارتى و یەکێتى لە رابردوودا لە حکومەت نەکشانەوە تا لایەکیان حکومەت پێك بهێنێت و لایەکەى تریش بە رۆڵى ئۆپۆزسیۆن هەستێت. لە لایەکى ترەوە حیزبەکانى تریش، بە تایبەتى ئیسلامییەکان، بە هۆى کۆمەڵێك هۆکارى بابەتى و خودییەوە نەیانتوانى بە هەمان رۆڵ هەستن. لەبەر بوونى هۆکارەکانى سەرهەڵدانى ئۆپۆزسیۆن لە ئاستى جەماوەریدا و نەبوونى بەدیلێك، بۆشاییەکى گەورەى سیاسى لە هەرێمدا هەبوو. بزووتنەوەى گۆڕان توانى ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، بە تایبەتى کە سەرکردەکانى لە بزووتنەوەى رزگاریخوازى کوردیدا پێش سى ساڵ و لاى جەماوەریش ناسراو بوون و رۆڵەى سەرەکییان لە دامەزراندنى هەرێمى کوردستاندا هەبووە.

هەموو ئەو هۆکارانە پێکەوە بوونە هۆى دروستبوونى بزووتنەوەیەکى ئۆپۆزسیۆنى چالاك لە هەرێمى کوردستاندا.

### ٣-٢: ئۆپۆزسیۆنى سیاسى دواى رووداوەکانى شوباتى:

کۆمەڵێك رووداو و هەڵکەوت، پێکەوە بەشدار بوون لە خولقاندنى خۆپیشاندانەکانى هەرێمى کوردستان لە رۆژى شوباتى و رۆژانى دواییشدا. لەوانەیش:

١. فشاری بەردەوام بۆ سەر میدیا و میدیاکارە ئازادەکان، تا گەیشتە رادەی کوشتنی رۆژنامەنووسان (وەك رفاندنی رۆژنامەنووسی گەنج سەردەشت عوسمان لەبەردەم کۆلێژی ئادابی زانکۆ سەلاحەدین لە هەولێر و کوشتنی لە ەی ئایاری دا، کە بە هۆیەوە خۆپیشاندانی جەماوەری لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی هەرێمدا ئەنجام درا[1] و لێدان و زیندانیکردن و غەرامەکردنیان بە ملیۆنان دینار[2].

٢. نەبوونی مامەڵەیەکی جیدی لەگەڵ ئەو گەندەڵییە فراوانەی لە جومگە سەرەکییەکانی حکومەتی هەرێمدا هەبوون.

٣. بەکارهێنانی دەسەلاتی سەرۆکی هەرێم بۆ بێبەشکردنی بزووتنەوەی گۆڕان لە بەشداریکردنی لە حکومەتی عێراقیدا، کە بە پێی ئیستیحقاقی هەڵبژاردن و نەتەوەیی بەدەستی هێنابوو. ئەو حکومەتە ئیئتیلافییەیش بە شێوەی پشکایەتی حیزب و تایفە و نەتەوە جیاوازەکان پێك هاتبوو، لە رێگەی سیستەمی خاڵی سەر ژمارەی کورسییەکانی هەر قەوارەیەکی سیاسی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا.

٤. مەیلی هەر دوو حیزبی دەسەلاتداری هەرێم لە بەکارهێنانی زۆرینەی پەرلەمانییان، بۆ دەرکردنی کۆمەڵێك یاسای گرینگ کە پەیوەستن بە سیستەمی سیاسی و ئازادییە گشتییەکانەوە لە هەرێمدا، بە جۆرێك

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر چۆنێتیی تیرۆرکردنی سەردەشت عوسمان، بڕوانە:
SAM DAGHER, Abducted Kurdish Writer Is Found Dead in Iraq, in site: www.nytimes.com/2010/05/07/world/middleeast/07erbil.html?scp=4&sq=iraq&st=cse

2. بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر دەستدرێژیکردنە سەر رۆژنامەنووسان لە هەرێمدا، بڕوانە ئەو راپۆرتەی رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی بە ناونیشانی دەستدرێژیکردنە سەر رۆژنامەنووسان لە هەرێمی کوردستانی عێراق:

www.amnesty.org/ar/appeals-for-action/investigate-attacks-journalists-kurdistan-region-iraq

که خزمەت بە مانەوە و بەردەوامبوونی خۆیان لە سەر دەسەڵات بکات. لەو یاسایانەش، یاسای ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێمە، کە دەزگا ئەمنی و هەواڵگرییەکان لە چوارچێوەی ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێمدا، دەبەستێتەوە بە سەرۆکی هەرێمەوە و لە ژێر دەسەڵاتی خۆیشیدا دەبێت و دەسەڵاتێکی فراوانیشی پێ دراوە، کە دەتوانێت دەستوەردان و چاودێریی دامودەزگا حکومییەکان و کەس و هاوڵاتییانیش بکات، ئەوەیش ڕێگە بۆ بوونی هەرێمی کوردستان بە هەرێمێکی پۆلیسی خۆش دەکات. یەکێکی تر لەو یاسایانەی زۆرینەی پەرلەمانی دەری کردووە، یاسای ڕێکخستنی خۆپیشاندانەکانە، کە مافی خۆپیشاندانی هاوڵاتییان و حیزب و ڕێکخراوەکانی هەرێمی کوردستانی بەستوەتەوە بە مۆڵەت و ڕەزامەندیی دەسەڵاتدارانی هەرێمەوە. لەم ماوەیەی دواییشدا دەسەڵاتی سیاسیی هەرێمی کوردستان خۆپیشاندانی ئاشتییانەی هاوڵاتییانی قەدەغە و سەرکوت کردووە، هاوکات هەر دوو حیزب هەوڵیان داوە دەستەی باڵای هەڵبژاردنەکان بە پشکایەتیی حیزبی پێکبهێنن، بە جۆرێك کە بتوانن کۆنترۆڵی بکەن.

[5]. ئەو شۆڕشە جەماوەرییانەی لە سەرەتای ساڵی پارەوە لە تونس و میسر و یەمەن و لیبیا و سوریا ڕوویان دا، هاوڵاتییان و ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی هەرێمی کوردستانیان هاندا داوای گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە هەرێمدا بکەن، بە تایبەتی کە پێشتر هاوڵاتییان پەیامێکی ئاگادارکردنەوەیان ئاڕاستەی هەر دوو حیزبی دەسەڵاتداری هەرێم کرد تا گۆڕانکاری و چاکسازی بکەن، کاتێك لە دوایین هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا دەنگێکی زۆریان بە لیستی گۆڕان دا و چەندین گردبوونەوەیان دژ بە تیرۆرکردنی ڕۆژنامەنوس سەردەشت عوسمان و تێپەڕاندنی یاسای ڕێکخستنی هەڵبژاردنەکان سازدا.

بزووتنـــەوەی‌گـــۆڕان لـــە ٢٩ی‌کـــانوونی‌دووەمـــی‌بەیاننامەیـــەکی‌جـــەوت خاڵی‌بڵاوکردەوە و لـەو ڕێیـەوە پـڕۆژەی‌خـۆی‌بۆ چاکسازیی‌ڕیشەیی‌خستە بـەر دیـدی‌هێـزە سیاسـییەکانی‌هـەرێم. ئامـانجی‌بزووتنەوەکـە لـە دەرکردنـی‌ئـەو بەیاننامەیـە، وەك خـۆی‌دەڵێـت: دەرکردنـی‌هـەرێمی‌کوردسـتان بـوو لـەو قەیرانـە سیاسـیيەی‌چـەندین سـاڵە تێـی کـەوتوە، لـە کاتێکـدا بـاهۆزێکی‌دیموکراسـیی‌سـەرتاپاگیر هـەموو ناوچـەی‌خۆرهـەڵاتی‌ناوەڕاسـتی‌گرتوەتـەوە[١]. کەچـی‌هـەر دوو حیزبـی‌پـارتی‌و

---

[1]. هەر لە بەیاننامەکەدا هاتوە، ئێمە لە بزووتنەوەی گۆڕان چەندین جار بـە گوتـاری نووسـراو و زارەکی، چەندین جـار لـە ڕێگـەی فراکسیۆنەکانمانەوە لـە کوردسـتان و بەغـدا، دەسـەڵاتدارانی هـەر دوو حیزبـی فـەرمانڕەوامان لـە مەترسـی و پەرەسـەندنی ئـەم دۆخـە ئاگـادار کردۆتـەوە، بـەڵام جـار لـە دوای جـار ڕووبـەڕووی خەمـساردیی زیـاتر و بێبـاکیی زیـاتر بووینەتـەوە، بۆیـە ئێـستا کـاتی ئـەوە هـاتووە بزووتنەوەکەمان بە ڕاشکاوی و بە ئاگاداریی ئێوە ئـەم داواکاریيانـەپێشکەش بـە دەسـەڵاتداران و هـەموو هێـزە سیاسییەکانی کوردسـتان بکـات، وەك ڕێگەچـارەیەکی ڕاسـتەقینە بـۆ کۆتاییهێنـان بـەم سیـستەمە حیزبـسالارییە و دامەزرانـدنی سـەرەتایەکی تـازەی حـوکمڕانی کـە جێـی ڕەزامەنـدیی ئێـوە و شـانازیی هەمووان بێت:

مـەنعی سـەرکردایەتیی پـارتی و یـەکێتی لـە هـەموو جـۆرە دەسـتتێوەردانێ لـە کاروبـاری، حکومـەت و دائیرەکانی، پارلەمان، دادگا، ئاسایش، پێشمەرگە.

مەنعی دامەزراوەکانی ئاسایش، زانیاری و پاراستن و پێشمەرگە لە هەموو جۆرە دەستتێوەردانێك لە کاری سیاسیی خەڵك و چالاکییە جەماوەرییەکان، گۆڕینی بەڕێوەبەرەکانی ئەم دەزگایانـە بـە کەسـانی بێلایـەنی پیشەیی.

هەڵوەشاندنەوەی حکومەتـە حیزبییەکـەی ئیستای یـەکێتی و پـارتی و پێکهێنـانی حکومـەتێکی ئینتیقـالی تەکنۆکراتی بێلایەن.

هەڵوەشاندنەوەی ئەم پارلەمانەی ئێستا.

ئامـادەکردنی زەمینـەی هەڵبـژاردنێکی نـەزیهی بـێ تـەزویر بـۆ پارلـەمانی کوردسـتان کـە لـە ٣ مـانگ تـێ نەپەڕێ.

گێڕانـەوەی موڵك و ماڵی داگیرکراوی حکومەت و خەڵك لە لایەن حیزبەکان و کاربەدەستەکانییەوە.

کێشانەوەی ڕەشنووسی دەستووری هەرێم و هەموو ئەو یاسایانـەی پەیوەندیدارن بـە سیـستەمی حـوکمڕانی وڵاتەوە و حەواڵەکردنیان بۆ پارلەمانی داهاتوو.

ئێمە لە کاتێکدا ئەم خواستە جەماوەرییەڕادەگەیەنین:

یەکێتی بەتوندی بە ڕووی بەیاننامەکەدا وەستانەوە، کار گەیشتە گەمارۆدانی بارەگا حیزبییەکانی بزووتنەوەی گۆڕان لە لایەن هێزە چەکدارەکانیانەوە.

دوای ڕۆژ لە دەرکردنی ئەو بەیاننامەیە، واتە لە ١٧ی شوباتی خۆپیشاندانی جەماوەری لە چەند شارێکی هەرێمی کوردستان دەستی پێ کرد، لە هەندێک شوێنیشدا، بە تایبەتی لە شاری سلێمانی تا دوو مانگ بەردەوام بوو[1]. لە بەرامبەردا هێزەکانی پارتی، بە دەستپێک بە شاری هەولێر، ئەو خۆپیشاندانانەی سەرکوت کرد، هێزەکانی یەکێتیش هەمان کاریان لەگەڵ خۆپیشاندانەکانی شاری سلێمانیدا کرد.

ئەو ڕووداوانە بوونە هۆی بەهێزبوونی ڕیزەکانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی هەرێم و تەکانێکی تری بە هەوڵەکانیان بەخشی، لە فشارخستنە سەر هەر دوو حیزبی دەسەڵاتدار تا گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە هەرێمدا بکەن. لیژنەیەکی باڵای هێزە

---

داوا لە هەموو هێزە سیاسییەکانی کوردستان ئەکەین پشتگیریی خۆیانی بۆ دەرببڕن.

داوا لە دەسەڵاتدارانی کوردستان دەکەین کە لە ئاستی بەرپرسیارێتیی مێژوویی خۆیان دا بن بۆ جێبەجێکردنی.

بڕوانە دەقی بەیاننامەکە لە سەر سایتی:

http://sbeiy.com/ku/newsDetail.aspx?id=33467&cat=11

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر ئەو خۆپیشاندانانە و شێوازی مامەڵەکردنی دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵیاندا، بڕوانە:

- عەلا یوسف، ڕووداوەکانی سلێمانی ناکۆکی لە نێوان کوردەکاندا دروست دەکەن، لە سەر سایتی:
http://aljazeera.net/NR/exeres/F2D1E206-757B-40FE-9C8B-76499F63F905.htm
- جەزیرە نێت، زیادبوونی ژمارەی کوژراوان لە خۆپیشاندانەکانی سلێمانیدا، لە سەر سایتی:
http://aljazeera.net/NR/exeres/E73164D5-7887-42B2-990E-F921425E6875.htm
Namo Abdulla, Military presence halts protests in Iraq's Kurdistan, in Site:
http://www.reuters.com/article/2011/04/29/us-iraq-protests-kurdish-idUSTRE73S2MW20110429
- کۆمەڵەی بەرگریکردن لە ئازادیی ڕۆژنامەگەری، لە کەمتر لە هەفتەیەکدا زیاتر لە ٧٠ پێشێلکاری لە هەرێمی کوردستان تۆمارکراون، ٢٥ی نیسانی، لە سەر سایتی:
www.sdpfiq.com

ئۆپۆزسیۆنەکان پێکهێنرا و لە سەر پرۆژەی چاکسازیی سیاسیی هەرێم ڕێکەوتن، کە لە ٢٢ خاڵ پێکهاتبوو و لە ٣ی ئاداری ڕاگەیەنرا[1].

ناوەڕۆکی ئەو بەیاننامە هاوبەشەی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان، زۆر لە ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی پێشتری بزووتنەوەی گۆڕان جیاواز نییە، کە بە هۆیەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆری هێزەکانی تر بووەوە، لەوانەیش هێزەکانی ناو پەرلەمان لەو بەیاننامەیەی دەریا نکرد، ڕەخنەیان لێ گرت. ئەوەی پێویستە لەو چوارچێوەیەدا باس بکرێت، پەشۆکان و ناڕوونیی هەڵوێستی هەندێك لە حیزبە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستانە، بە تایبەتی حیزبە ئیسلامییە ئۆپۆزسیۆنەکان، کە خۆیان لە یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامیدا دەبیننەوە، چونکە پاش ئەوەی بەیاننامەیەکیان لەگەڵ حیزبەکانی ناو حکومەتدا دەرکرد، هاتن و بەیاننامەیەکیان بە هەمان ناوەڕۆکەوە لەگەڵ بزووتنەوەی گۆڕان دەرکرد. ئەو کارەیش دەشیا تێکەیشتنێکی خێرا لەو حیزبانەوە بەدەستەوە بدات و ئاستی جەماوەرییان کەم بکاتەوە، سەرباری ئەوانەیش بەیاننامە یان ڕوونکردنەوەیەکیان لە بارەی ئەو هەڵوێست گۆڕینەیان بڵاو نەکردەوە. لێرەیشدا دەکرێت ئاریشەی سازاندنی بنەمای عەقیدەیی و پراگماتیکی سیاسیی ئەو حیزبانە بوروژێنرێت.

حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان لە کۆبوونەوەکانیاندا جەختیان لە سەر ناوەڕۆکی ئەو بەیاننامەیە دەکردەوە، کە لە کۆبوونەوەی نیسانی ئاماژەی پێ درا و تیایدا سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن داواکار بوون[2]:

---

[1]. بۆ زانینی بەرنامەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە بارەی چاکسازی لە هەرێمدا بڕوانە، سایتی ڕەسمیی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، ناوەڕۆکی پرۆژەی هاوبەشی ئۆپۆزسیۆن لە بارەی چاکسازیی سیاسی و ئیداری لە هەرێمی کوردستان، لە سەر سایتی،
http://www.kurdiu.org/ar/hawal/index.php?pageid=64801

[2]. بڕوانە بەیاننامەی کۆتایی کۆبوونەوەی سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن، لە سەر سایتی :
http://sbeiy.com/ku/newsDetail.aspx?id=35400&cat=1

١. حکومـــەتی‌ئێـستا هەڵبوەشـێنرێتەوە و حکومـەتێکی‌کـاتی‌لــە ســەر بنەمای‌تەوافوق پێك بهێنرێت.

٢. ئەرکی‌سەرەکیی‌حکومەتی‌کاتی‌بریتی‌بێت لە:

أ. ئەنجامـــــدانی‌چاکـــــسازیی‌ڕیـــــشەیی، لـــــە ناویـــــشیاندا بەندەکانی(١_٢٠)ی‌پرۆژەی‌هاوبەشی‌هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان.

ب. زەمینــە خۆشــکردن بــۆ هەڵبــژاردنێکی‌ئازادانــەی‌بێگەردانــە، لــە سایەی‌بێلایەنیی‌حکومەت و دامودەزگا ڕەسمییەکان و قەدەغەکردنی‌هەموو جۆرە ساختەکاری‌و دەستوەردانێکی‌نایاسـایی، بـە جۆرێـك هـەلی‌یەکسان بـۆ هـەموو هێزەکانی‌بەشدار بوو لە هەڵبژاردنەکەدا برەخسێنرێت.

سەرەڕای‌ئـەو هەوڵانـەی‌ئۆپۆزسیۆن و ئامـادەبوونی‌بـۆ گفتوگۆ و دانوسـتان لەگـەڵ دەسـەڵاتدا، کەچی‌لـە بـەدیهێنانی‌لایـەنی‌کـەمیی‌ئامانجـەکانی‌لـە هەرێمـدا سـەرکەوتو نـەبووە، چـونکە حکومـەت گەیـشتە ئـەوەی‌بـە بڵـاوەپێکردنی‌هێـزە چـەکدارەکان لــە شــەقام و شــوێنە گـشتییەکاندا یـەکلایی‌بکاتــەوە، هــەموو شێوازەکانی‌ناڕەزاییی‌جەماوەریی‌قەدەغە کـرد و لـە ڕێگـەی‌بـڕینی‌مینحـەی‌حیزبـە ئۆپۆزسـیۆنەکانەوە، فـشاری‌مـادیی‌زۆری‌خـستە سـەریان. بـەو شـێوەیە، بـێ ئەوەی‌هیچ بەرەوپێشچوونێك لە سەر ئاستی‌سیاسیی هەرێم بەدی بێـت، دۆخەکـە ئارام کرایەوە، بەڵام بـەردەوامیی‌خۆپیـشاندان و فشاری‌بـەردەوامی‌ئۆپۆزسـیۆن، حکومـەتی‌ناچـار کـرد چـەند چاکـسازییەك لـە ڕووی‌دامەزرانـدنی‌فەرمانبـەران و باشترکردنی‌واقیعی‌کارەبا و ئاو و ڕێگەوبانەکانەوە ئەنجامبدات.

## ٤: دەستکەوتەکانی‌ئۆپۆزسـیۆنی‌سیاسـی‌و بەربەسـتەکانی‌و داهـاتووی‌لـە هەرێمی‌کوردستـاندا:

لەوەی‌باس کرا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، هەڵبژاردنـەکانی‌هـەرێمی‌کوردسـتان سـەرەتای‌دروسـتبوونی‌ئۆپۆزسـیۆنێکی‌سیاسـیی‌ڕێکخـراو و چـالاکە، لـەو کاتـەوە

خەریکە بە ڕۆڵیچالاکانەیخۆیلە هەرێمدا هەڵدەستێت، بێگومان ئەمەیش مانایوا نییە کە لە دۆخیسیاسیو یاساییتەندروستیخۆیدا بێت. بۆ ئەوەیلە ڕۆڵیڕاستەقینەیئۆپۆزسیۆن تێ بگەین، پێویستە لە سێ تەوەر وردبینەوە:

**٤-١: دەستکەوتەکانیئۆپۆزسیۆنیسیاسی:**

حیزبەکانیدەسەلآت ویستیان تا ساتیئەنجامدانیهەڵبژاردنەکانیئەنجومەنینوێنەرانیعێراق لە ٢٠١٠دا ڕۆڵیپەرلەمان پەك بخەن، بۆ ئەوەیدەرفەت نەدەنە ئۆپۆزسیۆن ڕۆڵیڕاستەقینەیخۆیلە ژیانیسیاسیدا نیشان بدات. پەرلەمان خرایە پشوویەکیزستانەوە و هیچ یاسایەك دەرنەکرا[1]، لەگەڵ ئەوەیشدا ئۆپۆزسیۆن توانیپرۆژە یاسا و بڕیار پێشکەش بکات، لەگەڵ ورووژاندن و کاراکردنەوەییاسایتردا، کە لە خولیدووەمیپەرلەماندا پێشنیازکرابوون و هیچ خوێندنەوەیەکیان بۆ نەکرابوو[2]. ئەو پرۆژانەیش بەشێکیئەو بەڵێنانە بوون، کە ئۆپۆزسیۆن و بە تایبەتییش بزووتنەوەیگۆڕان پێش هەڵبژاردنەکانیپەرلەمانیکوردستان لە تەمووزیدا بە دەنگدەرانیدابوو.

سەرەڕایئەوەیش، ئەندامانیپەرلەمان (لە گۆڕان و حیزبە ئیسلامییەکان) سەردانیمەیدانیشارەکانیکوردستان و دامودەزگا حکومییەکان دەکەن بۆ ئەوەیلە نزیکەوە ئاگاداریکێشە و خەمیهاوڵاتییان بن و بەدواداچوون بۆ کاریفەرمانگەکان بکەن و چاودێریبخەنە سەر دامودەزگا حکومییەکان[3]. هەر

---

[1]. شێرزاد شێخانی، دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا.

[2]. بۆ ئاگاداربوون لە تەواویئەو پرۆژانە، بڕوانە:
http://gorran.org/Content.aspx?LinkID=45&Action=1

[3]. بۆ نموونە بڕوانە، ژمارەیەك پەرلەمانتارانیگۆڕان سەردانیناحیەیبالیسان و گوندەکانیدەوروبەریان کرد، لە سەر سایتیڕەسمییبزووتنەوەیگۆڕان:
http://gorran.org/Detail.aspx?id=693&LinkID=3

لەو چوارچێوەیەیشدا فراکسیۆنی گۆڕان، بە چەندین ڕێگەی جیاواز لە وەزیرەکان دەپرسێتەوە[1]، کە ئەوەیش دەبێتە هۆی چالاککردنی ڕۆڵی چاودێریی پەرلەمان.

لە لایەکی ترەوە حیزبە دەسەڵاتدارەکان، دەتوانن چ لە متمانەبەخشین بە حکومەت، یان لە هەر دەنگدانێکی تری ناو پەرلەمانی کوردستاندا زۆرینەیان هەبێت، بەڵام بە هەمان شێوە و ڕادەی سەردەمی پێش سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن ئازاد نین (ئەمەیش لە کۆی دۆخی هەرێمی کوردستان خاڵێکی پۆزەتیڤە) هەروەها ئەو حیزبانە، ئەگەر چیتر دەیانەوێت لە دەسەڵاتدا بمێننەوە، ناچارن سیاسەتی نوێ پێڕەو بکەن[2]. کاریگەریی ئۆپۆزسیۆن لە سەر چۆنێتیی بەڕێوەچونی کارەکانی حکومەت وردە وردە دەرکەوتوە، بۆ نموونە، بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئەم هەرێمەدا پرۆژە بودجەی ساڵەکانی و ٢٠١١ خرانە بەردەم ڕای گشتی[3]. دیارترین بابەتەکانی نێو ئەو بودجەیەیش، بەراورد بە ساڵانی پێشوو، دیاریکردنی بودجەی حیزبەکانە بە ٩٠ ملیار دینار و بەستنەوەی بە دەرچوونی یاسایەك لە پەرلەمانی کوردستانەوە. ڕاستییەکەی، ڕای گشتی هیچی لە بارەی بودجەی حیزبەکان، بە تایبەتییش پارتی و یەکێتی نەدەزانی، تەنیا پاش

---

یان بڕوانە، پەرلەمانتارانی گۆڕان سەردانی لقی سلێمانی کۆمەڵەی کەمئەندامانی کوردستانیان کرد، لە سەر سایتی ڕەسمیی بزووتنەوەکە:

http://gorran.org/Detail.aspx?id=638&LinkID=3

1. بۆ نموونە بڕوانە، لە ڕێگەی سەرۆکایەتیی پەرلەمانەوە، فراکسیۆنی گۆڕان داوای ڕوونکردنەوە لە ناشتی هەورامی، وەزیری سامانە سروشتییەکان دەکات، لە سەر سایتی:

http://gorran.org/Detail.aspx?id=570&LinkID=3

2. د. کازم حەبیب، ڕێڕەوی حیزبە سیاسییەکان و ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی هەرێم.. ئەڵقەی سێیەم و کۆتایی لە زنجیرەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە کوردستانی عێراق، لە سەر سایتی :

http://www.akhbaar.org/wesima_articles/articles-20091115-80011.html

3. بڕوانە، پرۆژەی بودجە لە سایتی پەرلەمانی کوردستان:

http://www.kurdistan-parliament.org/files/articles/280110061636.pdf

ئەوە نەبێت کە ساڵیپار ئۆپۆزسیۆن ئەو پرسەیوروژاند(١). وەك دەزانین هەر دوو حیزب مانگانە ٣٥ ملیۆن دۆلاریان لە بودجەیهەرێم بردوە، واتە ٨٤٠ ملیۆن دۆلار لە ساڵێکدا، کە یەکسانە بە ١١٪یبودجەیساڵیهەرێم(٢). بەڵام لە یاسای بودجەیساڵیدا مانگانە دوو ملیۆن دۆلار بۆ هەریەکە لە پارتیو یەکێتیو دوو ملیۆنیش بۆ باقیحیزب و قەوارە و ڕێکخراوەکانیتر دیاری کراوە، واتە ساڵانە ٢٤ ملیۆن دۆلار بۆ هەر حیزبێکیان(٣). ئەوەیش واتە بودجەیحیزبەکان کرا بە یەك لە سەر دەیئەو پارەیەیپارتیو یەکێتیلە بودجەیساڵانیڕابردوودا دەیانبرد. ٧٦٤ ملیۆن دۆلار گەڕێنرایەوە بۆ بودجەیهەرێم، کە دەتوانرێت لە کەرتیخزمەتگوزارییو وەبەرهێناندا خەرج بکرێت.

لیژنە جیاوازەکانیپەرلەمانیش بە مەبەستیچاودێریکردنیچۆنێتیی کارکردنیحکومەت و فەرمانگە جیاوازەکان و دامەزراوە گشتییەکان، سەردانیمەیدانیدەکەن. سەرەڕایئەوەیکە پرۆژەیبودجەیهەرێم گفتوگۆیەکیوردیلە سەر دەکرێت(٤).

لەوەیڕابوورد دەگەینە ئەوەی، سەرەڕایکورتییتەمەنیگەیشتنیئۆپۆزسیۆنیسیاسیبە پەرلەمانیکوردستان و

---

[1]. عومەر سەید عەلی، ئەندامیدەستەیکارگێڕیشاوەیمەکتەبیسیاسییەکێتیو ئەندامێکیبەرچاویبزووتنەوەیگۆڕان بۆ یەکەمجار وتیکە ئەو بودجەیە هیهەر دوو حیزبەکەیە. بڕوانە: هاوڵاتی، یەکێتیزیاتر لە ٢٠ ملیۆن دۆلار لە بودجەیسلێمانیبۆ خۆیدەبات، لە سەر سایتی:
http://hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=7374&LinkID=68

[2]. بڕوانە، سبەی، یەکێتیو پارتیساڵانە ١١٪یبودجە بۆ خۆیان دەبەن، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=17631&cat=1

[3]. بڕوانە، ئاوێنە، حکومەت دوو مانگە مینحەیدارایپارتیو یەکێتیخەرج نەکردوە، لە سەر سایتی:
http://awene.com/Direje.aspx?Babet=Hewal&Jimare=5973

[4]. بڕوانە، پەرلەمانیکوردستان، لەم ڕۆژانەدا لیژنەکانیپەرلەمان سەرقاڵیخوێندنەوەیپرۆژەیبودجە و تاوتوێکردنین لە هەموو ڕوویەکەوە، بڕوانە:
http://www.kurdistan-parliament.org/default.aspx

سـەرەڕای‌نیـازی‌دەسـەلاَت لـە ڕێگریکـردن لـە چـالاکییەکانی‌لـە نـاوەوە و دەرەوەی‌پەرلەمانیشدا، کەچی‌فراکسیۆنی‌گۆڕان _بە حـوکمی‌ئـەوەی‌گـەورەترین کوتلەی‌ئۆپۆزسیۆنە لە پەرلەمانی‌کوردستان_ توانی‌نەریتی‌پەرلەمانیی‌نوێ بهێنێتە ئاراوە، لە پەیوەست بە چەسپاندنی‌ئۆپۆزسیۆنێکی‌سیاسیی‌ئیجابی‌و کارا لـە نـاو پەرلەمانـدا و تێکـەڵبوونی‌ڕۆژانـە بـە چـین و توێـژە جیاوازەکـانی‌کۆمەڵگـە[1] و چاودێریکردنی‌حکومـەت، نـەك هـەر ئەوەنـدە، بـەڵکو ئـەو نەریتانـەی‌بـە سـەر لیستی‌دەسەلاَتیشیدا سەپاندوە.

حیزبـــــە ئۆپۆزســــیۆنەکان ســــــەرکردایەتیی‌ناڕەزایەتییــــــە جەماوەرییـەکانی‌هەرێمیـشیان کـرد، بـە تایبـەتی‌لـە سـلێمانی(١٧ی‌شـوبات و ڕۆژانـی‌دوایـی) و داوای‌کۆمـەڵێك چاکسازیی‌سیاسـیی ڕیشەییان کـرد. ئەبوبـەکر عـــەلی، ســـەرکردە لـــە یـــەکگرتووی‌ئیـــسلامی‌لـــەو بارەیـــەوە دەڵێـــت: "خۆپیشاندانی‌سیاسی‌مافی‌هەر هاوڵاتییەکە. مافی‌خۆیشیانە داوای‌چاکسازی‌بکـەن. ئێمە لەو چالاکییانەدا بەشدار بووین، بەڵام لە توندوتیژیدا نا، چونکە بڕوامـان بـە توندوتیژی‌و دەستدرێژیکردنە سەر هیچ دامودەزگایەکی‌حکومی‌نییە و جـەخت لـە ئاشتی‌بوونی‌خۆپیشاندان دەکەینەوە"[2].

لـەوەی‌بـاس کـرا دەکرێـت بـە کـورتی‌بڵـێین، سـەرەڕای‌ئـەو دۆخـە جیاوازانەی‌حیزبە سیاسییە ئۆپۆزسیۆنەکانی‌هەرێم پێی دا تێپـەڕیون، توانیویانـە لـە چـەندین ئاسـتدا دەسـتکەوتی‌جیاوازیـان هـەبێت، جگـە لـەوەی‌تاڕادەیـەك سەرکەوتو بووە لەوەی‌ڕۆڵی‌ئۆپۆزسیۆنێکی‌ڕاستەقینە لـە هەرێمـدا بگێڕێـت، بـەو هۆیەیـشەوە دەسـەلاَتی‌سیاسـیی‌ئۆپۆزسـیۆن بەهەنـد وەردەگرێـت و حـسابی‌بـۆ دەکات.

---

[1]. شێرزاد شێخانی، دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا.

[2]. ئەبوبەکر کاروانی، دیمانەیەکی‌شەخسی، سلێمانی، ٢٠ی‌ئابی.

له لایەکی‌تریشەوە، حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی‌هەرێم لە کاری‌سیاسیی‌خۆیاندا زیاتر پێگەیشتوو و تێگەیشتوو بوون، ئەوەتا سەرەڕای‌جیاوازیی‌ئاراستەی‌فیکری‌و سیاسییان و دوو بەرەییبوونیان لە نێوان عەلمانی‌و ئیسلامیدا، کەچی‌توانیویانە ڕیزەکانی‌خۆیان یەك بخەن و توانیشیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی‌حیزبەکانی‌دەسەلاّتدا داواکارییەکانی‌خۆیان یەك بخەن.

**٤-٢: بەربەستەکانی‌ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسی‌لە هەرێمی‌کوردستاندا:**

**یەکەم: بەربەستەکانی‌دەسەلاّتی‌سیاسی:**

١. کاتێك بزووتنەوەی‌گۆڕان بڕیاری دا بە لیستی‌سەربەخۆ بەشداری‌لە هەڵبژاردنی‌پەرلەمانی‌کوردستاندا بکات، دەسەلاّتی‌سیاسی‌هەڵمەتێکی‌پلان بۆ داڕێژراوی‌دژی‌کادرانی‌بزووتنەوەکە دەست پێ کرد، ئەویش بە بڕینی‌مووچە و گواستنەوەی‌بەزۆر لە شوێنی‌وەزیفە و نیشتەجێبوونیان، بەڕادەیەك ژمارەی‌ئەو فەرمانبەرە حکومییانەی‌مووچەیان بڕدرا گەیشتە دوو هەزار کەس[١] دوای‌هەڵبژاردنەکەیش _تەنانەت پێش دەرچوونی‌ئەنجامە ڕەسمییەکان_ هەڵمەتی‌کوێرانە لە لایەن لایەنگرانی‌دەسەلاّتەوە کرایە سەر بارەگاکانی‌حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان[٢]. هەڕەشەی‌دەسەلاّت لە ئۆپۆزسیۆن پێی‌نایە قۆناغێکی‌ترەوە، کاتێك نووسینگەی‌پەرلەمانتارانی‌لیستی‌گۆڕانیان سووتاند و چەند کەسێکیان کوشت، هێرشیان دەکردە سەر ماڵەکانیان و کادرەکانیان دەڕفاند و بارەگاکانیان دەسووتاند[٣]. کاردانەوەی‌دەسەلاّت و لایەنگرانیان (کە دەتوانین بە

---

[1]. شێرزاد شێخانی، دیمانەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفا.

[2]. بڕوانە، کوردیو، هێرشکردنە سەر و تاڵانکردنی‌چەند نووسینگەیەکی‌فراکسیۆنی‌گۆڕان لە ڕووداوەکانی‌شەوی‌ڕابردوودا، لە سەر سایتی:
http://www.kurdiu.org/ar/hawal/index.php?pageid=8091

[3]. بڕوانە AFP :، ئۆپۆزسیۆنی‌سیاسیی‌کوردستانی‌عێراق باس لە پێشێلکارییەکانی‌دەرهەق بە ئەندامانیان دەکەن، لە سەر سایتی:

لایەنی کەمەوە بە نادیموکراسی ناوی ببەین) و دەربازبوونی ئەنجامدەرانی ئەو جۆرە کارانە لە یاسا و لێپرسینەوە، بووە هۆی دروستبوونی کەشێکی گەرم و گرژ و ترسان لە کاردانەوەی یەکتری.

٢. هەرچەندە لیستی گۆڕان نزیکەی یەک لە سەر چواری کورسییەکانی پەرلەمانی بردەوە، کەچی تا ئێستا حکومەت مینحەیەکی دادپەروەرانەی هەمیشەیی بە پێی ڕێکارە یاساییەکان بۆ تەرخان نەکردووە، وەک ئەوەی لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکاندا کراوە. لیژنە جیاوازەکانی پەرلەمان پرۆژەیەکیان بۆ دیاریکردنی مینحەی حیزب و قەوارە سیاسییەکان ئامادەکرد، بەڵام زۆرینەی دەسەڵاتدار نەیهێشت یاساکە دەربچێت. ئەگەری هەیە لە ماوەیەکی نزیکی داهاتوودا، کێشەی دارایی ئاستەنگی گەورە لەبەردەم ئۆپۆزسیۆندا دروست بکات[1].

٣. هەڵمەتی هەڵبژاردنی تەمووزی و ئەنجامەکانی و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوونە هۆی کەمبوونەوەی تووڕەیی و بێزاریی ڕای گشتی لە دەسەڵات، بە تایبەتیش لە پارێزگای سلێمانی. پێدەچێت

---

http://www.google.com/hostednews/afp/article/ALeqM5h1spHvJf7n_SVojslg7EfpnmCAyw

[1]. جەلال تاڵەبانی، سەرۆک کۆماری عێراق و سکرتێری گشتیی یەکێتی، پاش دەست لە کارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفا لە پۆستەکانی لە ناو ئەو حیزبەدا ١٠ ملیۆن دۆلار و بینایەکی حکومی و گردی زەرگەرتە، کە موڵکی کۆمپانیای نۆکانی نزیک لە یەکێتی بوو پێدا تا کۆمپانیایەکی ڕاگەیاندنی پێ دابمەزرێنێت. بە وتەی نەوشیروان مستەفا ئەو پارەتییانە یەکەمین و دوایەمین پارمەتیی بوون، ئەوەیش نەک پارمەتیدان نەک تەنیا کۆمپانیایەکی ڕاگەیاندن دابمەزرێنن (کە لەمڕۆدا لە کەناڵێکی ئاسمانی و ڕادیۆیەک و سایتێک و چاپخانەیەک پێکدێت)، بەڵکو پارمەتیدەریش بوو لە سەرپێخستنی بزووتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمدا.

بڕوانە، نەوشیروان مستەفا، ڕوونکردنەوەیەک لە نەوشیروان مستەفاوە، لە سەر سایتی:
http://sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=548&AuthorID=36

هەروەها بڕوانە سایتی کۆمپانیای ڕاگەیاندنی وشە_ی نزیک لە بزووتنەوەی گۆڕان:
http://www.wusha.net

ئەوەیش وا لە دەنگدەر بکات حەوسەڵەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکان و دەنگدانی بە لیستەکانی ئۆپۆزسیۆن نەبێت.

٤. پرسی ئەوەی دەنگی هاوڵاتییان تا ئێستا نەکراوەتە کردەوەیەکی بینراوی هەستپێکراو، ڕەنگە وا لە دەنگدەر بکات جارێکی تر دەنگ بە ئۆپۆزسیۆن نەدات. هاوکات کورتیی تەمەنی ئەو ئەزموونە نوێیەی هەرێمی کوردستان، واتە ئەزموونی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز، ڕەنگە وا لە هاوڵاتیی سادە بکات هەوڵ بدات زوو بەرهەمی دەنگدانەکەی بچنێتەوە و زوو واقیعی خزمەتگوزاری و بژێویی خۆی باشتر بکات.

## دووەم: بەربەستە ئابوورییەکان:

بەگشتی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان لە پشتیوانیکردنی کادرانی خۆیان و تەنانەت هەستان بە چالاکییەکانیان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی لەبەردەم جەماوەری خۆیاندا بە شێوەیەکی باش، قەیرانی داراییان هەیە. ئەوەیش بە هۆی کۆنترۆڵکردنی بودجە و پارەی هەرێم لە لایەن هەر دوو حیزبی دەسەلاتدارەوە، لەوێشەوە ئەرکی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان قورستر دەبێت. لەو ڕووەوە نەوشیروان مستەفا دەڵێت: "بودجەی بزووتنەوەی گۆڕان تەنیا پشت بە بەخششی خێرخوازان دەبەستێت و هیچ داهاتێکی ترمان نییە، بۆیە چالاکیمان سنووردارە و خەرجیی زۆریشمان نییە"[1].

## سێیەم: بەربەستە ناوخۆییەکان:

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی شەخسی. شایەنی باسە، دوای ئەو دیمانەیە لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا، لە لایەن حکومەتەوە مانگانە بڕی هەزار دۆلار بۆ بزووتنەوەکە تەرخان کرا، بەڵام ئەو مینحەیە لە ژێر ڕکێفی هەر دوو حیزبی دەسەڵاتداردایە، کاتێك بزووتنەوەکە و ئۆپۆزسیۆن بە گشتی هەڵوێستێکیان دەبێت کە بە دڵی ئەوان نەبێت، دەیبڕن. لە کاتێکدا مینحەی هەر دوو حیزبی دەسەڵاتدار لە بودجەی هەرێمدا مانگانە ٥ ملیۆن دۆلارە، ئەوەیش جگە لە مووچەی کادری حیزبی و ڕاگەیاندنکارانیان و خەرجی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیان، لە کاتێکدا کە قەبارەی کوتلەکانیان لە پەرلەماندا نزیکە لە فراکسیۆنی گۆڕانەوە.

حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی کوردستان قەیرانێکی ناوخۆییان هەیە، ئەویش نەبوونی متمانەیە لە نێوانیان و ترسان لەوەی لایەنی بەرامبەر دەست بە سەر سەرکردایەتیی ئۆپۆزسیۆندا بگرێت و ئەوانی تر پەراوێز بخات، سەرەڕای ترسان لە هاوکاریکردنی لایەنەکان لەگەڵ دەسەڵاتدا دژی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان. لەو بارەیەوە ئەبوبەکر عەلی، سەرکردە لە یەکگرتووی ئیسلامی وتی: "بزووتنەوەی گۆڕان خۆی وەك ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە دەبینێت و ئەوانی تر پەراوێز دەخات، جگە لەوەی هەڵوێست دەگۆڕێت و جێگیر نییە"[1].

**چوارەم: بەربەستی تر:**

چەند بەربەستێکی تر هەن پەیوەستن بە هەڵوێستی جەماوەری کوردستانەوە، هەندێکیان دەترسن لەوەی ئەگەر هەڵوێستیان لە بەرژەوەندیی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان بگۆڕن، ئەو ئیمتیازاتانە لە دەست بدەن کە لەگەڵ حیزبەکانی دەسەڵاتدا هەیانە، یان ئەوەی وەزیفەیان بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر. لەو بارەیەوە نەوشیروان مستەفا دەڵێت: "زیاتر لە ٥٠٠ کارمەندی هێزە چەکدارەکان و پۆستە جیاوازەکانی تریش، تەنیا لەبەر بوونە ئەندامیان لە بزووتنەوەی گۆڕاندا، لە وەزیفەکانیان گوازراونەتەوە"[2]. جگە لە ترسی بژێویی، باوەڕێکی باوی تر هەیە کە ئۆپۆزسیۆن لەوەی ئێستا حکومەت دەیکات، زیاتر و باشتری پێ ناکرێت، ئەوەیش بۆ خۆی کێشەیەکی ترە بۆ ئۆپۆزسیۆن. هەندێکیش پێیان وایە دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن هیچ جیاوازییان نییە، بە تایبەتی کە سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن هەمان ئەو کەسانە بوون کە سەردەمانێك لە دەسەڵاتدا بوون و هیچیان بۆ خەڵکی نەکرد.

---

1. ئەبوبەکر کاروانی، دیمانەیەکی شەخسی.

2. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی شەخسی.

لــــەوەیوتـــرا دەگەینـــە ئـــەوەی، کـــاریحیزبـــە ئۆپۆزســـیۆنەکان بەربەستیزۆریلەپێشە، هەندێکیان پەیوەستن بە خودیئۆپۆزسیۆن و قەیرانیبێ متمانــەیینێوانیــان و ترســیان لــە یــەکتری، هەنــدێکیتریــشیان پەیوەســتن بــە هــەوڵیحکومــەت بــە چــەندین شــێوە بــۆ لاوازکردنــیئۆپۆزســیۆن و لــە پایــە کەمکردنەوەی، کە هەندێك لەو شێوازانە ڕەوان و هەندێکیشیان نـاڕەوا. بـەوەیش ئۆپۆزسیۆن تاقیکردنەوەیەکیقورسیدەکەوێتە بەردەم، چونکە نە دەتوانێـت بـە ئەرك و ڕۆڵیڕاستەقینەیئۆپۆزسیۆن هەستێت، نە دەیشتوانێت ببێتـە بـەدیل بـۆ دەسەڵات، بۆیە وەك ئۆپۆزسیۆنێکیخاوەن کاریگەریلە مەیدانیسیاسییهەرێمـدا دەمێنێتەوە، بەڵام ناگاتە ئاسـتێك ببێتـە بـەدیلیدەسـەڵاتیسیاسـیلـە هەرێمـدا، لایەنیکەم لەم قۆناغەیئێستادا.

### ٤-٣: داهاتوویئۆپۆزسیۆنیسیاسیلە هەرێمیکوردستاندا:

هەرچەندە زووە باس لە داهـاتوویئـەو ئۆپۆزسـیۆنە بکـەین، کـە تـەنیا دوو ساڵ (تا کاتینووسینیئەم توێژینەوەیە دوو ساڵ، ئەگـەرنا لـە ئێـستادا لـە چـوار ســــاڵیش تێپــــەڕیوە_ وەرگێـــڕ) بـــــە ســــــەر ســـــەرکەوتنیلــــە هەڵبژاردنەکانیپەرلەمانیکوردسـتاندا تـێ دەپـەڕێت، بـەڵام دەتـوانین ئامـاژە بـە چــەند گۆڕانکارییــەك لــە بەرژەوەنــدییئۆپۆزســیۆنیسیاســی، بــە تایبــەتییش بزووتنەوەیگۆڕان، لە پرۆسەیسیاسییهەرێمدا بدەین.

هەڵوێستیدەنگدەریکوردیلە هەڵبژاردنـەکانیتـەمووزیو بـە تایبـەتییش لـە پارێزگایسلێمانی، جـاڕدانیشـکاندنیئـەو دیـواریتـرس و سـڵەمینەوەیە بـوو کـە بـاڵیبـە سـەر دۆخـیسیاسـیی هـەرێمیکوردسـتاندا کێـشابوو، ئـەو ترسـەیش لـە ئەنجامیچەند بارە بوونـەوەیشـەڕەکانینـاوخۆ و زۆریململانـێ ناوخۆییـەکان و ئەو کـردەوە تیرۆریـستییانەیگروپـەکانیوەك ئەنسارولئیـسلام پێـیهەڵدەسـتان، لەگــــەڵ وەڵــــامیدەســــەڵات بــــۆ ئــــەو کردەوانــــەوە دروســــتبووبوو.

سەرەڕای ئەوەی دەسەلاتی سیاسی بە هەموو قورساییەکی مادی و مەعنەوی و سەربازیی خۆیەوە (سەرەتا لە سەرۆك كۆماری عێراق و سەرۆکی هەرێمی کوردستان و وەزیرە کوردەکانی حکومەتی هەرێم و حکومەتی فیدراڵی، تا دەگاتە فەرمانگە حکومییەکان و هێزەکانی پێشمەرگە و...هتد) بەشداریی لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا کرد و سەرەڕای ئەو هەموو سەرپێچییانەی ئەنجامدران (کە باسمان کردن)، دەبینین زۆربەی دەنگدەرانی پارێزگای سلێمانی دەنگیان بە پاڵێوراوانی دەسەلات بۆ ئەندامێتی و سەرۆکایەتیی پەرلەمان نەدا[1].

لە لایەکی ترەوە، پێدەچێت بڕیاری پێدانی بودجەیەکی دادپەروەرانە بە حیزب و قەوارە سیاسییەکان، دەرگایەکی فراوان بە رووی چالاکییەکانی ئۆپۆزسیۆندا بکاتەوە، بە تایبەتی کە دەزانین (بەتایبەتتریش بزووتنەوەی گۆڕان) تا ئێستا هاوشـــێوەی حیزبـــە خۆرهەڵاتییـــە ســـتالینییەکان، ئـــەرك و خەرجیی بوونیاتنانی ڕێکخستنێکی حیزبیی نەخستوەتە ئەستۆی خۆی، کە پێویستی دەکات تەنانەت لە گوند و کۆڵان و گەڕەکەکانی شاریشدا بارەگا و نووسینگە بکەنەوە. ڕێکارێکی لەو شێوەیە دەشێت وا لە ئۆپۆزسیۆن بکات، بودجەی خۆی لە پرۆژەگەلێکدا خەرج بکات، کە لە داهاتوودا خۆشەویستی و دەنگی شەقامی کوردستانی پێ مسۆگەر بکات.

سەرباری هەموو ئەوانەیش، بزووتنەوەی گۆڕان_ بە حوکمی ئەوەی گەورەترین باڵی ئۆپۆزسیۆنە لە هەرێمدا_ بزووتنەوەیەکی نائایدیۆلۆژیی واقیعییە، فیکر و بەرنامەکانی لە سەر بە دەست هێنانی بەرژەوەندییە باڵاکانی هاوڵاتییانی هەرێم چڕ

---

[1]. سەرەڕای کەمیی ناوەندەکانی ڕاپرسی و نەبوونی پرۆفیشناڵیەت لای زۆربەیان، بەڵام ئەو ڕاپرسییە پەیمانگەی دهۆك بۆ پرسە سیاسییەکان لە دهۆك پێی هەستاوە. بە پێی ئەو ڕاپرسییە کە پەیمانگەی ناوبراو لە مانگی کانوونی یەکەمی پێ هەستاوە، دەرکەوتوە ٧٠٪ی دانیشتوانی دهۆك لە ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمدا ڕازین. بڕوانە: سبەی، پارێزگای دهۆك: ٧٠٪ی دانیشتوانی شاری دهۆك لە ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن لە ناو پەرلەماندا ڕازین. لە سەر سایتی:

http://sbeiy.com/ku/newsdetail.aspx?id=22683&cat=1

کردووەتەوە. ئەو خەسڵەتەیش وای‌کردووە، چین و توێژێکی‌زۆری‌هاوڵاتییان، بە باکگراوەندی‌فیکریی‌جیاوازەوە، چ بە بەشداریکردن لە لیستەکانی، یان بە دەنگ پێدان و پشتیوانی‌لێکردنی، پێشوازی‌لە بزووتنەوەکە بکەن. ئەوەیش لە داهاتوودا_ ئەگەر ئەو ئاراستە گشتییە لە سەرکردایەتیی‌بزووتنەوەکەدا بمێنێت و جێگیر بکرێت_ سەرکەوتنی‌زیاتر بە دەست دەهێنێت. دووریش نییە، بە تێپەرینی‌هەندێك كات، ئەزموونی‌پارتی‌داد و گەشەپێدانی‌تورکیا لە هەرێمی‌کوردستانی‌عێراقدا دووبارە بکرێتەوە.

بوونی‌ئۆپۆزسیۆنێکی‌بەهێز لە مەیدانی‌سیاسیی‌هەرێمی‌کوردستان و دەرکەوتنی‌ئەنجامەکانی‌بوونی‌ئۆپۆزسیۆنێکی‌لەو شێوەیە لە داهاتوویەکی‌نزیکدا، دەتوانێت کارێك بکات دەنگدەر متمانەی‌زیاتری‌بەو ئۆپۆزسیۆنە هەبێت و دەنگیشی‌پێ بدات. فشاری‌ئۆپۆزسیۆن لە سەر دەسەڵات بۆ نەهێشتنی‌گەندەڵی‌و پێرەوکردنی‌شەفافیەت لە بودجە و پرسە دارایی‌و ئابووری‌و بازرگانییەکانی‌تر و دابینکردنی‌خزمەتگوزارییە بنەرەتییەکان بۆ هاوڵاتییان، دەبێتە هۆی‌زیادبوونی‌متمانەی‌دەنگدەر بە ئۆپۆزسیۆن و، زیاتر لە رۆڵی‌گرینگ و بوونیاتنەرانەی‌ئۆپۆزسیۆن لە پاراستنی‌بەرژەوەندییەکانی‌و بەدەمەوەچوونی‌خواستەکانی‌و درککردن بە خەمەکانی‌تێ دەگات[1]. لە هەمان کاتدا، سەرکەوتنی‌ئۆپۆزسیۆن لەو ئەرکانەی‌خراونەتە سەر شانی، کاریگەریی‌باشی‌بۆ سەر پرۆسەی‌دیموکراسییەت و ژیانی‌سیاسی‌لە هەرێمدا دەبێت.

لە دوایین دانوستانی‌نێوان حیزبەکانی‌دەسەڵات و سێ حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکەدا، ئۆپۆزسیۆن پرۆژەیەکی‌بۆ چاکسازیی‌سیاسیی

---

[1]. لە راپرسییەکی‌رێکخراوی‌پۆینتی‌ئەمریکی‌لە هەرێم، لە مانگی‌تشرینی‌دووەمی‌دا ٦٩٪ی‌بەشداربووان پێیان وایە بزووتنەوەی‌گۆران توانیویەتی‌دەنگی‌راستەقینەی‌گەلی‌کوردستان بێت. بروانە، رێکخراوی‌پۆینت، ئۆپۆزسیۆن لە نێوان باقوبریقی‌دروشمەکان و بە دەست هێنانی‌دەستکەوتەکان، لە سەر سایتی،
http://www.pointnumber.com/ara/Default.aspx?page=survey&id=65

هەرێمی‌کوردستان، لە شەش پاکێجدا خستەڕوو، کە تایبەت بوون بە چاکسازی‌لە سیستەمی‌سیاسیی هەرێم، بە هێزە چەکداری‌و ئەمنییەکان، بە دەسەڵاتی‌دادوەری، بە ئەهێشتنی‌گەندەڵی، بە وەزارەتی‌پەروەردە و بە پێکهێنانی‌حکومەتێکی‌کاتی‌کە توانای‌ئەنجامدانی‌ئەو چاکسازییانەی‌هەبێت. ئەگەر حکومەتی‌داهاتوو، کە وا بڕیارە سەرەتای‌ساڵی‌داهاتوو پێك بهێنرێت (مەبەست لە کابینەی‌حەوتەمی‌حکومەتی‌هەرێمە، کە لە ئێستادا پێکهاتووە و نێچیرڤان بارزانی‌سەرۆك وەزیرانە و عیماد ئەحمەدیش جێگریەتی) ئەو پرۆژەیە جێبەجێ بکات، ئەوا ڕەنگە ببێتە هۆی‌بەدامەزراوەیی‌بوونی‌ژیانی‌سیاسی‌لە هەرێمدا، ئەوەیش ڕێگە بۆ ئالوگۆڕی‌ئاشتییانەی‌دەسەڵات و چەسپاندنی‌بنەماکانی‌دیموکراسییەت خۆش بکات. لێرەدا ناتوانین ڕۆڵی‌شۆڕشەکانی‌جیهانی‌عەرەبی‌فەرامۆش بکەین، کە شکستی‌سیستەمی‌حوکمڕانیی‌پشتبەستوویان بە تاك حیزب و حوکمی‌بنەماڵە سەلماند. بێگومان ڕووداوەکانی‌ناوچەکە کاریگەریی‌ڕاستەوخۆیان بۆ سەر هەرێمیش دەبێت و ئامرازێکیش دەبن بۆ فشارخستنە سەر دەسەڵات، تا چاکسازیی‌ڕیشەیی‌ئەنجام بدات. لەگەڵ ئەوەیشدا دوور نییە هاوڵاتییان و هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان جارێکی‌تر، بە شێوەیەکی‌بەهێزتریش پەنا بۆ شەقام ببەن، تا واقیعی‌سیاسیی‌تەقلیدیی‌بنجبەستوو و کۆنی‌هەرێم بگۆڕن.

حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان، بە تایبەتی‌بزووتنەوەی‌گۆڕان هیوایەکی‌گەورەیان بەوە هەیە، ڕێبەرایەتیی‌شەقام بکەن و دەسەڵات لەو حیزبانەی‌ئەمڕۆ دەسەڵاتدارن، وەربگرێتەوە و بیانکەن بە ئۆپۆزسیۆن. لەو بارەیەیشەوە نەوشیروان مستەفا دەڵێت: "ئۆپۆزسیۆن دەسەڵات هەر دەگرێتە دەست و حیزبەکانی‌دەسەڵاتیش هەر دەبنە ئۆپۆزسیۆن"[1].

---

[1]. نەوشیروان مستەفا، دیمانەیەکی‌شەخسی.

## کۆتایی

لە کۆی ئەوەی وترا دەتوانین بڵێین، زنجیرەیەک ڕووداو، بە تایبەتی لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، بوونە هۆی دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا، لەوانەیش ئارەزووی هەموو حیزبە کوردییەکان لە گەیشتن بە دەسەڵات، نەبوونی متمانە لە نێوان حیزبەکاندا، نەبوونی ئەزموونی حوکمڕانی و ژیانی دیموکراسییانە بە شێوەیەکی گشتی و سروشتی ئەو قۆناغەی ئەزموونی کوردستانی پێدا تێپەڕیوە، کە هەموان ئومێدی ئەوەیان هەبووە قۆناغی بوونیاتنان و دامەزراندن بێت و هەموان تیایدا بەشدار بن.

بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییدا کۆمەڵێک فاکتەری تر دەرکەوتن، بوونە هۆی سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆنی مەدەنی و ناڕەزایی جەماوەری و لە کۆتاییشدا لەدایکبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسیی بەهێز لە ناو پەرلەمانی کوردستاندا، لەوانەیش گۆڕینی سیستەمی سیاسی لە عێراق و بێزاربوونی خەڵکی لە خراپی دۆخی خزمەتگوزارییەکان و دەست لە کارکێشانەوەی ژمارەیەکی زۆری بەرپرسانی حیزبی لە یەکێتی.

هەموو ئەوانەیش ئاماژە و نیشانەی ڕاستەقینەی گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی ئۆپۆزسیۆن بوون، کە لە سەرەتادا ژمارەیەک ڕۆشنبیر و میدیای ئەهلی و ئازاد و بزووتنەوە مەدەنییەکان و ناڕەزایەتییە جەماوەرییەکان، سەرەڕای کوتلەی ڕیفۆرم لە ناو یەکێتیدا، ڕێبەرایەتییان دەکرد.

سەرەڕای کورتی تەمەنی سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی کوردستاندا، بەڵام توانی شێوازێکی نوێی ڕەفتاری پەرلەمانی بە سەر هەمواندا بسەپێنێت و

سامانێکی زۆریش بۆ گەل بگێڕێتەوە. ئەگەر ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە هەرێمدا هەمان ئاستی جەماوەریی خۆی بپارێزێت و هەر بەو شێوەیە هەمەڕەنگ و هەمەدەنگ بێت و یەك ئیدیۆلۆژیا نەکاتە بەرنامەی خۆی، ئەوا دەکرێت ئومێدی داهاتوویەکی باشتری بۆ بخوازرێت، کە لە ڕێیەوە بەشدار بێت لە چەسپاندنی بنەماکانی ئۆپۆزسیۆنی ئاشتییانە و ڕێسا بوونیاتنەرەکانی، کە بە هۆیانەوە ڕێسا دیموکراسییە ڕاستەقینەکان دەچەسپن.

# شیكردنەوەی ئەنجامەكانی هەڵبژاردنی
# ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٠/٣/٧

د. دەریاز محەمەد

## پێشەكی

ڕۆژی ٧ ی ئازاری ٢٠١٠ هەڵبژاردنی گشتی بۆ دەستنیشانكردنی (٣٢٥) كورسیی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ئەنجام درا، كە سێیەم پرۆسەی هەڵبژاردن بوو، لە سەر ئاستی عێراق، پاش ئەوەی لە ٢٠٠٥/١/٣٠ یەكەم هەڵبژاردنی گشتی بۆ كۆمەڵەی نیشتیمانی ئەنجام درا، پاشان لە ٢٠٠٥/١٢/١٥ هەڵبژاردن بۆ یەكەم پەرلەمان، بەناوی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لە سایەی دەستووری هەمیشەییدا، ئەنجامدرا. لە هەر دوو هەڵبژاردنەكەدا ژمارەی كورسییەكان (٢٧٥) كورسی بوو، بەڵام بۆ ئەم هەڵبژاردنە ژمارەی كورسییەكان زیادی كرد بۆ (٣٢٥) كورسی، بەو پێیەی ژمارەی دانیشتوانی عێراق بە (٣٢,٥) ملیۆن كەس ئەژماركرا.

بۆ بەشداریكردن لەم هەڵبژاردنەدا (٢٩٧) قەوارەی سیاسی لە لایەن كۆمیسیۆنەوە تۆماركراون، بۆ كێبركێی سەرجەم كورسییەكانی پەرلەمان بەوانەی كۆتای كەمینەكانیشەوە. پاشان (١٦٤) قەوارە لە چوارچێوەی (١٢) هاوپەیمانیدا كۆبوونەوە، كە یەك هاوپەیمانیان مەسیحی بوو.

شەش هاوپەیمانی سەركەوتنی بە دەست هێنا، لەگەڵ (٣) پارتی سیاسیدا، كە هەرسێكیان لە هەرێمی كوردستاندا بوون.

نەخشەی هەڵبژاردنی ئەمجارە جیاوازییەكی زۆری لەگەڵ ئەوانەی پێشتر هەیە، لە ڕووی هاوپەیمانییەكانی هەر سێ پێكهاتە سەرەكییەكەی عێراق. شیعە بە گشتی دابەش بوون بۆ دوو هێزی سەرەكی، دەوڵەتی یاسا و ئیئتیلافی نیشتیمانی، لە بەرامبەردا زۆربەی باڵەكانی سوننە لە سایەی لیستی عێراقییەدا

یەکیان گرت، کوردیش لەناوخۆیدا دابەش بوو بۆ چوار هێز، بەڵام بە قەبارەی جیاواز.

ئەم ڕاپۆرتە شیکردنەوەیەکە بۆ بەشێك لە لایەنەکانی هەڵبژاردنی خولی دووەم لە ڕووی:

١. سیستەم و یاسای هەڵبژاردن
٢. ڕێژەی بەشداری
٣. هاوکۆڵکەی هەڵبژاردن
٤. دابەشبوونی دەنگ و کورسیی لیستە براوەکان
٥. دە باشترین کاندیدی براوەی هەڵبژاردن

پاشان لە سەر بنەمای زانیاری و داتا و شیکردنەوەکانی بابەتەکە، چەند دەرەنجامێکی گشتی و تایبەت بە لیستی گۆڕان دەخەینەڕوو.

### ١: سیستەم و یاسای هەڵبژاردن:

#### أ. دابەشکردنی کورسیی پارێزگاکان:

هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بە پێی سیستەمی نوێنەرایەتیی ڕێژەیی ئەنجام درا، عێراق دابەش کرا بۆ (١٨) بازنەی هەڵبژاردن، هەر پارێزگایەك بەسنووره کارگێڕییەکەیەوە، بازنەیەکی هەڵبژاردن بوو و، ژمارەیەك کورسی بۆ تەرخان کرابوو، بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان.

هەروەها (٨) کورسیی تەرخان کرا بە سیستەمی (کۆتا) بۆ کەمینەکان، پێنج کورسی بۆ مەسیحییەکان، لە پارێزگاکانی (نەینەوا، دهۆك، هەولێر، کەرکوك و بەغدا) بەڵام عێراق بە یەك بازنەی هەڵبژاردن ئەژمار کرا بۆ ئەو (٥) کورسییەی مەسیحییەکان. هەروەها کورسییەك بۆ هەر یەك لە ئێزیدی و شەبەك

لە پارێزگای نەینەوا، (١) کورسیی بۆ سابیئە لە پارێزگای بەغدا، تەرخان کرا. وەك لەخشتەی ژمارەی (١)دا ڕوون کراوەتەوە.

لە دابەش کردنی کورسییەکانی پارێزگاکان بە ئاشکرا، کەموکوڕی و دەستکاریی پێوە دیار بوو، بەرزکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی عێراق بۆ (٣٢,٥) ملیۆن کەس بۆ خۆی ساختەکاری و هەڵە بوو، چونکە بە هەموو پێوەرە دیمۆگرافییە باوەکانی جیهان، لە باشترین بارودۆخی گەشەکردنی دانیشتواندا، ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی دانیشتوانی وڵاتێك لە (٣,٣٪) تێ ناپەڕێت، بەلام لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٥ – ٢٠٠٩) لە عێراقدا ئەم ڕێژەیە گەیەنرایە زیاتر لە (٤٪)، ئەمە لە کاتێکدایە بارودۆخی ئەو ساڵانە، خوێناویترین ساڵانی مێژووی عێراق بووە. واتە بە لانی کەم، دوو ملیۆن کەس بە زیادە بۆ دانیشتوانی عێراق زیاد کراوە، لە بەرژەوەندیی چەند پارێزگایەکی دیاریکراو[1].

پاشان لە دابەشکردنی کورسییەکان بە سەر پارێزگاکاندا، ناهەقی و دەستکاریی زۆری پێوە دیاربوو، بۆ نموونە پارێزگای بەسرە لە (١٦) کورسییەوە زیادکرا بۆ (٢٤) کورسی، واتە ڕێژەی کورسییەکانی (٣٣,٣٪) زیادی کرد، بەلام پارێزگای سلێمانی لە (١٥)ەوە زیاد کرا بۆ (١٧) کورسی، واتە (١١,٧٪) زیادی کرد، هەروەها پارێزگای نەینەوا بە ڕێژەی (٤١٪) زیادی کرد.

بە گشتی لە بەشی هەرێمی کوردستان کەم کرایەوە بۆ پارێزگاکانی تر، بەلام لە ناوخۆی هەرێمیشدا پارێزگای دهۆك زیاد لە مافی خۆی کورسی بۆ زیاد کرا، لە (٧) ەوە بۆ (١١) کورسی، واتە بە ڕێژەی (٣٦,٣٪) لە کاتێکدا ڕێژەی زیادکردنەکەی پارێزگای هەولێر (١٣,٣٪)و سلێمانی (١١,٧٪)بووە.

---

(1) لە لێدوانێکی بەرپرسی پرۆسەی سەرژمێریی عێراق لە مانگی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠، واتە نزیکەی ساڵێك پاش دەستنیشانکردنی ژمارەی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران، ژمارەی دانیشتوانی عێراقی بە نزیکەی (٢٠) ملیۆن کەس خەملاند، لە سەر بنەمای پرۆسەی ژماردن و گەماروسازی، کە بۆ سەرژمێری سازکرا بوو، بە پێی پێوەرە ئامارییەکان ئەو ژمارەیە لە هەموو ژمارەکانی دیکە ڕاستترە، یان لە ڕاستییەوە نزیکە، چونکە ماڵ بە ماڵ کۆکراوەتەوە.

خشتەی ژمارە (١)

چۆنێتیی دابەشکردنی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (٢٠١٠)

بە پێی پارێزگا و (کۆتا)ی کەمینەکان

| پارێزگا | کورسیی گشتی | کورسیی پێکهاتەکان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| دهۆک | ١٠ | (١) بۆ مەسیحییەکان | ١١ |
| هەولێر | ١٤ | (١) بۆ مەسیحییەکان | ١٥ |
| سلێمانی | ١٧ | – | ١٧ |
| نەینەوا | ٣١ | (٣) یەک کورسی بۆ هەر یەک لە مەسیحی، ئێزیدی و شەبەک | ٣٤ |
| کەرکووک | ١٢ | (١) بۆ مەسیحییەکان | ١٣ |
| سەلاحەدین | ١٢ | – | ١٢ |
| دیالە | ١٣ | – | ١٣ |
| ئەنبار | ١٤ | – | ١٤ |
| بەغدا | ٦٨ | (٢) یەک بۆ مەسیحییەکان و یەک بۆ سابیئە | ٧٠ |
| واست | ١١ | – | ١١ |
| بابل | ١٦ | – | ١٦ |
| کەربەلا | ١٠ | – | ١٠ |
| نەجەف | ١٢ | – | ١٢ |
| قادسیە | ١١ | – | ١١ |
| موسەننا | ٧ | – | ٧ |
| زیقار | ١٨ | – | ١٨ |
| میسان | ١٠ | – | ١٠ |
| بەسرە | ٢٤ | – | ٢٤ |
| کۆی گشتی | ٣١٠ | ٨ | ٣١٨ |
| (٣١٠) پارێزگاکان + (٨) پێکهاتەکان + (٧) قەرەبوو = ٣٢٥ کۆی گشتی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران | | | |

سەرچاوە: توێژەر لە ڕێگەی هەمواری یەکەمی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران و داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

ئەم دیاردەیە لە ئەدەبیاتی هەڵبژاردندا پێی دەوترێت (مالاپۆرشنمێنت – malapportionment) واتە نادادپەروەریی لە دابەشکردنی کورسیی پەرلەمان بە سەر بازنەکانی هەڵبژاردندا، بە جۆرێك لە جۆرەکانی ساختەکاریی هەڵبژاردن لە قەڵەم دەدرێت. ئەم حاڵەتە لە هەڵبژاردنی خولی پێشووی پەرلەمانیشدا ئەنجام درا، کاتێك کە لە دەستووردا هەر (١٠٠) هەزار کەس کورسییەکی پەرلەمانی بۆ دیاری کراوە، بەڵام کۆمیسیۆن ژمارەی دەنگدەری کردبووە بنەمای دابەشکردنی کورسییەکان. ئەوە بوو چەند ئەندامێکی پەرلەمان لە سەر پارێزگای نەینەوا، لە دادگای باڵای فیدراڵی داوایان تۆمار کرد لە سەر ئەم کەیسە، لە ئەنجامدا حوکمی دادگا لە بەرژەوەندیی داواکاران بوو.

ب. **کورسیی قەرەبوو:**

لەسەر ئاستی عێراق (٧) کورسی هێڵرایەوە بە ناوی (کورسیی قەرەبوو)، بەڵام لە بنەڕەتدا وەکو بەخشش دابەش کرا نەك قەرەبوو، چونکە بە پێی یاسای هەڵبژاردنەکە لیستە براوەکان (گەورەکان) بە پێی ڕیزبەندی ڕێژەی دەنگەکانیان سوودیان لێ بینی، نەك قەرەبووی لایەنێکی سیاسیی زەرەرمەندی پێ بکرێتەوە.

لە خولی پێشووی هەڵبژاردنی پەرلەماندا کورسیی قەرەبوو بۆ ئەو قەوارانە تەرخان کرا، کە لە ئاستی پارێزگاکان هیچ کورسییەك نابەنەوە، بەڵام بە کۆکردنەوەی دەنگەکانیان لە ئاستی عێراق بە گشتی و پاش دەرهێنانی تێکڕای نیشتیمانیی بەهای کورسی، توانیبێتیان بەشی کورسییەك یان زیاتر دەنگ بە دەست بهێنن، بەڵام لەم خولەدا کورسییەکان تەرخان کرا بۆ قەوارە براوەکان، بە پێی ڕێژەی دەنگەکانیان لە ئاستی عێراق. ئەم کارە بۆ خۆی هەڵەیەکی دەستووری و دیموکراتی گەورەیە، کاتێك بە پێی بەندی یاسایی کورسی دەدرێت بە قەوارەیەك، لە کاتێکدا ئەو قەوارەیە سوودی لە دەنگەکانی خۆی وەرگرتووە

له پارێزگاکاندا، واته ڕاستتر و دیموکراتیتر ئەوە بوو ئەم کورسییانە بە سەر پارێزگاکاندا دابەش بکرێن، نەك بە سەر قەوارە براوە یەکەمەکاندا.

ئەم حاڵەتە لەگەڵ بنەمەکانی دەستووریشدا دژوارە، چونکە ئەو قەوارانەی سوودمەندبوون لەو حەوت کورسییە، دوو جار سوودیان لە دەنگەکانیان بینیوە، جارێك بۆ کورسیی پارێزگا و جارێك بۆ کورسیی قەرەبوو. پاشان نایەکسانی لە نێوان پارێزگاکاندا دروست دەکات، ئایا ئەو حەوت کورسییە بۆ پاڵێوراوی چ پارێزگایەك بووە؟ بۆ نموونە لەوانەیە دووانیان پاڵێوراوی یەك پارێزگا بن، کەواتە ئەو پارێزگایە زیاد لە مافی خۆی کورسیی بەرکەوتووە، کە ئەمەیش دژی ئەو بەندە دەستوورییەیەکە دەڵێت بۆ هەر سەد هەزار کەس کورسییەکی پەرلەمان تەرخان دەکرێت و هەروەها دژی ئەو بەندە یاساییەیە کە عێراقی دابەش کردووە بۆ (١٨) بازنەی هەڵبژاردن.

ج. **شێوازی دابەشکردنی کورسییەکان**

لە خولی پێشووی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەراندا، شێوازی مایەوەی گەورە (الباقي الاقوى) بۆ دابەشکردنی کورسیی پارێزگاکان، پەیڕەو کرا، بەڵام لەم هەڵبژاردنەدا شێوازی براوەی گەورە (الفائز الاكبر) پەیڕەو کرا. ئەم شێوازەیش بەم شێوەیەیە، پاش دەرهێنانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن (القاسم الانتخابي)، دەنگەکانی هەر لیستێك نەگەیشتبێتە ئاستی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن، دوور دەخرێتەوە لە دابەشکردنی کورسی و، بە دۆڕاو ئەژمار دەکرێت، دواتر هەر کورسییەکیش کە دەمێنێتەوە، پاش دابەشکردنی دەنگی لیستە براوەکان بە سەر هاوکۆلکەی هەڵبژاردندا، بە لیستی براوەی یەکەم دەدرێت، نەك ئەو لیستەی زۆرینەی دەنگەکانی ماوەتەوە و سوودی لێ وەرنەگرتووە.

بۆ نموونە پارێزگایەك (١١) كورسی هەیە، هاوكۆڵكەی هەڵبژاردن (بەهای كورسییەك) لە پارێزگاكەدا (٤٠٤٥٠) دەنگە، سێ لیست توانیویانە ئاستی هاوكۆلكە تێپەڕێنن:

لیستی یەكەم (٢٠٢٣٢٣) دەنگی بە دەست هێناوە، (٥) كورسیی بردووەتەوە و تەنها (٧٣) دەنگی ماوەتەوە.

لیستی دووەم (١٢٥٥٦٧) دەنگی بە دەست هێناوە، (٣) كورسیی بردووەتەوە و (٤٢١٧) دەنگی ماوەتەوە.

لیستی سێیەم (٨٠١٨٧) دەنگی بە دەست هێناوە، (١) كورسیی بە دەست هێناوە و (٣٩٧٣٧) دەنگی ماوەتەوە.

لێرەدا (٨) كورسی دابەشكراوە و (٢) كورسیی بەتاڵ ماوەتەوە، بەپێی یاساكە لیستی یەكەم، كە تەنها (٧٣) دەنگی ماوەتەوە كورسییەكیان دەبات، و لیستی دووەم كە تەنها (٤٢١٧) دەنگیَ ماوەتەوە، كورسییەكەی تریان دەبات، بەڵام لیستی سێیەم كە (٣٩٧٣٧) دەنگی ماوەتەوە، هیچ كام لەو دوو كورسییە ناباتەوە.

لەبارەی ئەم حاڵەتەوە، هەر یەك لە (مفيد الجزائري لە حیزبی شیوعیی عێراق و عومەر عەلی حسێن لە یەكگرتووی ئیسلامیی كوردستان) داوایان لە سەر سەرۆكی ئەو كاتەی ئەنجومەنی نوێنەران (ئەیاد سامەرائی) لە دادگای باڵای فیدراڵی تۆمار كردووە، لە ئەنجامدا بڕیاری دادگا لە بەرژەوەندیی داواكارەكان بوو، بەوەی لە مادەی (٣/چوارەم) لە یاسای ژمارە (٢٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ (یاسای هەمواری یاسای هەڵبژاردنی ژمارە (١٦)ی ساڵی (٢٠٠٥) كە تایبەتە بە چۆنێتیی دابەشكردنی كورسییە شاغرەكان (بەتاڵەكان)، لەگەڵ ناوەڕۆكی مادەی (٢٠) و مادەی (٣٨/ یەكەم)ی دەستووری هەمیشەییدا دژوارە و یەك ناگرێتەوە، بۆیە دادگا بڕیاری داوە، كە ئەو مادەیە لە یاسای هەڵبژاردن دەستووری نییە، بەڵام بۆ

هەڵبژاردنی ساڵی ۲۰۱۰ دادگا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی بە ئەندامبوونی ئەو کەسانە نەدا، کە بە گوێرەی ئەم بەندە نادەستوورییە بوون بە ئەندامی پەرلەمان[1]. بۆ نموونە لە پارێزگای سلێمانی بەڕێز (د. مەحمود عوسمان) لە لیستی هاوپەیمانیی کوردستان (پارتی) لەبری بەڕێز (یاسین حەسەن محەمەد) لە لیستی کۆمەڵی ئیسلامی بووە بە ئەندامی پەرلەمان. لەگەڵ دەیان نموونەی دیکەی ئەم حاڵەتە، کە لە زۆربەی پارێزگاکاندا ڕووی داوە.

ئەم بڕیارەی دادگای فیدراڵی لە لایەکەوە ئەوە دەسەلمێنێت، کە کار بە بنەماکانی دەستوور نەکراوە لە داڕشتنی یاساکاندا، لە لایەکی ترەوە، بێهێزیی دەسەلاتی دادوەری دەردەخات، کە چۆن ڕێگە دەدات لە دەرەوەی بەندە دەستوورییەکان، پرۆسەیەکی پڕ بایەخ و هەستیاری وەکو هەڵبژاردن و چۆنێتیی دابەشکردنی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بەڕێوە بچێت.

ئەگەر هاوشێوەی خولی پێشووی هەڵبژاردن، کار بە شێوازی مایەوەی گەورە (الباقي الاقوى) بکرایە، ئەنجامی هەڵبژاردنەکە زۆر جیاوازتر دەبوو لەوەی ئێستا، وەك لەخشتەی (۲) دا ڕوون کراوەتە. گرینگترین جیاوازییەکانیش ئەمانەن:

١. لیستی دەوڵەتی یاسا بە جیاوازیی کورسییەك پێش لیستی عێراقییە دەکەوت. واتە (۸۵) بە (۸٤) کورسی دەبوو.

٢. چوار هاوپەیمانییە براوە گەورەکە، بە ژمارەی جیاواز کورسییان لەوەی ئێستا کەمتر دەبردەوە، عێراقیە (۷) کورسی، دەوڵەتی یاسا (٤) کورسی، ئیئتیلافی نیشتیمانی (٦) کورسی و هاوپەیمانیی کوردستان (۲) کورسی لەوەی ئێستا کەمتریان بەردەکەوت.

---

(1)کۆماری عێراق، دادگای باڵای ئیتیحادی، بڕیاری ۱۲/ ئیتیحادی لە ۲۰۱۰/٦/۱۷.

٣. لە بەرامبەردا هاوپەیمانی و پارتەکانی دیکە کورسیی زیاتریان بەردەکەوت، یەکێتیی عێراق (٧) کورسی، تەوافوق (٣) کورسی، گۆڕان (٢) کورسی، لەوەی ئێستا زیاتریان بەردەکەوت، هەریەکە لە کۆمەڵ و یەکگرتوویش کورسییەك زیاتریان بەردەکەوت.

٤. پێنج لیستی دیکە سەردەکەوتن، هەر یەکەیان کورسییەکی ئەنجومەنی نوێنەرانیان دەبردەوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٢).

٥. بە گشتی پەیڕەوکردنی ئەم شێوازی دابەشکردنە لە بەرژەوەندیی کورد دەبوو، چونکە:

أ. ژمارەی کورسییەکانی سێ هاوپەیمانییە گەورەکە (١٧) کورسی کەمی دەکرد، لە بەرامبەردا هەموو لیستە کوردستانییەکان (٢) کورسیی زیاتریان دەبردەوە و، لە (٥٧) کورسییەوە دەبوو بە (٥٩) کورسی.

ب. لە پارێزگای کەرکووك (٧) کورسی بۆ کورد و (٥) کورسی بۆ عەرەب دەبوو، نەك (٦) بە (٦).

ج. لە هەر یەك لە پارێزگاکانی بەغدا و سەلاحەدین، کورد دەبوو بە خاوەنی کورسییەك، واتە لەڕووی جوگرافییەوە نوێنەرایەتیی کورد لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق فراوانتر دەبوو، بە تایبەت لە ناوچە جێناکۆکەکان سەنگی نوێنەرایەتیی کورد لەوەی ئێستا زیاتر دەبوو.

خشتەی (٢)

شێوازی دابەشکردنی کورسییەکان بە پێی دەرکردنی ماوەی گەورە (الباقي الاكبر)

| پارێزگا | عێراقیە | دەوڵەتی یاسا | ئیئتیلافی نیشتیمانی | هاوپەیمانی کوردستان | گۆڕان | تەوافق | یەکێتیی عێراق | یەکگرتوو | کۆمەڵ | اتحاد الشعب | میسالئالوسی | تحالف الوحدة الوطنية | ائتلاف العمل والانقاذ الوطني الحر | الجبهة القومية والوطنية الوحدة | کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەغدا | ٢٣ | ٢٤ | ١٠ | ١ | - | ٢ | ١ | - | - | ١ | ١ | | | | ٦٨ |
| نەینەوا | ١٠ | ١ | ١ | ٧ | ٠ | ٢ | ٢ | ٠ | ٠ | | | | | | ٣١ |
| بەسرە | ٢ | ١٣ | ٧ | - | - | ١ | ١ | - | - | | | | | | ٢٤ |
| زیقار | ١ | ٨ | ٨ | - | - | - | ١ | - | - | | | | | | ١٨ |
| بابل | ٣ | ٧ | ٥ | - | - | ٠ | ١ | - | - | | | | | | ١٦ |
| ئەنبار | ٩ | ٠ | ٠ | - | - | ٢ | ٢ | - | - | | | ١ | | | ١٤ |
| واست | ٢ | ٤ | ٤ | - | - | - | ١ | - | - | | | | | | ١١ |
| قادسیە | ٢ | ٤ | ٤ | - | - | - | ٠ | - | - | | | | ١ | | ١١ |
| کەربەلا | ١ | ٦ | ٢ | - | - | - | | - | - | | | | | | ١٠ |
| نەجەف | ١ | ٦ | ٥ | - | - | - | ٠ | - | - | | | | | | ١٢ |
| موسەننا | ١ | ٣ | ٢ | - | - | ٠ | ١ | - | - | | | | | | ٧ |
| میسان | ١ | ٤ | ٥ | - | - | - | ٠ | - | - | | | | | | ١٠ |
| سەلاحەدین | ٦ | ١ | ١ | ١ | ٠ | ١ | ١ | - | - | | | | | ١ | ١٢ |
| دیالە | ٧ | ٢ | ٢ | ١ | ٠ | ١ | ٠ | ٠ | - | | | | | | ١٣ |
| کەرکووک | ٥ | ٠ | ٠ | ٥ | ١ | ٠ | - | ١ | ٠ | | | | | | ١٢ |
| سلێمانی | - | - | ٠ | ٧ | ٦ | - | - | ٢ | ٢ | | | | | | ١٧ |
| هەولێر | - | - | ٠ | ١٠ | ٢ | - | - | ١ | ١ | | | | | | ١٤ |
| دهۆک | - | - | ٠ | ٨ | ١ | - | - | ١ | ٠ | | | | | | ١٠ |
| کۆی گشتی | ٢+٨٢ | ٢+٨٣ | ٢+٦٢ | ١+٤٠ | ١٠ | ٩ | ١١ | ٥ | ٣ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ٣١٧ |

لەسەر ئاستی ململانێی سیاسی لە هەرێمی کوردستان، بالآنسی هێز کەمێك بە لای بەرەی ئۆپۆزسیۆندا دەشکایەوە، بەوەی دەبوونە خاوەنی (١٨) کورسی، بەرامبەر بە (٤١) کورسی بۆ یەکێتی و پارتی، هەروەها هەژموونی پارتی بەرامبەر بە حیزبەکانی تر کەمتر دەبوو، چونکە ئەو کات پارتی دیموکراتی کوردستان سێ کورسیی لە ئێستا کەمتری دەبردەوە و، بەراورد بە یەکێتی (١٥) بە (٢٦) کورسی دەبوو، نەك وەك ئەوەی ئێستا، کە (١٣ بە ٣٠)کورسییە.

بەڕادەی زۆریش لە بەرژەوەندیی بزووتنەوە گۆڕان دەبوو، چونکە لە هەر یەك لە کەرکووك و دهۆك دەبوو بە خاوەنی نوێنەرایەتی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا و، لە هەر یەکەیان کورسییەکی دەبردەوە، لە ڕووی چۆنێتیی دابەشبوونی هێزی جەماوەریی بزووتنەوەی گۆڕانەوە، کاریگەریی باش و ئەرێنی دەبوو بۆ ئاییندەی ئەو بزووتنەوەیە.

لە لایەکی ترەوە، لە سیستەمی نوێنەرایەتیی ڕێژەییدا، لە چەندین وڵاتدا، نموونەی ئیسرائیل و هۆڵەندا، وا باوە هەموو وڵات یەك بازنەی هەڵبژاردن بێت، بۆ ئەوەی دەنگی هیچ لایەنێکی سیاسی لە بازنە جیاجیاکانی هەڵبژاردندا نەفەوتێت و بەفیڕۆ نەچێت، وەك چۆن لە یەکەم هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتیمانیی عێراق لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ پەیڕەو کرا، بەڵام بۆ دووەم هەڵبژاردن کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ و بۆ ئەم هەڵبژاردنەیش، عێراق دابەش کرا بۆ (١٨) بازنە، بۆیە بەشێکی زۆر لە لایەنەکان، بە تایبەت لایەنە کوردستانییەکان و لیستە بچووکەکانی عێراق، لەم سیستەمە نوێیە زەرەرمەند بوون، بە گوێرەی ڕێژەی دەنگەکانیان لە ئاستی عێراق و، مافی خۆیان لە نوێنەرایەتیی ئەنجومەنی نوێنەران وەرنەگرت.

وەك لە خشتەی ژمارە (٣)دا ڕوون کراوەتەوە، ئەگەر هەموو عێراق یەك بازنەی هەڵبژاردن بوایە، پێنج لیست (قەوارە)ی دیکە، لە سەر ئاستی عێراق سەر دەکەوتن، هەروەها سێ لیستی براوەی یەکەم، هەر یەکەیان (١٢) کورسیی لەوەی ئێستایان کەمتریان بەر دەکەوت، لە بەرامبەردا لیستەکانی دیکە، کە بە پلەی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم هاتوون، بە ڕێژەی جیاجیا کورسیی زیاتریان بەر دەکەوت لەوەی ئێستا، بۆ نموونە گۆڕان (٦) کورسی لەوەی ئێستا

زیاتری بەر دەكەوت، هاوپەیمانیی كوردستان (٤) كورسی، یەكگرتوو (٣) كورسی و كۆمەڵ (٣) كورسی لەوەی ئێستا زیاتریان بەر دەكەوت، بەڵام لەنێو هەموو لیستەكاندا زەرەرمەندی گەورە لیستی گۆڕان بوو، چونكە لە هەموو لایەنەكانی دیكە كورسیی زیاتری فەوتاوە بە پێی ئەم یاسایە.

**خشتەی (٣)**

**جیاوازیی نێوان كورسیی لیستە براوەكان ئەگەر عێراق یەك بازنەی هەڵبژاردن بوایە لە هەڵبژاردنی (٢٠١٠)[1]**

(1) ئەم خشتەیە لە سەر ئەو بنەمایە دروست كراوە، كە ئەگەر عێراق یەك بازنەی هەڵبژاردن بوایە، هاوكۆڵكەی هەڵبژاردن (٣٦٣٦١) دەنگ دەبوو. بە جێبەجێكردنی هاوكۆڵكەی هەڵبژاردن، وەك لە خانەی چوارەمی خشتەكەدا جێبەجێ كراوە، بێجگە لە لیستە براوەكانی ئێستا، پێنج لیستی دیكە كورسییان دەبردەوە. هەروەها بە پێی ماوەی گەورە (باقي الاقوى) دەنگە مایەوەكانی هەر فەوارەیەك دەبێت بە كورسی. پاش جێبەجێكردنی هاوكۆڵكەی هەڵبژاردن ٦ كورسیی بەتاڵ (شاغر) دەمێنێتەوە، ئەگەر بە ڕێژەی سەدی دەنگی لیستە براوەكان دابەش بكرێت، وەك چۆن لە سەر ئاستی پارێزگاكان، لەم هەڵبژاردنەدا پراكتیزە كرا، ئەوا هەریەك لە سێ لیستە گەورەكە (٢) كورسییان بەردەكەوێت، بەڵام ئەوە ماوەتەوە بۆ چۆنێتیی داڕشتنی یاسای دابەشكردنی كورسییەكان، ئایە ئەو لیستانەی ئاستی دەنگەكانیان نەگەیشتووەتە هاوكۆڵكەی هەڵبژاردن كورسی دەبەنەوە، وەك ئەوەی لە هەرێمی كوردستان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی (٢٠٠٩) جێبەجێ كرا. بێگومان ئەوكات شەش لیستی دیكە كورسی دەبەنەوە، هەر یەكەیان بە كورسییەك دەچنە ئەنجومەنی نوێنەرانەوە.

| | سیستەمی فرەبازنەیی و پەیڕەوکردنی شێوازی براوەی گەورە لە دابەشکردنی کورسییەکان (ئەوەی جێبەجێ کرا) | | | دابەشکردنی کورسی بە سیستەمی ئەگەر عێراق یەك بازنە بوایە | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ز | لیستی بەشدار بوو | ژمارەی دەنگ | کورسیی ئێستا | جێبەجێکردنی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کۆی کورسی | جیاوازی لە ژمارەی کورسی |
| ١ | عێراقیيه | ٢٨٥١٨٢٣ | ٩١ | ٧٨,٤٣ | ٧٩ | – ١٢ |
| ٢ | دەوڵەتی یاسا | ٢٧٩٧٦٢٣ | ٨٩ | ٧٦,٩٤ | ٧٧ | – ١٢ |
| ٣ | هاوپەندیی نیشتیمانیی عێراق | ٢٠٩٥٣٣٦ | ٧٠ | ٥٧,٦٢ | ٥٨ | – ١٢ |
| ٤ | هاوپەیمانیی کوردستان | ١٦٨٦٥٤٤ | ٤٣ | ٤٦,٣٨ | ٤٧ | + ٤ |
| ٥ | گۆڕان | ٤٨٧١٨١ | ٨ | ١٣,٣٩ | ١٤ | + ٦ |
| ٦ | تەوافوق | ٣٠٣٤٥٠ | ٦ | ٨,٢٤ | ٩ | + ٣ |
| ٧ | ئینتیلافی یەکێتیی عێراق | ٣١٤٨٢٣ | ٤ | ٨,٦٥ | ٩ | + ٥ |
| ٨ | یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان | ٢٤٧٣٦٦ | ٤ | ٦,٨٠ | ٧ | + ٣ |
| ٩ | کۆمەڵی ئیسلامی لە کوردستان | ١٥٣٤٦٠ | ٢ | ٤,٢٢ | ٥ | + ٣ |
| ١٠ | تحالف الوحدة الوطنية | ٨١٨٥٥ | سفر | ٢,٢٥ | ٣ | + ٣ |
| ١١ | جبهة العمل والانقاذ الوطني الحر | ٦٦٠٧٦ | سفر | ١,٨١ | ٢ | + ٢ |
| ١٢ | اتحاد الشعب | ٦٥٣٤٦ | سفر | ١,٧٩ | ٢ | + ٢ |
| ١٣ | قائمة مثال الالوسي للامة العراقية | ٥٢٥٢٥ | سفر | ١,٤٧ | ٢ | + ٢ |
| ١٤ | احرار | ٤٨١٥٣ | سفر | ١,٣٢ | ٢ | + ٢ |
| | کۆی گشتی | ١١٢٥٢٥٦١ | ٣١٧ | ٣١١ | ٣١٧ | |

سەرچاوە : ئامادەکردنی توێژەر لە ڕێگەی داتاکانی کۆمیسیۆنی بالای هەڵبژاردنەوە.

ئەگەر لە عێراقدا سیستەمی پەیڕەو کراوی هەڵبژاردن، نوێنەرایەتیی ڕێژەیی (التمثيل النسبي) بێت، پێویستە چارەسەرێکی یاسایی بۆ ئەم ناهاوسەنگییە

بدۆزرێتەوە، کە لە بەرژەوەندیی هەموو پارت و هاوپەیمانییەکان بێت و، هیچ هاوپەیمانییەك زیاد لە دەنگەکانی خۆی کورسی نەباتەوە.

بە ڕای ئێمە، باشترین چارەسەر ئەوەیە ڕێژەیەك (بۆ نموونە چواریەك یان پێنجیەك)ی کورسییەکان بهێڵرێتەوە و بە سەر پارێزگاکاندا دابەش نەکرێت، پاشان بەو ڕێژەیە هاوسەنگیی دابەشبوونی کورسییەکانی پەرلەمان دروست بکرێت، بەو شێوەیەی ئەگەر عێراق یەك بازنە بوایە ئەو لیستە چەند کورسی بەردەکەوت و، ئێستا چەندی بەرکەوتووە، ئەو جیاوازییەی بۆ قەرەبوو بکرێتەوە.

بە واتایەکی تر پێویستە کورسیی قەرەبوو زیاد بکرێت و بدرێت بەو لیستانەی، کە لە ئەنجامی فرەبازنەیی، مافی خۆیان بە گوێرەی ڕێژەی دەنگەکانیان لە ئاستی عێراق وەر نەگرتووە. بەڵام چۆن هێزە گەورەکانی نێو گۆڕەپانی سیاسیی عێراق، قەناعەت بەم شێوازی دابەشکردنەی کورسییەکان دەکەن؟! لە کاتێکدا خۆیان لێی زەرەرمەند دەبن، بە تایبەت سێ هاوپەیمانییە گەورەکەی ئێستا (دەوڵەتی یاسا، ئیئتیلافی نیشتیمانی و لیستی عێراقییە) کە بەم شێوازەی ئێستای یاساکە، بە تەواوی سوودمەندبوون.

پێویستە لیستە زەرەرمەندەکان، لە قۆناغی یەکەمدا، ئەم حاڵەتە بۆ ئەو لیستانەی ڕوون بکەنەوە، کە زەرەمەند بوون لە یاساکە، پاشان گفتوگۆ لەگەڵ لایەنەکانی دیکە بکەن، بۆ ئەوەی لە هەر هەموارێکی یاساکەدا، بڕیاری مەبدەئی چارەسەرکردنی کەموکوڕییەکان بدرێت، ئەو زیانە لە بەر چاو بگیرێت و لە ئاییندەدا چارەسەر بکرێت، بە تایبەت پاش ئەوەی دادگای فیدراڵی، بڕیاری نادەستووریبوونی شێوازی دابەشکردنی کورسییەکانی، دەرکردووە.

ئەگەر ئەم شێوازەی ئێستای یاساکە بمێنێتەوە، بۆ خولەکانی داهاتووی هەڵبژاردن، تا دێت هێز و هاوپەیمانییە بچووکەکان بچوکتر دەبنەوە و

هاوپەیمانییە گەورەکانیش گەورەتر دەبن، لە سەر حسابی هێزە بچووکەکان، چونکە شێوازی دابەشکردنی کورسییەکان لە بەرژەوەندیی بەهێزەکان داڕێژراوە، نەك لە سەر بنەمای سەنگی دەنگی دەنگدەران.

**٢: ڕێژەی بەشداری:**

ڕێژەی بەشداریی دەنگدەران لە هەر هەڵبژاردنێکدا فاکتەرێکی گرینگ و پایەیەکی بەهێزی هەڵبژاردنەکەیە، بێگومان تاوەکو ڕێژەی بەشداری بەرزبێت، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ تێکەڵبوونی کۆمەڵگە بە پرۆسە و ڕووداوە سیاسییەکان، لە هەمان کاتدا ئاماژەیەکە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی متمانەی هاوڵاتییان بە هەڵبژاردنەکە و ڕۆڵی لە ژیانی هاوڵاتییاندا.

لەم هەڵبژاردنەدا ڕێژەی بەشداری لە سەر ئاستی عێراق گەیشتە نزیکەی (٦١,٠٪) بە دەنگدەرانی دەرەوەی عێراق و دەنگدانی تایبەتیشەوە، بە گشتی ئەم ڕێژەیە دەچێتە ڕیزی ڕێژە بەرزەکانەوە، هەرچەندە ئەوەی لە عێراقدا ڕێژەکەی بەرزکردووەتەوە، ململانێی مەزهەبی و نەتەوەییە، نەك ئاست و ڕادەی تێکەڵبوونی هاوڵاتییان بە پرۆسەی سیاسی.

لە خشتەی ژمارە (٤)دا، کە ڕێژەی بەشداریی هەڵبژاردن، بە پێی پارێزگاکان ڕوون دەکاتەوە، چوار ئاستی جیاوازیی بەشداری دەرکەوتووە:

١. **ئاستی بەشداریی بەرز:** کە ڕێژەی بەشداری لە سەروو (٧٠٪) بووە، پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان دەگرێتەوە، لەگەڵ هەر دوو پارێزگای کەرکووك و سەلاحەددین. بەرزترین ڕێژە لە ئاستی عێراق لە پارێزگای سلێمانیدا بووە (٧٥,٩٪)، پاشان هەر یەك لە هەولێر (٧٤,١٪)، دهۆك (٧٤٪)، کەرکووك (٧٠,٦٪) و، سەلاحەددین (٧٠,١٪) دێن. ململانێی سەختی نێوان پارتەکانی کوردستان لە هەرێم و باشیی ئاستی ئارامی و ئاسایش و هۆشیاری دەنگدەری کورد، بۆ پێویستیی بەشداریی سیاسیی لە ئاستی عێراق، وەکو بەشێك لەو

ململانیٚ نەتەوەییەی، نزیکەی سەدەیەکە، لە نێوان کورد و عەرەبدا لە ئارادایە، هاوکات لەگەڵ ئەنجامدانی هەندێك ساختەکاری لە بەشێك لە ناوچەکانی هەرێم، هۆکاری سەرەکیی بەرزیی ڕێژەی بەشدارییە لە هەرێم، بەڵام ململانێی نێوان هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی کەرکوك و پێکهاتەکانی (عەرەب بە شیعە و سوننەوە، تورکمان و کورد) لە سەلاحەدین، هاوکات لەگەڵ ئەنجامدانی ساختەکاری لە لایەن کورد و عەربەوە، هەر یەك لە ناوچەی خۆی وەکو بەشێك لە ململانێی نەتەوەیی، هۆکاری سەرەکی بوون بۆ بەرزیی ڕێژەی بەشداریی ئەم دوو پارێزگایە.

٢. **ئاستی بەشداریی مامناوەند:** چوار پارێزگا دەگرێتەوە، کە بریتییە لە نەینەوا، بابل، قادسیە و موسەنا، ڕێژەی بەشداری لە نێوان (٦٠,٢٣٪) لە پارێزگای قادسیە و (٦١,٩٤٪) لە پارێزگای نەینەوا، بە گشتی ئەم ڕێژەیە زۆر نزیکە لە ناوەندی گشتیی ڕێژەی بەشداریی عێراق کە (٦٠,٩٨٪) بوو.

٣. **ئاستی بەشداریی نزم:** کە لە ناوەندی ڕێژەی بەشداریی عێراق بە گشتی کەمتر بووە، هەشت پارێزگای باشوور و ناوەڕاستی عێراق دەگرێتەوە، (بەغدا، بەسرە، زیقار، نەجەف، کەربەلا، واست، ئەنبار و دیالە) ڕێژەی بەشدارییان لە نێوان (٥٩,٨٥٪) بووە لە پارێزگای دیالە، (٥٥,٢٦٪) لە پارێزگای بەغدا.

٤. **ئاستی بەشداریی زۆر نزم:** پارێزگای میسان دەگرێتەوە لە باشووری عێراق، کە ڕێژەی بەشداریی نزمترین ئاست بووە و دابەزیوە بۆ (٤٨,٥٦٪).

بە گشتی لەم هەڵبژاردنەدا سوننەی عەرەب بە چڕی بەشداریی کرد، بەراورد بە هەموو هەڵبژاردنەکانی پێشوو، لەبەرئەوەی بەشی زۆری ئەم پێکهاتەیە، بە پارتە سیاسییەکان و خەڵکەوە، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی لە ڕێگەی سندووقەکانی دەنگدانەوە، سەر لە نوێ بێنە نێو گۆڕەپانی حوکم لە عێراق، بە تایبەت پاش ئەوەی بەشە بەرهەڵستکارەکەی پرۆسەی سیاسی لەنێو ناوەندی

سوننەدا، نەیانتوانی لە ڕێگەی توندوتیژیی، تیرۆر، تەقینەوە و دژایەتیکردنی هەموو کاروبارێکی سیاسیی لە عێراق سەرکەوتووبن لە تێکدانی بارودۆخی وڵات لە بەرژەوەندیی خۆیان و، گەیشتنە ئەو قەناعەتە، کە بەشداریی سیاسی لە ڕێگەی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە، لەوێیشەوە گرتنە دەستی حوکمی عێراق، باشترین چارەسەرە بۆ گرتنەدەستی جومگەکانی دەسەڵات.

**٣: هاوکۆلکەی هەڵبژاردن:**

هاوکۆلکەی هەڵبژاردن بریتییە لە دابەشکردنی کۆی دەنگە ڕاستەکانی بازنەیەکی هەڵبژاردن (پارێزگایەك) لە سەر ژمارەی کورسییە گشتییەکانی ئەو پارێزگایە، لە ئەنجامدا ئەگەر ژمارەی دەنگەکانی هەر لیستێکی بەشداربوو هاوکۆلکەی هەڵبژاردنی تێ نەپەڕاند، بە پێی هەمواری یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران (٢٠٠٩)، دوور دەخرێتەوە لە دابەشکردنی کورسییەکان و بە دۆڕاو ئەژمار دەکرێت، تەنانەت ئەگەر بە جیاوازیی یەك دەنگیش بێت. لەم هەڵبژاردنەدا دەیان قەوارەی سیاسی و چەندین هاوپەیمانی لە هیچ پارێزگایەك نەیانتوانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن ببەزێنن، بەڵام هاوکۆلکەکە، لە نێوان پارێزگاکاندا جیاوازیی زۆر گەورەی تێدایە، بە شێوەیەك لە هەندێك پارێزگادا ژمارەکە نزیکە لە نیوەی ژمارەی هاوکۆلکەکە لە پارێزگایەکی دیکە. بە گشتی پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان و پارێزگای کەرکوك، هاوکۆلکەی هەڵبژاردنیان زۆر بەرزبوو، لە سەرووی (٤٢) هەزار دەنگەوە بوو، بەڵام لە سەرجەم پارێزگاکانی دیکەدا، لە خوار (٤٠) هەزار دەنگەوە بوو، تەنانەت لە (١٠) پارێزگادا هاوکۆلکەی هەڵبژاردن کەمتر بوو لە (٣٥) هەزار دەنگ.

بەرزترین هاوکۆلکەی هەڵبژاردن لە پارێزگای سلێمانیدا بوو، کە گەیشتە (٤٩٠٣٧) دەنگ، نزمترینشیان لە پارێزگای میساندا بوو، کە دابەزیوە بۆ

(٢٧٢٨١). لێرەدا دوو فاکتەری سەرەکی کار لە بەرز و نزمیی ژمارەی دەنگەکانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن دەکەن:

یەکەمیان: تاوەکو ڕێژەی بەشداری بەرز بێت، هاوکۆلکەکە بەرز دەبێتەوە، ئەو دوو پارێزگایەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد، لە هەمان کاتدا دوو بەرزترین و نزمترین ئاستی بەشدارییان تۆمار کردووە.

دووەمیان: بەشی پارێزگاکەیە لە تەرخانکردنی کورسیی ئەنجومەنی نوێنەران، واتە ئەگەر پارێزگایەك لە ئاستی پێویست و مافی خۆی کورسیی بۆ تەرخان نەکرێت، هاوکۆلکەکەی بەرزدەبێتەوە، لە بەرامبەردا ئەگەر زیاد لە مافی خۆی کورسیی بۆ تەرخان بکرێت، هاوکۆلکەی هەڵبژاردنەکەی دادەبەزێت. وەك چۆن لە تەرخانکردنی کورسییەکاندا، ناهەقی بەرامبەر بە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان کرا، لە ئەنجامدا بە گشتی هاوکۆلکەی هەڵبژاردنەکەی بەرز بووەوە. بۆ نموونە ئەگەر یەك کورسی بۆ پارێزگای سلێمانی زیاد بکرایە، هاوکۆلکەکەی دادەبەزی بۆ (٤٦٣١٣) دەنگ، بۆیە پێویستە کورد بە بێ ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی گشتیی دانیشتوان، کە بە شێوەیەکی زانستیانە ژمارەی دانیشتوانی پارێزگاکان دیاری بکات، نەچێتە هەڵبژاردنی داهاتووەوە.

## خشتەی (٤)

## هاوکۆلکەی هەڵبژاردن و ڕێژەی بەشداری لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (٢٠١٠)

| پارێزگا | دەنگدەران (ناخب) | دەنگدەری بەشدار (مصوت) | ڕێژەی بەشداری | جیاوازی لە تێکڕای عێراق | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | جیاوازی لە تێکڕای عێراق |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دهوك | ٥٧٤١٣٨ | ٤٢٤٧١٥ | ٧٣,٩٧ | + ١٢,٩٩ | ٤٢٤٧١ | + ٥٢٨٩ |
| هەولێر | ٩١٧٦٥٨ | ٦٨٠٤٠٨ | ٧٤,١٤ | + ١٣,١٦ | ٤٨٦٠١ | + ١١٤١٩ |
| سلیمانی | ١٠٩٨٤٥١ | ٨٣٣٦٣١ | ٧٥,٨٩ | + ١٤,٩١ | ٤٩٠٣٧ | + ١١٨٥٥ |
| نەینەوا | ١٧٠٢٩٦٤ | ١٠٥٤٧٩٨ | ٦١,٩٤ | + ٠,٩٦ | ٣٤٠٢٦ | - ٣١٥٦ |
| کەرکووك | ٧٨٧٦٧٣ | ٥٥٦٣٨٤ | ٧٠,٦٤٠ | + ٩,٦٦ | ٤٦٣٦٥ | + ٩١٨٣ |
| سەلاحەدین | ٦٩٦٩١٣ | ٤٨٨٨٦٥ | ٧٠,١٥ | + ٩,١٧ | ٤٠٧٣٩ | + ٣٥٥٧ |
| دیالە | ٨٤٠٢٤١ | ٥٠٢٨٩٦ | ٥٩,٨٥ | - ١,١٣ | ٣٨٦٨٤ | +١٥٠٢ |
| ئەنبار | ٨٠٢٣٧٨ | ٤٧٢٦٠٣ | ٥٨,٩٠ | - ٢,٠٨ | ٣٣٧٥٧ | -٣٤٢٥ |
| بەغدا | ٤٥٩٩٧٨٢ | ٢٥٤١٧٦٦ | ٥٥,٢٦ | - ٥,٧٢ | ٣٧٣٧٩ | + ١٩٧ |
| واست | ٦٣٨٦٩٩ | ٣٧٦٩٢٢ | ٥٩,٠١ | - ١,٩٧ | ٣٤٢٦٦ | -٢٩١٦ |
| بابل | ٩٦١٢٩٣ | ٥٨٦٢٨١ | ٦٠,٩٩ | + ٠,٠١ | ٣٦٦٤٣ | -٥٣٩ |
| کەربەلا | ٥٦٤٦٩١ | ٣٣٣٤٣٤ | ٥٩,٠٤ | - ١,٩٤ | ٣٣٣٤٣ | -٢٨٣٩ |
| نەجەف | ٦٩٦٥٩٩ | ٤١١٤٢٤ | ٥٩,٠٦ | - ١,٩٢ | ٣٤٢٨٥ | -٢٨٩٧ |
| قادسیە | ٦١٩٨٦٢ | ٣٧٣٣٣٩ | ٦٠,٢٣ | ٠,٧٥ | ٣٣٩٤٠ | -٣٢٤٢ |
| موسەنا | ٣٧٩٠٧٨ | ٢٢٩١٤١ | ٦٠,٤٤ | - ٠,٥٤ | ٣٢٧٣٤ | -٤٤٤٨ |
| زیقار | ٩٩٣٣٧٢ | ٥٧٢١٧٧ | ٥٧,٦٠ | - ٣,٣٨ | ٣١٧٨٨ | -٥٣٩٤ |
| میسان | ٥٦١٧٤٢ | ٢٧٢٨١٨ | ٤٨,٥٦ | - ١٢,٤٢ | ٢٧٢٨١ | -٩٩٠١ |
| بەسرە | ١٤٦٦٥١٢ | ٨١٤٨١٠ | ٥٥,٥٦ | - ٥,٤٢ | ٣٣٩٥٠ | -٣٢٣٢ |
| کۆی گشتی (تێکڕا) | ١٨٩٠٢٠٧٣ | ١١٥٢٦٤١٢ | ٦٠,٩٨ | | ٣٦٣٦٠,٩ | |

سەرچاوە: ئامادەکردنی توێژەر لە ڕێگەی داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

**٤: لیستە براوەکان:**

لەم هەڵبژاردنەدا نۆ لیست توانی سەر بکەوێت لە بە دەست هێنانی کورسیی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لیستی العراقیە (٩١) کورسی، دەوڵەتی قانون (٨٩) کورسی، ئیئتیلافی نیشتیمانی (٧٠) کورسی، هاوپەیمانیی کوردستان(٤٣) کورسی، گۆڕان (٨) کورسی، التوافق العراقی (٦) کورسی، یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و ئیئتیلافی وەحدەی عێراق، هەر یەکەیان (٤) کورسی و کۆمەڵی ئیسلامی (٢) کورسی.

بۆ (٥) کورسیی مەسیحییەکانیش، لیستی ڕافیدەین بە سەرۆکایەتیی یونادم یوسف کەنا (٣) سێ کورسیی بردەوە، لە هەولێر، بەغدا و کەرکووك، ئەنجومەنی گەلی کلدانی سریانی ئاشووری (٢) کورسییەکەی تری دهۆك و نەینەوای بردەوە.

بزووتنەوەی ئێزیدی بۆ ڕیفۆرم و پێشکەوتن (الحرکة الیزیدیة من اجل الاصلاح والتقدم) کورسیی ئێزیدییەکانی بردەوە، چونکە هەوڵی پارتی و یەکێتی ئەوە بوو کوردی یەزیدی دەنگ بۆ لیستی هاوپەیمانی بدەن، نەك بۆ کۆتای یەزیدییەکان.

هەروەها ئەندازیار (محەمەد جەمشید عەبدوڵلا شەبەکی) کورسیی شەبەکی لە پارێزگای نەینەوا بردەوە، کە پاڵێوراوی نزیك لە پارتی دیموکراتی کوردستانە. خالد ئەمین ڕومی بە تەنها (٧٤٢) دەنگ کورسیی سابیئەی لە پارێزگای بەغدا بردەوە. لەخشتەی ژمارە (٥)دا ڕوون کراوەتەوە.

خشتەی (٥)

چۆنێتیی دابەشبوونی کورسیی گشتی لیستە براوەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٠

| پارێزگا | عێراقیە | دەوڵەتی یاسا | ئیئتیلافی نیشتیمانی | هاوپەیمانیی کوردستان | گۆڕان | تەوافق | یەکێتیی عێراق | یەکگرتوو | کۆمەڵ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەغدا | ٢٤ | ٢٦ | ١٧ | ٠ | ٠ | ١ | ٠ | ٠ | — | ٦٨ |
| ئەینەوا | ٢٠ | ٠ | ١ | ٨ | ٠ | ١ | ١ | ٠ | ٠ | ٣١ |
| بەسرە | ٣ | ١٤ | ٧ | — | — | ٠ | ٠ | — | — | ٢٤ |
| زیقار | ١ | ٨ | ٩ | — | — | — | ٠ | — | — | ١٨ |
| بابل | ٣ | ٨ | ٥ | — | — | ٠ | ٠ | — | — | ١٦ |
| ئەنبار | ١١ | ٠ | ٠ | — | — | ٢ | ١ | — | — | ١٤ |
| واست | ٢ | ٥ | ٤ | — | — | — | ٠ | — | — | ١١ |
| قادسیە | ٢ | ٤ | ٥ | — | — | — | ٠ | — | — | ١١ |
| کەربەلا | ١ | ٦ | ٣ | — | — | — | ٠ | — | — | ١٠ |
| نەجەف | ٠ | ٧ | ٥ | — | — | — | ٠ | — | — | ١٢ |
| موسەننا | ٠ | ٤ | ٣ | — | — | ٠ | ٠ | — | — | ٧ |
| میسان | ٠ | ٤ | ٦ | — | — | — | ٠ | — | — | ١٠ |
| سەلاحەدین | ٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢ | ٢ | ٠ | — | ١٢ |
| دیالە | ٨ | ١ | ٣ | ١ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | — | ١٣ |
| کەرکووک | ٦ | ٠ | ٠ | ٦ | ٠ | ٠ | — | ٠ | ٠ | ١٢ |
| سلێمانی | — | — | ٠ | ٨ | ٦ | — | — | ٢ | ١ | ١٧ |
| هەولێر | — | — | ٠ | ١٠ | ٢ | — | — | ١ | ١ | ١٤ |
| دهۆک | — | — | ٠ | ٩ | ٠ | — | — | ١ | ٠ | ١٠ |
| کۆی گشتی | ٢+٨٩ | ٢+٨٧ | ٢+٦٨ | ١+٤٢ | ٨ | ٦ | ٤ | ٤ | ٢ | ٣١٧ |

أ. **لیستی عێراقیە:**

دکتۆر ئەیاد عەلاوی کەسایەتیی سیاسیی ناسراوی عێراق، سەرۆکی بزووتنەوەی ویفاقی نیشتیمانیی عێراقی و سەرۆکی یەکەم حکومەتی پاش ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام (٢٠٠٤)، سەرۆکایەتیی ئەم هاوپەیمانییە دەکات، لەگەڵ

بەشێکی زۆر لە پارت و لایەنە سوننەکان هاوپەیمانییەکەیان دروست کرد، بە تایبەت ئەم پارت و لایەنانە:

- بەرەی عێراقی بۆ دیالۆگی نیشتیمانیی (ساڵح موتڵەگ)
- گردبوونەوەی عراقیونی نیشتیمانیی (ئوسامە نوجێفی)
- لیستی نوێبوونەوەی (تاریق هاشمی)
- گردبوونەوەی ئایندەی نیشتیمانیی (زافر ئەلعانی)
- بەرەی تورکمانی بە سەرۆکایەتیی (سەعدەدین محەمەد ئەمین)
- لەگەڵ چەند لایەنێکی دیکەی عەرەبی شیعە. بە گشتی ژمارەی قەوارەکانی لیستەکە (٢٠) قەوارەی سیاسییە.

ئەم هاوپەیمانییە، تێکەڵەیەکە لە چەند لایەنێکی سوننە و شیعە و بەهێزترین پارتە تورکمانییەکان، لە نێوان تەوژمی عەلمانی، کە ئەیاد عەلاوی سەرکردایەتیی دەکات، لەگەڵ تەوژمێکی عەرەبچێتیی عێراقی، کە نوجێفی سەرۆکایەتیی دەکات، تەوژمێکی توندوتیژی نزیك لەئایدیۆلۆژیای بەعس، کە موتڵەگ پێشڕەویی دەکات، هاوکات تاریق هاشمی نوێنەرایەتیی تەوژمێکی ئیسلامیی سوننی میانڕەو دەکات، لەگەڵ هەندێك کەسایەتیی خێڵەکی لە هەر دوو مەزهەبی شیعە وسوننە.

تایبەتمەندیی ئەم لیستە ئەوەیە، سەرۆکەکەی کەسێکی شیعەی عەلمانییە، بەڵام زۆربەی جەماوەرەکەی لە سوننەی عەرەبن. کۆبوونەوەی سوننەکان لە سایەی هاوپەیمانییەکدا کە عەلاوی سەرۆکایەتیی دەکات، لەبەر چەند هۆیەك بووە، لە سەرووی هەموویانەوە هەستکردنی عەرەبی سوننەیە بەوەی سەرەك وەزیران دەبێت کەسێکی عەرەبی شیعە بێت، کە جێگەی ڕەزامەندیی وڵاتانی عەرەب و ئەمریکاییەکانیش بێت، لە هەمان کاتدا لە لای جەماوەری عەرەبی سوننە باوەڕپێکراو بێت، هەروەها بۆ ڕاگرتنی باڵانسی نەخشەی سیاسیی

هەڵبژاردنەکە پێویستییان بە هاوپەیمانییەك بوو، کە دیواری ناوچە شیعەنشینەکان ببەزێنێت و، بەشێك لە کورسییەکانی پارێزگا شیعەنشینەکان بباتەوە، ئەم کارەیش تەنها بە ئەیاد عەلاوی و شیعە هاوپەیمانەکانی دەکرا، چونکە بە تەنها بردنەوەی کورسیی ناوچە سوننییەکان، پێکهاتەی عەرەبی سوننە هەمیشە کەمینە دەردەچێت و نابێتە یەکەم لیست لە سەر ئاستی عێراق.
هۆیەکی دیکەی کۆبوونەوەی ئەم هێزانە بریتی بوو لە پاڵپشتیی وڵاتانی عەرەبی، بە تایبەت شانشینی سعودیە بۆ ئەم هاوپەیمانییە، لەگەڵ پشتیوانیی وڵاتی تورکیا، لە ڕێگەی بەرەی تورکمانی و لیستەکەی تاریق هاشمییەوە، کە لە ڕووی فیکری ئیسلامییەوە لە پارتی دەسەلاتداری تورکیاوە (پارتی داد و گەشەپێدانەوە) نزیکە.

لیستی عێراقییە لە (١٥) پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد، بێجگە لە سێ پارێزگاکەی هەرێم، بەلام تەنها لە (١٢) پارێزگایاندا توانی کورسی بە دەست بهێنێت، لە هەر یەك لە (موسەنا و میسان و نەجەف) هیچ کورسیی نەبردەوە.

بە گشتی (٢,٨٥١,٨٢٣) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە ڕێژەی (٢٤,٧٪)ی کۆی دەنگدەرانی عێراق، لە بەرامبەردا (٩١) کورسیی پەرلەمانی بردووەتەوە، کە دەکاتە (٢٨٪)ی کۆی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران، بەجیاوازیی دوو کورسی پێش ڕکابەرە بەهێزەکەی (دەوڵەتی یاسا) کەوت.

دەنگەکانی لیستی عێراقیە بە شێوەیەکی یەکسان دابەش نەبووە بە سەر هەموو پارێزگا و ناوچەکانی عێراقدا، بەڵکو بە ئاشکرا کاریگەریی ئینتیمای نەتەوەیی و مەزهەبی و پێگەی سەرکردەکانی لیستەکە و قورسایی ڕەوتی عیلمانیی پێوە دیارە. لە خوارەوە ناوچە و پارێزگاکانی هێزی لیستی عێراقیە شی دەکەینەوە:

١. **ڕێژەی دەنگی زۆر بەرز:** هەردوو پارێزگای ئەنبار و نەینەوا دەگرێتەوە، بە بەهێزترین و باشترین ناوچە بۆ لیستی عێراقییە دادەنرێت، چونکە زیاتر لە نیوەی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، لە پارێزگای ئەنبار ڕێژەی (٦٢,٣٪)ی دەنگەکان و (١١) کورسی لە کۆی (١٤) کورسیی بردووەتەوە. لە پارێزگای نەینەوایش ڕێژەی (٥٦,٢٪)ی دەنگەکان و(٢٠) کورسیی لە کۆی (٣٤) کورسیی پارێزگاکەی بە دەست هێناوە.

بەرزیی ڕێژەی دەنگەکانی عێراقییە لەم دوو پارێزگایەدا، دەگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی پێکهاتەی عەرەبی سوننە، لە هەمان کاتدا زاڵبوونی بیری بەعس و عەرەبچێتی و ڕەوتی ئیسلامیی، لە لای دانیشتوانی عەرەبی ئەم دوو پارێزگایە. بۆ نموونە بنەماڵەی نوجێفی لە سەر بنەمای دژایەتیکردنی کورد و بەرپەرچدانەوەی هەژموونی کورد بە گشتی و پارتی دیموکراتی کوردستان بە تایبەتی، زۆربەی دەنگەکانی نەینەوایان بە دەست هێناوە، بە تەنها خودی ئوسامە نوجێفی لە نەینەوا (٢٧٤,٧٤١) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە ڕێژەی (٤٦,٢٪) دەنگی لیستی عێراقیە لەنەینەوا. هەروەها گردبوونەوەی ئاییندەی نیشتیمانی، کە ئاڕاستەیەکی ئیسلامیی عەرەبچێتیی هەیە، لە پارێزگای ئەنبار زۆرینەی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، بە تایبەت (رافع عیساوی) کە (٨٣,١٤٥) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە (٢٨,٢٪) دەنگی عێراقیە لە ئەنبار. بەواتایەکی تر، ئەم دوو هێزە سیاسییە هۆکاری سەرەکیی بردنەوەی لیستی عێراقیەن لەم دوو پارێزگایە.

٢. **ڕێژەی دەنگی بەرز:** ئەو پارێزگایانە دەگرێتەوە کە لە نێوان (٤٠٪ — ٥٠٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، هەر یەك لە پارێزگاکانی دیالە (٤٨,٧٪) سەلاحەدین (٤٧,٨٪) دەگرێتەوە، لە هەر یەکەیان (٨) کورسیی بە دەست هێناوە، لە کۆی (١٣) کورسی لە پارێزگای دیالە و (١٢) کورسی لە پارێزگای

سەلاحەدین. بردنەوەی عێراقیە لەم دوو پارێزگایە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ڕێژەیەکی بەرزی عەرەبی سوننە و، بوونی تورکمان، کە لە ڕێگەی بەرەی تورکمانییەوە هاوپەیمانیان لەگەڵ لیستی عێراقیەدا گرێ داوە، هەروەها زاڵبوونی بیری بەعس لە لای عەرەبە سوننەکانی ئەم دوو پارێزگایە.

لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکانی ساڵی ٢٠٠٩ لە پارێزگای سەلاحەدین، بێجگە لە جەماوەری بزووتنەوەی ویفاقی نیشتیمانی، کە (٥) کورسی ئەنجومەنی پارێزگایان بردووەتەوە، هەر یەك لە لیستەکەی ساڵح موتڵەگ و لیستی (جبهة المشروع الوطني العراقي - جموع) (٣) کورسی، بەرەی تورکمانی (٢) کورسی، هەموو ئەم لیستانە لەم هەڵبژاردنەدا لە چوارچێوەی عێراقییەدا یەکیان گرتبوو، بۆیە ئەم دەنگە زۆرە بۆ لیستەکە هاتووە.

لە پارێزگای دیالەیش هەر یەك لە لیستەکەی عەلاوی و لیستەکەی موتڵوگ زۆرترین جەماوەریان هەیە، چونکە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا (٢٠٠٩)ساڵح موتڵەگ دووەم لیست و عەلاوی چوارەم لیست بووە لە سەر ئاستی پارێزگا.

٣. **ڕێژەی دەنگی مامناوەند (٣٠٪-٤٠٪)**: پارێزگاکانی کەرکوك (٣٨٪) و بەغدا (٣٣,١٪) دەگرێتەوە. لە کەرکووکدا یەکەم دەنگی پارێزگاکەی بە دەست هێناوە و نیوەی کورسییەکانی بردووەتەوە، چونکە بەرەی تورکمانی و تورکمانەکان بە گشتی دەنگیان بۆ عێراقییە داوە، بۆ نموونە پاڵێوراوی بەرەی تورکمانی (ئەرشەد ڕەشاد عەبدولڕەزاق ناسراو بە ئەرشەد ساڵحی) یەکەم دەنگی لیستەکەی بە دەست هێنا، کە گەیشتە (٥٩٧٣٢) دەنگ، کە دەکاتە (٢٨,٢٪)ی دەنگەکانی عێراقیە لە کەرکوك. هەروەها زۆربەی لایەنە عەرەبییە کاریگەرەکان پاڵپشتیی ئەم لیستەیان کردووە، لە پێناو دژایەتیکردنی هەژموونی کورد لە پارێزگاکە، بە بەڵگەی ئەوەی لیستە عەرەبییەکانی دیکە تەنها چەند هەزار

دەنگێکیان بە دەست هێناوە. بۆ عەرەبی سوننە و تورکمان، ئەم هەڵبژاردنە، وەکو ڕاپرسییەك بۆ یەکلاییکردنەوە چارەنووسی پارێزگاکە تەماشا کراوە، چونکە پاش ئەوەی، بەشێکی عەرەبی سوننە لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥ دا، بەشدارییان نەکرد، سەنگی لایەنی کورد بەهێزتر بوو، بە تایبەت لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوودا، کە کورد ٢٦ کورسیی لە کۆی ٤١ کورسی بردووەتەوە، تا ڕادەیەکیش لەم مەسەلەیەدا سەرکەوتووبن، چونکە توانیان ببن بە یەکەم لیست لە پارێزگاکەدا، ئەگەر کۆی دەنگی لایەنە عەرەبی و تورکمانی و مەسیحییەکان لە کەرکووك کۆ بکرێنەوە، ئەوا نزیکەی (٥٠,٦٪) دەنگی پارێزگاکە دەکات.

لە پارێزگای بەغدایش لیستی عێراقیە، بەدووەم دەنگ هاتووە لە پاش لیستی دەوڵەتی یاسا، (٢٤) کورسیی لە کۆی (٦٨) کورسی گشتی پارێزگاکەی بە دەست هێناوە، بەشی هەرە زۆری سوننەکانی بەغدا لەگەڵ بەشێکی زۆر کەمی شیعەکان دەنگیان بۆ ئەم لیستە داوە، بە بەڵگەی ئەوەی دوو لیستە گەورەکەی شیعەکان پێکەوە (٥٧,٦٪) دەنگەکانی بەغدایان بە دەست هێناوە. جێی ئاماژە پێ کردنە خودی عەلاوی (٤٨,٤٪)ی دەنگەکانی لیستی عێراقیەی لە بەغدا بە دەست هێناوە و هەموو کاندیدەکانی تری لیستەکەی باقی دەنگەکانیان بە دەست هێناوە، پاش ئەویش تاریق هاشمی دێت بە ڕێژەی (٢٣,٩٪)ی دەنگەکانی لیستی عێراقیە لە بەغدا. واتە زیاتر لە (٧٢٪)ی دەنگی لیستی عێراقیە لە پارێزگای بەغدا بۆ دوو کەسایەتیی ئەو لیستە بووە، ئەمە بۆ خۆی ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ کاریگەریی گەورەی ئەم کەسایەتییانە لە نێو لیستەکەدا.

٤. **ڕێژەی دەنگی نزم (١٠٪ ــ٢٠٪)**: پارێزگاکانی بابل (١٧,٩٪)، واسط (١٣,٥٪)، قادسیە (١٤,٧٪) و کەربەلا (١٠,٨٪) دەگرێتەوە، کەمیی ڕێژەی دەنگی عێراقیە لەم چوار پارێزگایەدا، دەگەڕێتەوە بۆ بوونی زۆرینەی شیعە، کە دەنگیان بۆ دوو هاوپەیمانییە شیعەکە داوە، ئەو دەنگانەیشی بۆ عێراقییە

هاتووه لەم ناوچانە بە زۆری بۆ لایەنگر و هەوادارانی بزووتنەوەی ویفاقی نیشتیمانی و خودی عەلاوی دەگەڕێنەوە، چونکە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان لە ساڵی ۲۰۰۹ دا، پارتەکەی عەلاوی لە هەر یەك لە پارێزگاکانی (واست و بابل و قادسیە) سێ کورسیی بە دەست هێناوە و، نۆ کورسیی ئەنجومەنەکانی ئەو سێ پارێزگایەی بردووەتەوە، بە واتایەکی تر کەسایەتی و پارتە سوونییەکان لەم ناوچانەدا هەژموونیان نییە. هەروەها بەشی زۆری دەنگدەری ئەم پارێزگایانە، بە کاریگەریی بیرکردنەوەی مەزهەبی و دژایەتیکردنی لەمێژینەی سوننە.

٥. **ڕێژەی دەنگی زۆر نزم (کەمتر لە ١٠٪)**:پێنج پارێزگای باشوور و ناوەڕاستی عێراق دەگرێتەوە، کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی شیعەن، لە سێ پارێزگایان (میسان و موسەنا و نەجەف) دەنگەکانی عێراقیە هاوکۆلکەی هەڵبژاردنی تێ نەپەڕاندوە و (٥) کورسییەکی نەبردووەتەوە، بەڵام لە بەسرە سێ کورسیی بردووەتەوە لەبەر دوو هۆکار:

یەکەمیان: بوونی ڕێژەیەك لە عەرەبی سوننە لەو پارێزگایە، بە تایبەت لایەنگرانی پارتی ئیسلامیی عێراقی و لە نێویدا باڵی تاریق هاشمی، چونکە ئەم پارتە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا لە (۲۰۰۹) دوو کورسیی بردووەتەوە.

دووەمیان: بە حوکمی زیندوێتیی بزافی ڕۆشنبیری و ئەکادیمی لە شارەکەدا، دەنگدەرانی بەسرە ئاڕاستەی عیلمانییان زیاترە لە دەنگدەرانی پارێزگاکانی دیکەی باشوور، بە بەڵگەی ئەوەی پارتەکەی عەلاویش لە هەمان هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا دوو کورسیی بە دەست هێناوە.

به هه‌مان شێوه بوونی ته‌وژمی عیلمانی و هه‌ژموونێكی كه‌می پارته‌كه‌ی عه‌لاوی هۆكاری به‌ ده‌ست هێنانی كورسییه‌كی ئه‌نجومه‌نی نوێنه‌ران بوو له‌ پارێزگای زیقار.

ئه‌گه‌ر له‌ سه‌ر ئاستی عێراق ده‌نگه‌كانی لیستی عێراقییه‌ دابه‌ش بكه‌ین، وه‌ك له‌ خشته‌ی (٥)دا روون كراوه‌ته‌وه‌، ده‌بینین به‌غدا باشترین پارێزگا بووه‌ بۆ لیسته‌كه‌، (٢٩,٥٪) ده‌نگه‌كانی له‌و پارێزگایه‌دا به‌ ده‌ست هێناوه‌، به‌ هۆی زۆری ده‌نگده‌رانی ئه‌و پارێزگایه‌، كه‌ نزیكه‌ی یه‌ك له‌ سه‌ر چواری ده‌نگده‌رانی عێراق له‌ خۆ ده‌گرێت، هه‌روه‌ها به‌هێزیی لیسته‌كه‌ و كه‌سایه‌تیی عه‌لاوی و هاشمی له‌و پارێزگایه‌دا، پاشان به‌ پله‌ی دووه‌م پارێزگای نه‌ینه‌وا دێت، كه‌ (٢٠,٨٪) ده‌نگه‌كان عێراقیه‌ی تێدا هاتووه‌، دواتر ئه‌نبار به‌ رێژه‌ی (١٠,٣٪) هاتووه‌، هه‌ر یه‌ك له‌ پارێزگاكانی دیاله‌ و سه‌لاحه‌دین و كه‌ركووكیش یه‌ك له‌ دوای یه‌ك (٨,٦٪) و(٨,٢٪) و (٧,٤٪)ی ده‌نگه‌كانی لیستی عێراقیه‌یان پێك هێناوه‌، له‌ به‌رامبه‌ردا له‌ (٩) پارێزگای ناوه‌راست و باشووردا، كه‌ زۆرینه‌ی دانیشتوانه‌كه‌ی شیعه‌ مه‌زهه‌بن، كه‌متر له‌ (٤٪) ده‌نگه‌كانی لیستی عێراقیه‌ی پێك ده‌هێنن. (بۆ زیاتر زانیاری بروانه‌ خشته‌ی (٦)).

**خشتەی (٦)**

**دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی لیستی عراقیە (٢٠١٠)**

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | نەینەوا | ٥٩٣٩٣٦ | ٢٤٠٢٦ | ٢٠ | ٥٦,٣١ | ٢٠,٨٢ |
| ٢ | کەرکووک | ٢١١٦٧٥ | ٤٦٣٦٥ | ٦ | ٣٨,٠٤ | ٧,٤٢ |
| ٣ | سەلاحەدین | ٢٣٣٥٩١ | ٤٠٧٣٩ | ٨ | ٤٧,٧٨ | ٨,١٩ |
| ٤ | دیالە | ٢٤٥٠٢٥ | ٣٨٦٨٤ | ٨ | ٤٨,٧٢ | ٨,٥٩ |
| ٥ | ئەنبار | ٢٩٤٤٢٠ | ٣٣٧٥٧ | ١١ | ٦٢,٣٠ | ١٠,٣٢ |
| ٦ | بەغدا | ٨٤١٧٥٥ | ٣٧٣٧٩ | ٢٤ | ٣٣,١٢ | ٢٩,٥٢ |
| ٧ | واست | ٥١٠٠٣ | ٣٤٢٦٦ | ٢ | ١٣,٥٣ | ١,٧٩ |
| ٨ | بابل | ١٠٤٧٤٦ | ٣٦٦٤٣ | ٣ | ١٧,٨٧ | ٣,٦٧ |
| ٩ | کەربەلا | ٣٦٠٦١ | ٣٣٣٤٣ | ١ | ١٠,٨١ | ١,٢٦ |
| ١٠ | نەجەف | ٣٠٨١٠ | ٣٤٢٨٥ | 0 | ٧,٤٩ | ١,٠٨ |
| ١١ | قادسیە | ٥٥٠٣٠ | ٣٣٩٤٠ | ٢ | ١٤,٧٤ | ١,٩٣ |
| ١٢ | موسەنا | ١٨٢٠٥ | ٣٧٧٣٤ | 0 | ٧,٩٤ | ٠,٦٤ |
| ١٣ | زیقار | ٤٣٧٠٦ | ٣١٧٨٨ | ١ | ٧,٦٤ | ١,٥٣ |
| ١٤ | میسان | ١٦٤٧٣ | ٢٧٢٨١ | 0 | ٦,٠٤ | ٠,٥٨ |
| ١٥ | بەسرە | ٧٥٣٨٧ | ٣٣٩٥٠ | ٣ | ٩,٢٥ | ٢,٦٤ |
|  | کۆی گشتی | ٢٨٥١٨٢٣ |  | ٩١=٢+٨٩ | ٢٤,٧٤ | ٪١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

بە تێبینیکردنی نەخشەی دابەشبوونی دەنگی لیستی عێراقییە دەتوانین چەند ڕاستییەك بخەینە ڕوو:

١. بەهێزترین ناوچە بۆ عێراقیە پارێزگاکانی ڕۆژئاوا و باکووری عێراقە، واتە پارێزگا عەرەبە سوننەنشینەکان، یان ئەوانەی سوننە زۆرینەی دانیشتوانەکەی پێك دەهێنێت، بە تایبەت نەینەوا، سەلاحەدین، ئەنبار، دیالە و کەرکووك، کە عێراقییە تێیاندا یەکەم لیست بووە، چونکە زۆربەی زۆری سوننەکانی ئەم ناوچەیە دەنگیان بۆ عێراقییە داوە و (٥٣) کورسیی لەم پارێزگایانە بردووەتەوە.

٢. ئەنجامەکان لەوەوە نزیکن کە عێراقییە لە شاری بەغدا، بە زۆریی (بە واتایەکی تر تەنها) دەنگی سوننەکانی بە دەست هێنابێت، چونکە بە دوو هاوپەیمانییە سونییەکەیشەوە (وەحدەی عێراق و تەوافوق) دەنگی سوننەکان نەگەیشتووەتە ڕێژەی (٣٧٪)ی دەنگەکانی پارێزگاکە.

٣. بە گشتی لە پارێزگاکانی ناوەڕاست و باشوور، کە زۆرینەی دانشتوانەکەی شیعە مەزهەبن، لیستی عێراقیە لاوازە و لە پاش دوو هاوپەیمانییە شیعەکەوە دێت، ئەو دەنگانەی کە بە دەستی هێناوە، دەگەڕێتەوە بۆ بوونی پارتەکەی عەلاوی و ناوبانگی خودی خۆی، لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی ناوچەیی دیکە.

٤. کەواتە نەخشەی دابەشبوونی هێزی عێراقییە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە ئەم لیستە لە سەر ئەرزی واقیع هاوپەیمانییەکی سوننییە، چونکە لە کۆی (٩١) کورسی نزیکەی (٧٥) کورسیی لە ناوچە و پارێزگا سوننییەکاندا و، لە لایەن پارت و لایەنە سوننەکانەوە، بە دەست هاتووە.

**دابەشبوونی رێژەیی دەنگی لیستی عێراقییە لەسەر ئاستی پارێزگاکان**
**لەهەڵبژاردنی پارلەمانی عێراق 2010**



ب. **هاوپەیمانیی دەوڵەتی یاسا:**

نوری مالیکی سەرەك وەزیرانی ئێستای عێراق و سەرۆکی حیزبی دەعوەی ئیسلامی، سەرۆکایەتیی دەکات، (٣٤) قەوارەی سیاسیی دیکەیش لەم هاوپەیمانییەدا کۆبوونەتەوە، گرینگترینیان:

- حزبی دەعوەی ڕێکخستنی عێراق بە سەرۆکایەتیی (هاشم موسەوی)
- مستقلون (بێلایەنەکان) بە سەرۆکایەتیی حسێن شەهرستانی، وەزیری پێشووی نەوت و جێگری سەرەك وەزیران بۆ کاروباری وزە
- لیستی نیشتیمانی (حازم حەسەنی)،
- یەکگرتووی ئیسلامیی تورکمانیی عێراق (عەباس بەیاتی)،
- گردبوونەوەی شارەزایانی سەربەخۆی عێراق، کە (عەلی ئەدیب)ی وتەبێژی حکومەتی عێراق و یەکێك لە کەسە نزیکەکانی مالیکی، بۆ کۆکردنەوەی کەسانی ئەکادیمی و ڕۆشنبیریی، لە دەوری حیزبەی دەعوە، دروستی کردووە.

ئەوەی ئەم هاوپەیمانییە لە عێراقیە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە بێجگە لە نوری مالیکی سەرکردەی خاوەن هێز و هەژموونی ناوچەیی و نیشتیمانی کەم تێدایە، یان هەر تێیدا نییە، هاوپەیمانییەکە هەر بە (مالیکییەوە) ناسراوە و بەویشەوە بەندە، بە تایبەت لەبەرئەوەی مالیکی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە، کە گەورەترین دەسەڵاتی جێبەجێکردنە لە عێراق، لە هەمان کاتدا فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکانە، سەرۆکی کۆنترین و بەهێزترین پارتی گۆڕەپانی سیاسیی عێراقیشە، لە نێوەندی شیعە مەزهەبەکاندا.

سەرکەوتنی مالیکی لە چەسپاندنی (تا ڕادەیەك) ئاسایشی ناوچەکانی عێراق، بە تایبەت هەر دوو پارێزگای بەغدا و بەسرە، نەهێشتنی دەسەڵاتی میلیشیای جەیشی مەهدی، کۆکردنەوەی زۆربەی سەرکردە سەربازی و ئەمنییەکان لە دەوری خۆی، بە حوکمی ئەوەی فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی

عێراقـە، لەگـەڵ پـەیڕەوکردنی گوتـارێکی سیاسـیی جیـاواز، بـە ئاڕاسـتەی بوونیاتنانەوەی دەوڵەت لە سەر شێوازی دەوڵەتی دامەزراوەکان، گرینگترین خاڵە بەهێزەکانی سەرکەوتنی مالیکی و هاوپەیمانییەکەیەتی.

لـە لایـەکی تـرەوە سـەرکەوتنی بـە سـەر سـەرجەم لیـستەکانی دیکـەدا، لـە هەڵبژاردنی ساڵی (٢٠٠٩)ی ئەنجومـەنی پارێزگاکـان، کـە لـە کـۆی (١٤) پارێزگـا لـە(٩) پارێزگـادا پلـەی یەکـەمی بـە دەسـت هێنـا، لـە کـۆی (٤٤٠) کورسـیی ئەنجومـەنی پارێزگاکـان تـوانی (١٢٦) کورسـی بباتـەوە، پاڵنـەرێکی مەعنـەوی گەورە بوو بۆ ئـەم لیـستە، بـۆ ئـەوەی بەشـێك لـە هێـزە بـچووکە ناوچـەییەکان پەیوەندیی پێوە بکەن.

بە هەمان شێوەی عێراقییە، لیستەکەی مالیکیش لە (١٥) پارێزگا بەشداریی هەڵبژادرنەکەی کرد، بێجگە لە سێ پارێزگاکـەی هـەرێمی کوردسـتان، تـوانی لـە (١١) پارێزگایان سەرکەوتن بە دەست بهێنیت، بە گشتی (٢,٧٩٧,٦٢٣) دەنگـی بە دەست هێنا، کە دەکاتە (٢٤,٣٪)ی کۆی دەنگدەرانی عێـراق، لـە بەرامبـەردا (٨٩) کورسـیی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی بـردەوە، کـە دەکاتـە (٢٧,٤٪)ی کـۆی کورسییەکان.

لەسەر ئاستی پارێزگاکان دەنگـەکانی لیـستی دەوڵـەتی یاسـا بـەم شـێوەیە دابەش بووە:

١. ئاستی دەنگی زۆر بەرز، هەر دوو پارێزگای کەربەلا و بەسرە دەگرێتەوە، کـە لـە یەکەمیانـدا (٥٣,٨٪) ولـە دووەمیانـدا (٥٢,٩٪) دەنگـەکانی بـە دەسـت هێناوە، باشترین دوو پارێزگا بوون بۆ لیستی دەوڵـەتی یاسـا. لـە ڕاسـتیدا هـۆی سەرکەوتنی گەورەی ئەم لیستە لـەم دوو پارێزگایـە زۆر ڕوون نییـە، تـەنها ئـەوە نەبێت کە لیستە ئایینییـەکان لـەنێو جـەماوەری شیعەدا بـەرەو پاشەکشێی زۆر ڕۆشتووە، بۆیە لیستی دەوڵەتی یاسا کە بۆچوون و گوتارەکانی تا ڕادەیەکی زۆر

دوور بوو لە ڕەوتی ئایینی لەم دوو پارێزگایە سەرکەوتنی بە دەست هێنا، بە تایبەت لەبەرئەوەی دەنگدەری ئەم دوو پارێزگایە هۆشیارترن بەراود بە پارێزگاکانی تر. بۆ نموونە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا (٢٠٠٩) کەسایەتییەکی سەربەخۆ یەکەم دەنگی پارێزگای کەربەلای بە دەست هێنابوو.

٢. ئاستی دەنگی بەرز: هەر سێ پارێزگای نەجەف (٤٨٪) موسەنا (٤٣,٢٪) و زیقار (٤١,١٪) دەگرێتەوە، لە دوو پارێزگای یەکەمیاندا لیستی دەوڵەتی یاسا بە یەکەم لیست هاتووە، بەڵام لە پارێزگای سێیەمیان بە دووەم لیست هاتووە، لە پاش ئیئتیلافی نیشتیمانیی عێراقی. لە نەجەف (٧) کورسیی لە کۆی (١٢)، لە موسەنا (٤) کورسی لە کۆی (٧)، لە زیقار (٨) کورسیی لە کۆی (١٨) کورسی بە دەست هێناوە.

٣. ئاستی دەنگی مامناوەند، هەموو ئەو پارێزگایانە دەگرێتەوە کە ڕێژەی دەنگی لیستی دەوڵەتی یاسا لە نێوان (٣٥٪ بۆ ٤٠٪)ی کۆی دەنگدەری پارێزگاکانە، پێنج پارێزگای باشوور و ناوەڕاستی عێراق دەکەونە چوارچێوەی ئەم ئاستەوە، کە بریتین لە (بەغدا، واست، بابل، قادسیە و میسان) لە سێ پارێزگای یەکەمیاندا لیستی دەوڵەتی یاسا یەکەم دەنگی هێناوە، بەڵام لە دوو پارێزگاکەی تردا دووەم دەنگی هێناوە لە پاش ئیئتیلافی نیشتیمانیی عێراقی.

٤. ئاستی دەنگی نزم: پارێزگای دیالە دەگرێتەوە، کە تەنها (١٢,٧٪) دەنگەکانی بە دەست هێناوە و یەك کورسیی بردووەتەوە، بە هۆی کەمیی ڕێژەی عەرەبی شیعە لەم پارێزگایە و بەهێزیی ئیئتیلافی نیشتیمانیی عێراقی، کە سێ کورسیی بردووەتەوە لەم پارێزگایە.

٥. ئاستی دەنگی زۆر نزم: هەر چوار پارێزگا سوننییەکە دەگرێتەوە (ئەنبار، نەینەوا، سەلاحەدین و کەرکووك) کە بوونی شیعە تێیدا کەم و لاوازە، دەنگەکانی ئەم لیستە نەگەیشتووەتە ئاستی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن تێیاندا،

ئەگەرچی پارێزگای سەلاحەدین ڕێژەی (٦,٧٪) و (٣٢٨١٥) دەنگی بە دەست هێناوە، بەڵام لە سێ پارێزگاکەی تر زۆر لاواز بووەو کەمتر لە (٢,٤٪) دەنگەکانی بە دەست هێناوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە خشتەی (٧).

خشتەی (٧)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی هاوپەیمانیی دەوڵەتی یاسا

| ز | پارێزگا | ژ. دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | ژ. کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | نەینەوا | ١٧٤٧٥ | ٣٤٠٢٦ | 0 | ١,٦٥ | ٠,٦٢ |
| ٢ | کەرکووك | ١٣٥١٤ | ٤٦٣٦٥ | 0 | ٢,٤٣ | ٠,٤٨ |
| ٣ | سەلاحەدین | ٣٢٨١٥ | ٤٠٧٣٩ | 0 | ٦,٧١ | ١,١٧ |
| ٤ | دیالە | ٦٣٩٦٩ | ٣٨٦٨٤ | ١ | ١٢,٧٢ | ٢,٢٩ |
| ٥ | ئەنبار | ٦٥٣٥ | ٣٣٧٥٧ | 0 | ١,٣٨ | ٠,٢٣ |
| ٦ | بەغدا | ٩٠٣٣٦٠ | ٣٧٣٧٩ | ٢٦ | ٣٥,٥٤ | ٣٢,٢٩ |
| ٧ | واست | ١٤٩٨٢٨ | ٣٤٢٦٦ | ٥ | ٣٩,٧٥ | ٥,٣٦ |
| ٨ | بابل | ٢٣١٩٣٩ | ٣٦٦٤٣ | ٨ | ٣٩,٥٦ | ٨,٢٩ |
| ٩ | کەربەلا | ١٧٩٥١٧ | ٣٣٣٤٣ | ٦ | ٥٣,٨٣ | ٦,٤٢ |
| ١٠ | نەجەف | ١٩٧٣٧٧ | ٣٤٢٨٥ | ٧ | ٤٧,٩٧ | ٧,٠٦ |
| ١١ | قادسیە | ١٣٣٠٦٧ | ٣٣٩٤٠ | ٤ | ٣٥,٦٤ | ٤,٧٦ |
| ١٢ | موسەنا | ٩٨٩٩٨ | ٣٢٧٣٤ | ٤ | ٤٣,٢٠ | ٣,٥٤ |
| ١٣ | زیقار | ٢٣٥٤٤٦ | ٣١٧٨٨ | ٨ | ٤١,١٥ | ٨,٤٢ |
| ١٤ | میسان | ١٠٢٥٦٦ | ٢٧٢٨١ | ٤ | ٣٧,٦٠ | ٣,٦٧ |
| ١٥ | بەسرە | ٤٣١٢١٧ | ٣٣٩٥٠ | ١٤ | ٥٢,٩٢ | ١٥,٤١ |
|  | کۆی گشتی | ٢٧٩٧٦٢٣ |  | ٨٩=٢+٨٧ | ٢٤,٢٧ | ١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

**دابەشبوونی ڕێژەیی دەنگی لیستی دەوڵەتی یاسا لەسەر ئاستی پارێزگاکان**
**لەهەڵبژاردنی پارلەمانی عێراق 2010**



ج. **ئیئتیلافی نیشتیمانیی عێراقی (الائتلاف الوطني العراقي):**

عەممار ئەلحەکیم سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی سەرۆکایەتیی ئەم هاوپەیمانییە دەکات، پێکهاتبوو لە یەکگرتنی (٣٠) قەوارەی سیاسی، بەهێزترینیان سەدرییەکانە بە سەرۆکایەتیی موقتەدا سەدر، پاشان ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی و ڕێکخراوی بەدر بە سەرۆکایەتیی هادی عامری، کە زۆر نزیکە لە ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی، هەروەها حیزبی فەزیلە بە سەرۆکایەتیی هاشم موسەوی، لەگەڵ تەیاری چاکسازیی نیشتیمانیی (ئیبراهیم جەعفەری) و کۆنگرەی نیشتیمانیی عێراقی (ئەحمەد چەلەبی).

بە گشتی ئەم ئیئتیلافە بە شیعەگەرایی ناسراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ لایەنی سوننە لە هاوپەیمانییەکە بەشداربوون، نموونەی (ئەنجومەنی ئینقازی ئەنبار) بە سەرۆکایەتیی (حەمید فەرحان ئەلهایس)، بەڵام ئەم لیستە نەیتوانی لە ئەنبار دەنگێکی ئەوتۆ بە دەست بهێنێت و بگاتە ئاستی بردنەوەی کورسی.

ئەم هاوپەیمانییە لە هەر هەژدە پارێزگاکەی عێراقدا بەشداری لە هەڵبژاردنەکەدا کرد، بەڵام تەنها لە (١٢) پارێزگادا سەرکەوتنی بە دەست هێنا و توانی کورسی بباتەوە. لە سەر ئاستی عێراق (٢٠٩٥٣٣٦) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە (١٨,٢٪)ی کۆی دەنگدەرانی عێراق، لە بەرامبەردا (٦٨) کورسیی پارێزگاکان و (٢) کورسیی قەرەبووی بردەوە، کە دەکاتە (٢١,٥٤٪) کۆی کورسییەکانی پەرلەمان.

لەسەر ئاستی پارێزگاکان دەنگی ئەم هاوپەیمانییە بەم شێوەیە دابەش بووە:

١. ئاستی دەنگی زۆر بەرز: هەر دوو پارێزگای میسان و زیقار دەگرێتەوە، کە لە یەکەمیاندا (٤٩,٦٪) و لە دووەمیاندا (٤٢,٨٪)ی دەنگەکانی بە دەست

هێناوە، باشترین ناوچە بووە بۆ هاوپەیمانیی نیشتیمانی و لەم دوو پارێزگایەدا ئەم لیستە پێش لیستەکانی دیکە کەوتووە، بە هۆی بەهێزیی ڕەوتی ئایینی شیعە لەم ناوچانەدا، بە تایبەت شوێنکەوتووانی سەدر و بنەماڵەی ئەلحەکیم و ئایەتوڵا یەعقوبی (فەزیلە).

٢. ئاستی دەنگی بەرز (٣٠ـــ٣٩٪): پێنج پارێزگای باشوور و ناوەڕاست دەگرێتەوە، کە بریتین لە نەجەف (٣٧,١٪)، قادسیە (٣٥,٨٪)، واست (٣٤,٢٪)، موسەنا (٣١,٣٪) و بابل (٣٠,٧٪) تەنها لە پارێزگای قادسیە پێش دەوڵەتی یاسا کەوت بە ڕێژەیەکی زۆر کەم و بوو بە یەکەم لیستی پارێزگاکە، بەڵام لە چوار پارێزگاکەی تردا لە پاش دەوڵەتی یاساوە هاتووە و پێش لیستی عێراقییە کەوتووە.

٣. ئاستی دەنگی مامناوەند (٢٠ـــ٢٩٪): هەر سێ پارێزگای بەغدا (٢٢,١٥٪)، کەربەلا (٢٤,٥٪) و بەسرە (٢٩,١٪) دەگرێتەوە، نزمیی دەنگی هاوپەیمانیی نیشتیمانیی لە بەغدا و بەسرە دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزیی هەر دوو لیستی دەوڵەتی یاسا و عێراقیە، هەروەها هۆشیاریی دەنگدەری ئەم پارێزگایانە بەراورد بە پارێزگاکانی دیکە، لەوەی کەمتر لایەنگری لیستە مەزهەبییەکانن.

٤. ئاستی دەنگی نزم: پارێزگای دیالە دەگرێتەوە، کە تەنها (١٧٪) دەنگەکانی بە دەست هێناوە و سێ کورسیی بردووەتەوە، جێی ئاماژەیە ئەم هاوپەیمانییە پێش دەوڵەتی یاسا کەوتووە لە پارێزگای دیالە، بە جیاوازیی دوو کورسی.

٥. ئاستی دەنگی زۆر نزم: ئەو پارێزگایانە دەگرێتەوە کە ڕێژەی دەنگی لیستەکە لە (٥٪) کەمترە، حەوت پارێزگا دەگرێتەوە، کە بە پارێزگای کورد و سوننە ناسراوە، تەنها لە پارێزگای نەینەوا توانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن

تێپەڕێنێت و بە ڕێژەی (٣,٧٪)ی دەنگەکان کورسییەك بباتەوە. بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە خشتەی (٨).

خشتەی (٨)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی هاوبەندی نیشتیمانیی عێراقی

| ز | پارێزگا | دەنگ | مارکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهوك | 192 | ٤٢٤٧١ | 0 | 0,04 | هەرسێ پارێزگاکە (٠,٠٤٪) |
| ٢ | هەولێر | ٤٣١ | ٤٨٦٠١ | 0 | 0,06 | |
| ٣ | سلێمانی | ٢٠٥ | ٤٩٠٣٧ | 0 | 0,02 | |
| ٤ | نەینەوا | ٣٨٦٩٣ | ٣٤٠٣٦ | ١ | 3,67 | ١,٨٥ |
| ٥ | کەرکووك | ١٤٢٣٠ | ٤٦٣٦٥ | 0 | 2,56 | ٠,٦٨ |
| ٦ | سەلاحەدین | ٢٢٥٧٦ | ٤٠٧٣٩ | 0 | 4,62 | ١,٠٨ |
| ٧ | دیالە | ٨٥٨١٢ | ٣٨٦٨٤ | ٣ | 17,06 | ٤,١٠ |
| ٨ | بەغدا | ٥٦١٦٥٩ | ٣٧٣٧٩ | ١٧ | 22,10 | ٢٦,٨٠ |
| ٩ | ئەنبار | ٥٠٠٧ | ٣٣٧٥٧ | 0 | ١,٠٦ | ٠,٢٤ |
| ١٠ | واست | ١٢٩١٨٨ | ٣٤٣٦٦ | ٤ | 34,27 | ٦,١٦ |
| ١١ | بابل | ١٨٠١٩٣ | ٣٦٦٤٣ | ٥ | 30,73 | ٨,٦٠ |
| ١٢ | کەربەلا | ٨١٧٩٤ | ٣٣٣٤٣ | ٣ | 24,53 | ٣,٩٠ |
| ١٣ | نەجەف | ١٥٢٦٩٨ | ٣٤٢٨٥ | ٥ | 37,11 | ٧,٢٩ |
| ١٤ | قادسیە | ١٣٣٨١٢ | ٣٣٩٤٠ | ٥ | 35,84 | ٦,٣٩ |
| ١٥ | موسەنا | ٧١٦٩٩ | ٣٢٧٣٤ | ٣ | 31,29 | ٣,٤٢ |
| ١٦ | زیقار | ٢٤٤٨١٨ | ٣١٧٨٨ | ٩ | 42,79 | ١١,٦٨ |
| ١٧ | میسان | ١٣٥٣١٩ | ٢٧٢٨١ | ٦ | 49,60 | ٦,٤٦ |
| ١٨ | بەسرە | ٢٣٧٠١٠ | ٣٣٩٥٠ | ٥ | 29,09 | ١١,٣١ |
| | کۆی گشتی | ٢٠٩٥٣٣٦ | ٣٦٣٦١ | ٧٠=٢+٦٨ | ١٨,١٨ | ١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

دابەشبوونی ڕێژەیی دەنگی لیستی ئیئتیلافی نیشتیمانی عێراق لەسەر ئاستی پارێزگاکان
لەهەڵبژاردنی پارلەمانی عێراق 2010



أ. **هاوپەیمانیی کوردستان:**

پێکهاتووە لە هاوپەیمانی (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) لەگەڵ (١١) پارتی دیکە، کە گرنگترینیان حیزبی شیوعیی کوردستان، بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان، حیزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان، زەحمەتکێشان بە هەر دوو باڵەکەیەوە، لەگەڵ چەند لایەنێکی دیکەی کورد و تورکمان. هاوپەیمانیکردنی پارتی و یەکێتی لەگەڵ ئەم پارتانە تەنها بۆ ئەوە بوو سوود لە دەنگەکانیان وەر بگرن بۆ پاڵێوراوەکانی خۆیان، لە هەمان کاتدا ڕوویەکی نیشتیمانی ببەخشن بە هاوپەیمانییەکە، بەوەی (بە ژمارەی پارت) زۆرترین لایەنی کوردستانی لە ناو لیستەکەدا کۆبوونەتەوە، هەروەها لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردن ڕاگەیاندنی ئەم پارتانە دەکەونە خزمەتی لیستەکەوە و دژایەتیی لیستی هاوپەیمانیی ناکەن.

لە (١٤) پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد، بەڵام توانی تەنها لە شەش پارێزگادا کورسیی پەرلەمان بباتەوە.بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە خشتەی (٩).

لە پارێزگای دهۆك ڕێژەی (٧٨,٤٪)ی دەنگەکان و(٩) کورسی لە کۆی (١٠) کورسیی پارێزگاکە بردەوە، جێی سەرنجە سەرەڕای هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنەکانی تردا، بەراورد بە هەڵبژاردنی پێشوو (٢٠٠٩) بە ڕادەی (١٦٧٦٩) دەنگی کەم کردووە، بە ڕێژەی (٢,٤٪). ئەگەر بەراوردی دەنگی یەکێتی و پارتی بکەین لە نێوان (٢٠٠٩ بۆ ٢٠١٠) ئەوا بە ڕێژەی نزیکەی (٥٪) کەمی کردووە. لە لایەکی ترەوە ڕێژەی بەشداریی دەنگدەران بە ڕێژەی (١١,٥٣٪) کەمی کردووە، سەرەڕای بەشداریکردنی دەنگدەرانی دەرەوەی وڵات.

ئەم حاڵەتە لە لایەکەوە ئاماژەیە بۆ کەمبوونەوەی ساختەکارییەکانی پارتی لەم هەڵبژاردنە بەراورد بە هەڵبژاردنی پێشووی پەرلەمانی کوردستان، لە لایەکی ترەوە ئاماژەیەکە بۆ (تا ڕادەیەکی کەم) ئازادیی دەنگدەر لەم هەڵبژاردنەدا، بە بەڵگەی دابەزینی دەنگی هاوپەیمانیی کوردستان و زۆربوونی دەنگی ئۆپۆزسیۆن

(گۆڕان، کۆمەڵ و یەکگرتوو)، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، لە سەر ئاستی عێراق، پارێزگای دهۆك تاکە حاڵەتە، کە ئەم ڕێژە زۆرە لە دەنگەکانی بۆ یەك لیست و یەك پارتی سیاسی ڕۆشتبێت.

بە هەمان شێوە لە پارێزگای هەولێر، هاوپەیمانیی کوردستان ڕێژەیەکی بەرزی دەنگەکانی بە دەست هێناوە و گەیشتووەتە (٤٥٨٤٠٣) دەنگ، بە ڕێژەی (٦٧,٤٪)ی دەنگەکانی پارێزگاکە، (١٠) کورسیی لە کۆی (١٤) کورسی بردووەتەوە. بە پێچەوانەی دهۆك، بەراورد بە هەڵبژاردنی پێشوو (٢٠٠٩) دەنگی ئەم لیستە بە ڕێژەی (١,٤٤٪) بەرزبووەتەوە، بەڵام ئەم بەرزبوونەوەیە بە هۆی دەنگی لایەنەکانی دیکەوە بووە، نەك پارتی و یەکێتی، چونکە ڕێژەی دەنگی یەکێتی و پارتی تەنها (٦٣,٤٨٪) بووە لەم هەڵبژاردنەدا، لە کاتێکدا ئەم دوو پارتە لە هەڵبژاردنی (٢٠٠٩) ڕێژەی (٦٥,٩٣٪) دەنگەکانی پارێزگای هەولێریان بە دەست هێناوە.

لە پارێزگای سلێمانی دەنگی لیستی هاوپەیمانیی کوردستان دابەزیوە بۆ (٤٢٪) بە هۆی زۆریی دەنگی لایەنەکانی دیکە بە تایبەت گۆڕان و دوو پارتە ئیسلامییەکە. ئەگەر بەراوردی دەنگی یەکێتی و پارتی بکەین لە نێوان هەڵبژاردنی (٢٠٠٩ بۆ ٢٠١٠) دەبینین، دەنگی پاڵێوراوانی یەکێتی و پارتی لەم هەڵبژاردنەدا لە(٣٨,٣٣٪) تێناپەڕێت، لە کاتێکدا لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا (٣٦,٧٥٪)ی دەنگەکانیان بە دەست هێنابوو، واتە دەنگی پارتی و یەکێتی تەنها بە ڕێژەی (١,٥٨٪) زیادی کردووە[1]، بەڵام لەڕووی سیاسی و

---

(1)پاڵێوراوانی پارتەکانی دیکە لە لیستی هاوپەیمانیی کوردستان، بەم شێوەیە دەنگیان بۆ لیستەکە بە دەست هێنابوو:

١. بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، (٤٥٥٧) دەنگ بە ڕێژەی (٠,٥٥٪)ی کۆی دەنگی پارێزگای بە دەست هێنابوو.

٢. پاڵێوراوەکەی حیزبی شیوعیی کوردستان، (٤٧١٥) دەنگ بە ڕێژەی (٠,٥٦٪).

هاوکێشەی هەڵبژاردنەوە سوودیان لەو هاوپەیمانییە بینی بۆ بردنەوەی کورسییەکی زیاتری پارێزگای سلێمانی، بۆ نموونە، ئەگەر دەنگی هاوپەیمانەکانیان نەبووایە، کورسییەك کەمتریان دەبردەوە و گۆڕان کورسییەکی لەوەی ئێستا زیاتر دەبوو، واتە (٧) بە (٧) دەبوو، نەك (٦) بە (٨).

لە پارێزگای کەرکووك لیستی هاوپەیمانیی کوردستان ڕێژەی (٣٧,١٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، لە بەرامبەردا (٦) کورسی، واتە نیوەی کورسییەکانی پارێزگاکەی بردەوە، ئەگەر بەراوردی دەنگی هاوپەیمانی لەگەڵ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە (٢٠٠٥/١٢/١٥) بکەین دەبینین ڕێژەی دەنگی ئەم لیستە (١٦,٣٪) کەمی کردووە، بە هۆی بوونی لیستی گۆڕان کە (٦,٦٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، هەروەها یەکگرتووی ئیسلامی ڕێژەی (٤,٤٪) و کۆمەڵی ئیسلامی (١,٣٪)ی دەنگەکەنیان بە دەست هێناوە. لە لایەکی ترەوە عەرەبی کەرکووك بە گشتی لەگەڵ تورکمانەکاندا زۆر بە چڕی بەشداریی هەڵبژاردنەکەیان کرد، بە تایبەت بۆ دەنگدان بە لیستی عێراقیە، کە (٣٨٪)ی دەنگەکانی بردەوە. سەرکەوتنی لیستی هاوپەیمانیی کوردستان لە کەرکووك بەراورد بە لیستەکانی دیکەی کوردستان، بە تایبەت لیستی گۆڕان، چەند هۆکارێکی سەرەکیی هەیە:

یەکەمیان: بوونی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی لەو پارێزگایە، کە لە ڕێگەیەوە زۆرترین کەسیان لە دەوری حیزب و دامودەزگاکانی کۆکردووەتەوە.

---

٣.حیزبی سۆسیالسیت دیموکراتی کوردستان، کە پاڵێوراوەکەیان ڕێژەی (٧٨٦٨) دەنگی بە ڕێژەی (٠,٩٤٪).

٤. هەر دوو باڵەکەی زەحمەتکێشان، (٤٠٧٩) دەنگ بە ڕێژەی (٠,٤٩٪).

کەواتە ئەم چوار لایەنە، ڕێژەی (٢,٥٤٪)ی دەنگەکانی پارێزگای سلێمانییان بە دەست هێناوە، لەگەڵ ڕێژەی (١,١٥٪)ی دەنگدەرانی پارێزگای سلێمانی، کە تەنها دەنگیان بە لیستی هاوپەیمانیی کوردستان داوە و هیچ پاڵێوراوێکیان دەستنیشان نەکردوە.

دووەمیان: بارودۆخی ئاڵۆزی کەرکووک، کە بەردەوام لە ململانێی نەتەوەیی و سیاسی توند دایە، لەگەڵ حکومەتی ناوەند لە لایەك و عەرەب و توکمانەکانی کەرکووك لە لایەکی تر، وای کردووە دەنگدەری کوردی کەرکووك پاڵپشتی لەم دوو حیزبە بکەن، کە دەسەلأت و پێشمەرگە و دەزگای ئاسایشی کوردستانیان لە بەردەست دایە.

سێیەم: ئەنجامدانی ساختەکاری لە هەڵبژاردن بەبیانووی پاراستنی سەنگ و هێزی کورد بەرامبەر بە عەرەب و تورکمان.

چوارەم: سلوکی دەنگدەری کوردی کەرکووك هێشتا سلوکێکی نەتەوەییە، بەلأم گوتاری پارتە بەشدارەکانی دیکەی کوردستان لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردن نەتەوەیی نەبوو، بۆ نموونە ئیسلامییەکان گوتارێکی ئیسلامییانە و، گۆڕان جەختکردنەوە لە سەر گەندەڵی و خزمەتگوزاری و کەموکوڕیی یەکێتی و پارتی و کەسە باڵادەستەکانی یەکێتی.

لە پارێزگای نەینەوا لیستی هاوپەیمانی ڕێژەی (٢٢,٧٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێنا و، (٨) کورسیی بردەوە لە کۆی ٣١ کورسیی گشتیی پارێزگاکە، بە هەمان شێوەی کەرکووك لیستەکانی دیکەی کوردستان نەیانتوانی لەم پارێزگایە کورسی ببەنەوە، چونکە دەسەلأتی پارتی لە ناوچە کوردستانییەکانی پارێزگاکە دەسەلأتێکی ڕەهایە هاوشێوەی پارێزگای دهۆك.

لە پارێزگای دیالەلیستی هاوپەیمانی ڕێژەی (٩,٥٪)ی دەنگەکان و تەنها یەك کورسیی بردەوە، لە کاتێکدا لە هەڵبژاردنی خولی پێشووی پەرلەمانی عێراق دوو کورسیی لەم پارێزگایە بردەوە، دابەزینی ئاستی دەنگی هاوپەیمانی دوو هۆکاری هەیە، یەکەمیان: بەشداریی لیستی گۆڕان لەم پارێزگایە کە (١,٨٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، دووەمیان: بەشداریی فراوانی عەرەبەکان بە تایبەت عەرەبی سوننە، بەلأم ئەگەر دەنگەکانی کورد بە گشتی بە هەر سێ لیستەکەوە

(هاوپەیمانی، گۆڕان و یەکگرتوو) پێکەوەیش بۆ هاوپەیمانیی کوردستان ئەژمار بکرێن، ناگاتە ئاستی دوو کورسی، چونکە سوننەی عەرەب ئەمجارە زۆر بە چڕی لە دەنگدان دا بەشداری کردووە.

ئەگەر بەراوردێکی خێرای کورسییەکانی ئەم لیستە لەگەڵ خولی پێشووی پەرلەماندا بکەین، دەبینین لە (٥٣) کورسییەوە دابەزیوە بۆ (٤٣) کورسی، بە هۆی بردنەوەی (٨) کورسی لە سێ پارێزگاکە لە لایەن بزووتنەوەی گۆڕانەوە، جیابوونەوەی کۆمەڵی ئیسلامی لە هاوپەیمانییەکە، کە ئەویش دوو کورسیی بە دەست هێناوە.

**خشتەی (٩)**

**دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی هاوپەیمانیی کوردستان**

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکێڵکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهوك | ٣٣٢٩٥١ | ٤٢٤٧١ | ٩ | ٧٨,٣٩ | ١٩,٧٤ |
| ٢ | هەولێر | ٤٥٨٤٠٣ | ٤٨٦٠١ | ١٠ | ٦٧,٣٧ | ٢٧,١٨ |
| ٣ | سلێمانی | ٣٥٠٢٨٣ | ٤٩٠٣٧ | ٨ | ٤٢,٠٢ | ٢٠,٧٧ |
| ٤ | نەینەوا | ٢٣٩١٠٩ | ٣٤٠٢٦ | ٨ | ٢٢,٦٧ | ١٤,١٨ |
| ٥ | کەرکوك | ٢٠٦٥٤٢ | ٤٦٣٦٥ | ٦ | ٣٧,١٢ | ١٢,٢٥ |
| ٦ | سلاحەدین | ٢٢٦٧٦ | ٤٠٧٣٩ | 0 | ٤,٦٤ | ١,٣٤ |
| ٧ | دیالە | ٤٧٩٤٩ | ٣٨٦٨٤ | ١ | ٩,٥٣ | ٢,٨٤ |
| ٨ | بەغدا | ٢٣٢٦٣ | ٢٧٣٧٩ | 0 | ٠,٩١ | ١,٣٨ |
| ٩ | واست | ٩٥٥ | ٣٤٢٦٦ | 0 | ٠,٢٥ | هەرشەش پارێزگاکە (٪٠,٣٢) |
| ١٠ | بابل | ١٢٢٧ | ٣٦٦٤٣ | 0 | ٠,٢١ | |
| ١١ | نەجەف | ٥٣٨ | ٣٤٢٨٥ | 0 | ٠,١٣ | |
| ١٢ | قادسیە | ٨٤٩ | ٣٣٩٤٠ | 0 | ٠,٢٣ | |
| ١٣ | موسەنا | ١٤٥١ | ٣٢٧٣٤ | 0 | ٠,٦٣ | |
| ١٤ | زیقار | ٣٤٨ | ٣١٧٨٨ | 0 | ٠,٠٦ | |
| | کۆی گشتی | ١٦٨٦٥٤٤ | | ٤٢+١=٤٣ | ١٤,٦٣ | ١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

دابەشبوونی ڕێژەیی دەنگی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەسەر ئاستی پارێزگاکان
لەهەڵبژاردنی پارلەمانی عێراق 2010



**لیستی گۆڕان:**

لیستی گۆڕان لە هەشت پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد، (٤٨٧١٨١) دەنگی بە دەست هێنا، بەڵام تەنها لە دوو پارێزگا سەرکەوتوو بوو لە بردنەوەی کورسی، لە پارێزگای سلێمانی (٦) شەش کورسیی لە کۆی (١٧) کورسی و لە هەولێر (٢) کورسیی لە کۆی ١٤ کورسی.

لە **پارێزگای سلێمانی** لیستی گۆڕان (٢٩٨٦٢١) دەنگ و، ڕێژەی ٣٥،٨٪ ی کۆی دەنگەکانی پارێزگاکەی بە دەست هێنا، بە دووەم لیست هاتووە لە پاش لیستی هاوپەیمانیی کوردستان، کە ڕێژەی (٤٢٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە. لە کاتێکدا لیستی گۆڕان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٩/٧/٢٥) یەکەم لیستی پارێزگا بوو و ڕێژەی (٤٠،٧٪)ی دەنگەکانی پارێزگای سلێمانی بە دەست هێنابوو، واتە بە ڕێژەی (٤،٩٪) دەنگەکانی دابەزیوە. بە گشتی هۆکارەکانی دابەزینی ڕێژەی دەنگی گۆڕان دەگەڕێتەوە بۆ:

١. پەیڕەوکردنی سیستەمی لیستی کراوە، بەشێکی دەنگەکانی پێشووی لیستی گۆڕان، کە لە لایەن ئەندام و هەوادارانی یەکێتییەوە بۆی هاتبوو، ئەمجارەیان دەنگیان بۆ پاڵێوراوانی یەکێتی داوە، لە دژی پاڵێوراوانی پارتی.

٢. کارکردنی یەکێتی لە سەر دەنگدەرانی گۆڕان و گەڕانەوەی بەشێك لە کادیر و لایەنگرانی گۆڕان بۆ ڕیزەکانی یەکێتی.

٣. بە جیا بەشداریکردنی کۆمەڵ و یەکگرتوو، زۆریی کاندیدەکانیان لە سەرجەم ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی، هۆکارێکی گرینگ بوو بۆ ئەوەی بەشێك لە دەنگدەرانی پێشووی گۆڕان، ئەمجارەیان دەنگ بۆ پاڵێوراوی پارتە ئیسلامییەکان بدەن. لێرەدا ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بەئاشکرا ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت، بەوەی لیستی چاکسازی و خزمەتگوزاری لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا (١٢٨٧٩٣) دەنگی هەبوو، بە ڕێژەی (١٦،٦٢)ی دەنگەکانی

پارێزگـای سـلێمانی، بـەڵام لـەم هەڵبژاردنـەدا تـەنها دوو حیزبـە ئیـسلامییەکە (١٨٢٣٣٧) دەنگیـان بـە دەسـت هێنـاوە، بـە ڕێـژەی (٢١,٨٧٪)، واتـە ڕێـژەی دەنگـی ئـەم لیـستە بـە ڕادەی (٥,٤٥٪) زیـای کـردووە. لـە کاتێکـدا ئەگـەر دەنگەکانی حسك و زەحمەتکێشانیش بۆ دوو پارتە ئیسلامییەکە ئـەژمار بکـەین، زیادکردنی دەنگی ئەم دوو پارتە زۆر نزیکە لە هەمان ئـەو ڕێژەیـەی، کـە دەنگـی گۆڕان کەمی کردووە (٤,٩٪).

٤. لە هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردندا هەڵەو کـەموکورتی هـەبوون، بـەوەی تاڕادەیەکی زۆر هەمان پلانی هەڵمەتی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دووبـارە کرایەوە، لە کاتێکدا جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە لە نێوان ئەم دوو هەڵبژاردنەدا.

٥. جیاوازیی بۆچوونی دەنگدەر لە نێوان هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردسـتان و هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق، بەوەی لە عێراقدا دەسـکەوتێکی زۆر بـە دەسـت هاتووە لە ڕێگەی نوێنـەرانی (هاوپـەیمانیی کوردسـتان) لـە ڕابـردوودا، بـەڵام لـە ناوخۆدا گەندەڵی و کەموکوڕیی زۆر هەبوون لە ئیدارەی هەرێمدا.

لـە پارێزگـای هـەولێر لیـستی گـۆڕان لـە هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی عێراقـدا (١٠٣٣٩٧) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە ڕێـژەی (١٥,٢٪)ی دەنگـەکانی ئەم پارێزگایە، بەراورد بە هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی کوردسـتان دەنگـی گـۆڕان بـە ڕێژەی (٢٪)کەمی کردووە، لە بەرژەوەندیی دوو لیـستە ئیـسلامییەکەدا، چـونکە ئەم دوو لیستە بە ڕێژەی (٦,٣٤٪) دەنگەکانیان زیادی کردووە لە نێوان ئـەم دوو هەڵبژاردنەدا[1]. هۆکارەکانی کەمکردنی دەنگی لیستی گۆڕان لە پارێزگای هەولێر لە زۆر حاڵەتدا هاوشێوەی هۆکارەکانی پارێزگای سـلێمانین، بـە تایبـەت بـە جیـا بەشـداریکردنی پـاڵێوراوانی یـەکێتی بەرامبـەر بـە پـاڵێوراوانی پـارتی لـە لیـستی

---

(1) لە هەڵبژاردنی پێشوودا (١٠,٣٨٪)ی دەنگەکانیان بە دەست هێناوە لە پارێزگای هـەولێر بـە دەنگـەکانی حسك و زەحمەتکێشانیشەوە، بەڵام لەم هەڵبژاردنەدا (١٦,٧٢٪) ی دەنگەکانیان بە دەست هێناوە.

هاوپەیمانییدا، چونکە لە هەولێر ململانێی نێوان دەنگدەرانی یەکێتی و پارتی
ەوندترە، هەروەها ئەنجامدانی ساختەکاری لە قەزای کۆیە لە لایەن یەکێتییەوە
هۆکارێکی دیکەی کەمبوونەوەی دەنگی لیستی گۆڕانە.

**خشتەی (١٠)**

**دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی لیستی گۆڕان**

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆک | ٢٣٧٧٥ | ٤٢٤٧١ | 0 | ٥,٦٠ | ٤,٨٨ |
| ٢ | هەولێر | ١٠٣٣٩٧ | ٤٨٦٠١ | ٢ | ١٥,٢٠ | ٢١,٢٢ |
| ٣ | سلێمانی | ٢٩٨٦٢١ | ٤٩٠٣٧ | ٦ | ٣٥,٨٢ | ٦١,٣٠ |
| ٤ | نەینەوا | ١٠٧١٥ | ٣٤٠٢٦ | 0 | ١,٠١ | ٢,٢٠ |
| ٥ | کەرکووک | ٣٦٥٥٤ | ٤٦٣٦٥ | 0 | ٦,٥٧ | ٧,٥٠ |
| ٦ | سەلاحەدین | ٢٦٥٤ | ٤٠٧٣٩ | 0 | ٠,٥٤ | ٠,٥٤ |
| ٧ | دیالە | ٨٩٩٤ | ٣٨٦٨٤ | 0 | ١,٧٩ | ١,٨٥ |
| ٨ | بەغدا | ٢٤٧١ | ٣٧٣٧٩ | 0 | ٠,٠٩ | ٠,٥١ |
| | کۆی گشتی | ٤٨٧١٨١ | | ٨ | ٤,٢٣ | ١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

پێچەوانەی دوو پارێزگاکەی پێشوو، لە پارێزگای دهۆکدا ڕێژەی دەنگی گۆڕان بەرز بووەتەوە، بەڵام ئەم ڕێژەیە نەگەیشتە ئاستی تێپەڕاندنی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن، چونکە تەنها (٢٣٧٧٥) دەنگ بوو، بە ڕێژەی (٥,٦٪)ی دەنگدەرانی ئەم پارێزگایە، لە کاتێکدا لە هەڵبژاردنی پێشوو (٢٠٠٩)، تەنها (١٤٧٩٤) دەنگی بە دەست هێنابوو، بە ڕێژەی (٣,٤٥٪)ی دەنگەکانی پارێزگاکە.

باشبوونی دەنگی گۆڕان لە پارێزگای دهۆک دوو هۆکاری سەرەکیی هەیە:

یەکەم: شکاندنی ئەو ترسەی لە هەڵبژاردنی پێشوودا هەبوو، پاش ئەوەی لە سەر ئاستی هەرێم گۆڕان سەرکەوتنێکی بەرچاوی بە دەست هێنا.

دووەم: بوونی کاندیدی زۆر لەنێو خەڵکی پارێزگاکە، کە هەر کاندیدە خاوەنی کۆمەڵێك پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و خزمایەتی و عەشایەرییە، و ئەم پەیوەندییانە کاریگەریی ئیجابی هەبووە بۆ دەنگدان بە گۆڕان.

ئەو پارێزگایانەی دیکەی عێراق کە لیستی گۆڕان بەشداریی تێدا کردووە، دەکرێت پۆلێن بکرێت بۆ دوو گروپ:

یەکەمیان ئەو پارێزگایانەی ئەستەمە گۆڕان کورسیی تێدا بباتەوە، چونکە رێژەی کورد تێیدا زۆر کەمە، نموونەی بەغدا و سەلاحەدین، کە لیستی هاوپەیمانیش کورسیی تێدا نەبردووتەوە.

دووەمیان ئەو پارێزگایانەی دەکرا کورسیی تێدا ببرێتەوە، کەرکووك و نەینەوا و دیالە، لیستی گۆڕان لە پارێزگای دیالە (٨٩٩٤) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە (١,٨٪)ی دەنگی پارێزگاکە، رێژەی (١٥٪)ی دەنگی لیستە کوردستانییەکانی پارێزگاکە. زاڵبوونی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی بە سەر دامودەزگاکانی قەزای خانەقین و ئەنجامدانی ساختەکاری لە لایەن یەکێتییەوە، و ترسی دەنگدەران لە لێپرسینەوە لەگەڵیان هۆکارێکی سەرەکیی کەمیی دەنگی گۆڕانە لەم پارێزگایە، زۆربەی ئەو دەنگانەیشی کە لیستەکە بە دەستی هێناون لە لایەن ئەو دەنگدەرانەوە بووە کە لە قەزای کەلار نیشتەجێن، بەڵام لە خانەقین دەنگ دەدەن.

لە پارێزگای نەینەوا (١٠٧١٥) دەنگی بە دەست هێناوە بە رێژەی (١٪)ی دەنگی پارێزگاکە و رێژەی (٤,٢٪)ی دەنگی لیستە کوردستانییەکان، هەژموونی دەسەڵاتی پارتی بە سەر ئەم ناوچانە و نەگەیشتنی پەیامی لیستی گۆڕان بۆ دەنگدەران، بە تایبەت لەبەرئەوەی کوردی ئەم ناوچانە بە زاراوەی بادینی دەدوێن، لە هۆکارە سەرەکییەکانی کەمیی دەنگی گۆڕانن لە نەینەوا.

باشترین زەمینە لە پارێزگای کەرکووکدا هەبوو بۆ ئەوەی لیستی گۆڕان لانی کەم کورسییەك بباتەوە، بەڵام تەنها (٣٦٥٥٤) دەنگی بە دەست هێناوە بە ڕێژەی (٦,٦٪) دەنگەکان و، نەگەیشتە ئاستی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن، چەند هۆکارێك بوونە هۆی نەبردنەوەی کورسی لە کەرکووك گرینگترینیان:

١. بوونی ململانێی نەتەوەیی نێوان کورد و عەرەب و تورکمان پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی دەنگدەرانی کورد پەنا بەرنە بەر ئەو هێزەی کە دەتوانێت لەم ململانێیەدا پشتیوانییان بکات، ئەوەیشیان لە یەکێتی و پارتیدا دەبینییەوە، بە هۆی دەسەڵاتی پێشمەرگە و ئاساییش و..تاد. یەکێتی و پارتیش بە گوتارێکی نەتەوەییانە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەیان ئاراستە کرد.

٢. لە بەرامبەردا بزووتنەوەی گۆڕان جەختی لە سەر کەموکوڕییەکانی یەکێتی و پارتی، لەگەڵ کەمیی خزمەتگوزارییەکان دەکردەوە، لە کاتێکدا باشتر وابوو جەختی لە سەر کەموکورتییەکانی حکومەتی ناوەند وشۆڤێنیەتی عەرەب و تورکمان بکردایەتەوە.

٣. پاڵێوراوانی بزووتنەوەی گۆڕان هاوشێوەی پاڵێوراوەکانی یەکێتی کەسایەتیی ناسراو و بەهێز نەبوون، ئەو کەسانەیشی سەرپەرشتیی بزووتنەوەکەیان دەکرد لە کەرکووك بە هەمان شێوە کەسایەتیی ویستراو نەبوون لای جەماوەری کەرکووك.

٤. بەهۆی زاڵبوونی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی بە سەر دامودەزگاکاندا، خەڵکی کەرکووك ئازاد نەبوون لەوەی بە ئارەزووی خۆیان پەیوەندی بە گۆڕانەوە بکەن.

٥. ئینتیمای مام جەلال بۆ شاری کەرکووك و بوونی هەژموونی یەکێتی لە پارێزگاکە هۆکارێکی دیکە لایەنگیریی دەنگدەران بۆ یەکێتی لە بەرامبەر پارت و لیستەکانی دیکەدا.

و. **لیستەکانی تر:**

چوار لیستی دیکە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا توانیان کورسی ببەنەوە، دووانیان عەرەبی و دووانەکەی تریان کوردی بوون:

- لیستە کوردستانییەکان:

دوو پارتی ئیسلامی لە کوردستاندا توانیان سەر بکەون لەم هەڵبژاردنەدا، یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، لە سەر ئاستی عێراق، (٢٤٧٣٦٦) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە (٢,١٥٪)ی دەنگەکان، لە کاتێکدا لە هەڵبژاردنی خولی پێشوودا (١,٢٩٪)ی دەنگەکانی عێراقی بە دەست هێنابوو. لە حەوت پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد، بەڵام تەنها لە سێ پارێزگاکەی هەرێم چوار کورسیی بردەوە، دوو کورسی لە سلێمانی و کورسییەك لە هەر یەك لە هەولێر و دهۆك.

لە پارێزگای دهۆك دووەم دەنگی هێناوە بە رێژەی (١٤,١٪)ی دەنگەکان، بەڵام تەنها یەك کورسیی بردووەتەوە، لە پارێزگای سلێمانی سێیەم دەنگی هێناوە بە رێژەی (١٢,٤٪)ی دەنگەکانی پارێزگاکە، بەڵام لە هەولێر تەنها (٧,٥٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە و بە چوارەم لیست هاتووە.

لەسەر ئاستی عێراق، پارێزگای سلێمانی باشترین ناوچە بووە بۆ یەکگرتووی ئیسلامی، چونکە رێژەی (٤١,٧٪)ی کۆی دەنگەکانی یەکگرتوو لەم پارێزگایەدا بە دەست هاتووە، ئەم حاڵەتە چەند هۆکارێکی هەیە، گرینگترینیان ئینتیمای سەرکردەکانی یەکگرتووە بۆ ئەم پارێزگایە، بە تایبەت ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە و ناو شاری سلێمانی و، ئازادیی کارکردنیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، بەراورد بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتی، لە شانزە ساڵی رابردوودا.

جێی سەرنجە، ئەگەرچی ئەم پارتە لە پارێزگای کەرکوك کورسیی نەبردووەتەوە، بەڵام ڕێژەی (٤,٤٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، بەراورد بە هەڵبژاردنی ڕابردووی ساڵی ٢٠٠٥، بە ڕێژەی (١,٠٪)دەنگەکانی زیادی کردووە، واتە ئەم پارتە لەم ماوەیەدا گەشەیەکی بەرچاوی کردووە، بەڵام بە بڕوای ئێمە زۆریی ژمارەی کاندیدەکان و پەیڕەوکردنی سیستەمی لیستی نیمچەکراوە، هۆکارێکی سەرەکیی بەرزبوونەوەی ڕێژەی دەنگەکانی ئەم پارتەیە.

ئەگەر بەراوردی دەنگی یەکگرتوو، بکەین لە نێوان هەڵبژاردنی پارێزگاکانی سەرەتای ساڵی (٢٠٠٥) لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەدا، دەبینین لە هەر سێ پارێزگاکە ڕێژەی دەنگەکانی بەرزبووەتەوە، لە سلێمانی بە ڕێژەی (٢,١٣٪) لە هەولێر بە ڕێژەی (٤,٠٢٪) ولە دهۆك بە ڕێژەی (٤,٨١٪) دەنگەکانی زیادی کردووە، کەواتە بە گشتی ئەم پارتە لە گەشەکردندایە، بەڵام لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتی گەشەی زیاتری کردووە، بەراورد بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، چونکە لە ساڵانی ڕابردوودا (پێش ٢٠٠٥) ئازادیی کارکردنیان زۆر بەرتەسك بوو، بەراورد بەم چەند ساڵەی دوایی، بە تایبەت پاش هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٩).

پشت بە ستن بە گوتاری ئایینی لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردن و کاندیدکردنی کەسایەتی و سیمبولە ئایینییەکان، لەگەڵ وازهێنان لە بەشداریکردن لە حکومەتی هەرێم و چوونە بەرەی ئۆپۆزسیۆنەوە، دوو سەرەکیترین هۆکارەکانی گەشەکردنی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانە لەم هەڵبژاردنەی دواییدا.

خشتەی (١١)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | دهوك | ٥٩٩٦٩ | ٤٢٤٧١ | ١ | ١٤,١٢ | ٢٤,٢٤ |
| ٢ | هەولێر | ٥١٠٦٥ | ٤٨٦٠١ | ١ | ٧,٥٠ | ٢٠,٦٤ |
| ٣ | سلێمانی | ١٠٣١٨٨ | ٤٩٠٣٧ | ٢ | ١٢,٣٨ | ٤١,٧١ |
| ٤ | نەینەوا | ٥٤٧٤ | ٣٤٠٢٦ | 0 | ٠,٥٢ | ٢,٢١ |
| ٥ | کەرکووك | ٢٤٢٤٧ | ٤٦٣٦٥ | 0 | ٤,٣٦ | ٩,٨٠ |
| ٦ | دیالە | ٢٣١٠ | ٣٨٦٨٤ | 0 | ٠,٤٦ | ٠,٩٣ |
| ٧ | بەغدا | ١١١٣ | ٣٧٣٧٩ | 0 | ٠,٠٤ | ٠,٤٥ |
|  | کۆی گشتی | ٢٤٧٣٦٦ |  | ٤ | ٢,١٥ | ٩٩,٩٨ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

- کۆمەڵی ئیسلامی لە کوردستان:

لە پێنج پارێزگادا بەشداری کرد، بە گشتی (١٥٣٤٦٠) دەنگی بە دەست هێنا، بەڵام تەنها لە هەر دوو پارێزگای هەولێر و سلێمانی، توانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن تێپەڕێنێت و لە هەر یەکەیان کورسییەك بباتەوە. لە پارێزگای هەولێر کاندیدکردنی خودی (عەلی باپیر) ئەمیری گشتیی کۆمەڵی ئیسلامی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە سەر بەرزکردنەوەی ئاستی دەنگەکانی لیستەکە، لە کاتێکدا کۆمەڵی ئیسلامی تەنها ڕێژەی (٢,٩٪) دەنگەکانی پارێزگای هەولێری بە دەست هێنابوو، لە هەڵبژاردنی پارێزگاکانی ساڵی (٢٠٠٥)دا، بەڵام لەم هەڵبژاردنەدا (٩,٢٪) دەنگەکانی بردووەتەوە، واتە بە ڕێژەی (٦,٣٪) دەنگەکانی زیادی کردووە و تەنها بەڕێز (عەلی باپیر) (٥٠١١٦) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە ڕێژەی (٧٩,٩٪)ی دەنگەکانی نێو لیستەکەی.

لە پارێزگای سلێمانی ڕێژەی (٩,٥٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، بەراورد بە ساڵی (٢٠٠٥) تەنها بە ڕێژەی (٢,٢٣٪) دەنگەکانی زیادی کردووە. بەڵام ڕێژەی دەنگەکانی لە پارێزگای دهۆک لە ئاستێکی زۆر نزم دایە و تەنها (٠,٧٤٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە.

هەمان ئەو هۆکارانەی بوون بە هۆی گەشەکردنی یەکگرتووی ئیسلامی، دەکرێت بۆ گەشەکردنی ئاستی دەنگەکانی کۆمەڵی ئیسلامییش هەر وا بێت، چونکە ئەم پارتەیش پێشتر لە حکومەتدا بەشداربوو، پاشان بەرەی ئۆپۆزسیۆنی هەڵبژارد، هەروەها کەسایەتییە ئایینییەکانی کاندید کرد بۆ پەرلەمان.

خشتەی (١٢)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان / عێراق

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دهۆک | ٣١٤١ | ٤٢٤٧١ | – | ٠,٧٤ | ٢,٠٤ |
| ٢ | هەولێر | ٦٢٧٠٦ | ٤٨٦٠١ | ١ | ٩,٣٢ | ٤٠,٨٥ |
| ٣ | سلێمانی | ٧٩١٤٩ | ٤٩٠٣٧ | ١ | ٩,٤٩ | ٥١,٥٥ |
| ٤ | نەینەوا | ١٤٦٩ | ٣٤٠٢٦ | – | ٠,١٤ | ٠,٩٥ |
| ٥ | کەرکووک | ٧١٧٥ | ٤٦٣٦٥ | – | ١,٢٩ | ٤,٦٧ |
|  | کۆی گشتی | ١٥٣٤٦٠ |  | ٢ | ١,٣٣ | ١٠٠,٠ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

- لیستی التوافق العراقي:

لەم هەڵبژاردنەدا بە ناوی (التوافق العراقي) بەشداری کرد، ئەم بەرەیە پێکهاتووە لە چوار لایەن، گرینگترین و بەهێزترینیان، حیزبی ئیسلامیی عێراقییە بە سەرۆکایەتیی (ئەیاد سامەرائی) و (التجمع الوطني العشائري

المستقل) به سەرۆکایەتیی (عمر هیجل محمد) کە گردبوونەوەیەکی عەشایەریی عەرەبی سوننەیە، پێك هاتووە لە یەکگرتنی (١٢٩) عەشیرەتی عەرەب، لەگەڵ پارتی عەدالەی تورکمانی و (التجمع الوطني لأهل العراق) کە دوو لایەنی لاوازی نێو هاوپەیمانییەکەن.

ئەم هاوپەیمانییە لە نۆ پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد، بەڵام تەنها لە چوار پارێزگادا توانی کورسی بباتەوە، بە گشتی (٣٠٣٤٥٠) دەنگی بە دەست هێناوە، کە دەکاتە (٢,٦٣٪)ی کۆی دەنگدەرانی عێراق، لە بەرامبەردا تەنها (٦) کورسیی بردووەتەوە، کە دەکاتە (١,٨٥٪)ی کورسییەکانی پەرلەمان.

بەرزترین ڕێژەی دەنگەکانی لە پارێزگای سەلاحەدیندا هێناوە، بە ڕێژەی (١٢,٣٪)ی دەنگەکانی پارێزگاکە، پاشان پارێزگای ئەنبار دێت، بە ڕێژەی (١١,٩٪)ی دەنگەکان، لە هەر یەکەیان دوو کورسیی بردووەتەوە، لە پارێزگای نەینەوا ڕێژەی (٦,١٪)ی دەنگەکان و لە بەغدا ڕێژەی (٢,١٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە و لە هەر یەکەیان کورسییەکی بردووەتەوە.

بە گشتی ئاستی جەماوەریی بەرەی تەوافوق دابەزینێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، چونکە لە هەڵبژاردنی خولی پێشوودا (٤٤) کورسیی پەرلەمانی بردووەتەوە، هەروەها ڕێژەی (١٥,١٪) دەنگەکانی هێناوە لە سەر ئاستی عێراق، هۆکاری سەرەکیی ئەم پاشەکشێیە دەگەڕێتەوە بۆ:

١. جیابوونەوەی بەرەی تاریق هاشمی لە حزبی ئیسلامی و ڕاگەیاندی لیستێکی نوێ بە ناوی (لیستی تەجدید) و هاوپەیمانیکردنی لەگەڵ عێراقیە.

٢. هەروەها جیابوونەوەی (مجلس الحوار الوطني ـ خەلەف علەیان) و پەیوەندیکردنی بە لیستی (هاوپەیمانی یەکێتیی عێراق) بە سەرۆکایەتیی جواد پۆلانی.

٣. گۆڕانی ئاراستەی دەنگدەری سوننەی عێراق، لە پشتگیریکردنی ڕەوتی ئاینی میانڕەوەوە بۆ پشتگیریکردنی ڕەوتێکی عەرەبی نەتەوەیی، پاش ئەوەی کە حیزبی ئیسلامی نەیتوانی نوێنەرایەتیی خواستەکانی عەرەبی سوننە بکات لە بەرەنگاربوونەوەی هەژموونی شیعەگەرایی.

٤. گردبوونەوەی بەشی هەرە زۆری پارتەکانی سوننەی عەرەب لە لیستی عێراقییە، متمانەی دەنگدەری سوننەی گۆڕی بە ئاراستەی عێراقییە، بەوەی ئەو هێزە گەورەیەیە کە لە توانایدایە خواستە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانیان بهێنێتەدی، هاوکات لەگەڵ ئەو پاڵپشتە مادی و مەعنەوییەی لە وڵاتانی عەرەبییەوە لە عێراقییە دەکرا.

خشتەی (١٣)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی تەوافوقی عێراقی

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | نەینەوا | ٦٤٢٠٤ | ٣٤٠٢٦ | ١ | ٦,٠٩ | ٢١,١٦ |
| ٢ | کەرکووک | ١٧٢٣٦ | ٤٦٣٦٥ | – | ٣,١٠ | ٥,٦٨ |
| ٣ | سلاحەدین | ٦٠٢١٤ | ٤٠٧٣٩ | ٢ | ١٢,٣٢ | ١٩,٨٤ |
| ٤ | دیالە | ٢٥١٢٥ | ٢٨٦٨٤ | – | ٥,٠ | ٨,٢٨ |
| ٥ | ئەنبار | ٥٦١٧١ | ٣٧٣٧٩ | ٢ | ١١,٨٩ | ١٨,٥١ |
| ٦ | بەغدا | ٥٣٤١٣ | ٣٣٧٥٧ | ١ | ٢,١٠ | ١٧,٦٠ |
| ٧ | بابل | ٩٠١٣ | ٣٦٦٤٣ | – | ١,٥٤ | ٢,٩٧ |
| ٨ | موسەنا | ٧١٣ | ٣٢٧٣٤ | – | ٠,٣١ | ٠,٢٣ |
| ٩ | بەسرە | ١٧٣٦١ | ٣٣٩٥٠ | – | ٢,١٣ | ٥,٧٢ |
|  | کۆی گشتی | ٣٠٣٤٥٠ |  | ٦ | ٢,٦٣ | ٩٩,٩٩ |

سەرچاوە: نوێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

- هاوپەیمانیی یەکێتیی عێراق:

جواد بۆلانی کە کەسایەتییەکی شیعەیە و، وەزیری ناوخۆی حکومەتی پێشووی عێراق بووە، سەرۆکایەتیی ئەم هاوپەیمانییە دەکات، پێکهاتووە لە (٣٨) قەوارەی سیاسی و کەسایەتیی سەربەخۆ، کە مۆرکی عەرەبی سوننە زاڵە بە سەر پێکهاتەکەیدا. گرینگترین باڵەکانی نێو ئەم یەکێتییە، بریتییە لە کۆنگرەی سەحوەی عێراق، بە سەرۆکایەتیی ئەحمەد ئەبوریشە، سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی عێراق مەحمود مەشهەدانی، سەرۆکی دیوانی وەقفی سوننی ئەحمەد عەبدولغەفور سامەڕایی، لەگەڵ چەندین لایەنی دیکەی عەرەبی سوننە.

لە (١٤) پارێزگادا بەشداریی هەڵبژاردنەکەی کرد و، ڕێژەی (٢,٧٣٪)ی دەنگەکانی عێراقی بە دەست هێنا، بەلام تەنها لە سێ پارێزگادا توانی هاوکۆلکەی هەڵبژاردن تێپەڕێنێت و چوار کورسی بباتەوە. لە پارێزگای سەلاحەدین (١٠,٨٪)ی دەنگەکان و دوو کورسیی بردووەتەوە، لە هەر یەك لە نەینەوا و ئەنباریش یەك کورسیی بردووەتەوە، ئەم لیستە گەورەترین زەرەرمەندی یاسای هەڵبژاردنەکە بوو، چونکە لە چەندین پارێزگادا لە نێوان (١٩) بۆ (٣٣) هەزار دەنگی بە دەست هێناوە، بەلام کورسیی نەبردووەتەوە.

لاوازیی ئەم لیستە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جەماوەرەکەی لەنێو عەرەبی سوننەدایە، بەلام لەنێو ئەم جەماوەرەدا دەنگدەران بە شێوەیەکی سەرەکی پاڵپشتی لیستی عێراقیەیان کردووە پاش ئەویش بەرەی تەوافوق.

پاش ڕاگەیاندنی ئەنجامەکان هەر دوو لیستی یەکێتیی عێراق و تەوافوق هاوپەیمانییەکیان بەست بە ناوی هاوپەیمانی (وەسەت) بۆ ئەوەی بە سەنگێکی زیاترەوە بەشداریی لە دانوستانەکانی پێکهێنانی حکومەتدا بکەن.

خشتەی (١٤)

دابەشبوونی ژمارەیی و ڕێژەیی دەنگ و کورسییەکانی هاوپەندیی یەکێتیی عێراق

| ژ | پارێزگا | دەنگ | هاوکۆلکەی هەڵبژاردن | کورسی | ڕێژەی لە دەنگی پارێزگاکە | ڕێژەی لە دەنگی لیستەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەینەوا | ٥٣٨٩٧ | ٢٤٠٢٦ | ١ | ٥,١١ | ١٧,١٢ |
| ٢ | سەلاحەدین | ٥٢٩٤٢ | ٤٠٧٢٩ | ٢ | ١٠,٨٣ | ١٦,٨٢ |
| ٣ | دیالە | ٦٩٨٠ | ٣٨٦٨٤ | – | ١,٠٤ | ٢,٢٢ |
| ٤ | ئەنبار | ٤٣٢٢٤ | ٣٣٧٥٧ | ١ | ٩,١٤ | ١٣,٧٣ |
| ٥ | بەغداد | ٣٢٩٢٤ | ٣٧٢٧٩ | – | ١,٣٠ | ١٠,٤٦ |
| ٦ | واست | 19201 | ٣٤٢٦٦ | – | ٥,٠٩ | ٦,١٠ |
| ٧ | بابل | ١٦٨٣٦ | ٣٦٦٤٣ | – | ٢,٨٧ | ٥,٣٥ |
| ٨ | کەربەلا | ١١١٣٥ | ٣٣٣٤٣ | – | ٣,٢٤ | ٣,٥٣ |
| ٩ | نەجەف | ٧٧٥٢ | ٣٤٢٨٥ | – | ١,٨٨ | ٢,٤٦ |
| ١٠ | قادسیە | ١٢٨٤٢ | ٣٣٩٤٠ | – | ٣,٤٤ | ٤,٠٨ |
| ١١ | موسەننا | ٢١٧٣٨ | ٣٢٧٧٤ | – | ٩,٤٩ | ٦,٩٠ |
| ١٢ | زیقار | ٢٠٤١٩ | ٣١٧٨٨ | – | ٣,٥٧ | ٦,٤٨ |
| ١٣ | میسان | ٥٢٩٦ | ٢٧٢٨١ | – | ١,٩٤ | ١,٦٨ |
| ١٤ | بەسرە | ٩٦٣٧ | ٣٣٩٥٠ | – | ١,١٨ | ٣,٠٦ |
|  | کۆی گشتی | ٣١٤٨٢٣ |  | ٤ | ٢,٧٣ | ٩٩,٩٩ |

سەرچاوە: توێژەر بە پشت بەستن بە داتاکانی کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق.

## ٥: دە یەکەمین کاندیدی براوەی هەڵبژاردن:

لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، سیستەمی نوێنەرایەتیی ڕێژەیی بە لیستی نیمچەکراوە پەیڕەو کرا، واتە لە پاڵ دەنگدان بە لیست، دەنگدەر بۆی هەبوو دەنگ بە پاڵێوراوێکیش بدات. لە سەر ئاستی عێراق چەند کەسایەتییەك توانیان لە دە پلەی یەکەمدا بن، وەك لە خشتەی ژمارە (١٥) دا ڕوون کراوەتەوە.

بە گشتی دەتوانین ئەم تێبینییانە لەبارەی ئەو دە کەسەوە بخەینە ڕوو:

[1]. لەو دە کەسەدا یەك تورکمان و دوو کورد و حەوت عەرەبیان تێدایە، چوار لە عەرەبەکان شیعە و سیانیشان سوننەن، ئەگەر چی عەلاوی بە مەزهەب شیعەیە، بەڵام بە زۆری دەنگی سوننەی بە دەست هێناوە.

[2]. کەسایەتییە عەرەبەکان، یان ئێستا لە دەسەڵاتدان یان پێشتر لە دەسەڵاتدا بوون، نموونەی نوری مالیکی، ئەیاد عەلاوی، تاریق هاشمی، ئیبراهیم جەعفەری و ئەوانی تر.

[3]. پێنج کەسیان لەنێو لیستی عێراقیەدا بوون، لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی: یەکەمیان بۆ بردنەوەی دەنگی زیاتر، سەرانی پارتەکان و سەرکردەکان خۆیان کاندید کردووە لەنێو لیستەکەدا. دووەمیان: لە هەر پارێزگایەکدا یەکێك لە سەرکردەکانی عێراقیە خاوەنی جەماوەر و کەسایەتی و پارتی خۆیەتی، نموونەی ئوسامە نوجێفی لە نەینەوا، ڕافع عیساوی لە ئەنبار، ئەرشەد سالحی لە کەرکووك.

[4]. لە کوردستان سەرکردەی پارتەکان خۆیان کاندید نەکرد لەنێو لیستەکاندا، ئەگینا ئەگەری زۆر هەبوو لە ڕیزبەندی ئەو دە کەسەدا بوونایە، هەر بۆ نموونە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی، کە بچوکترین پارتی براوەی عێراق و کوردستانە، لە سەر پارێزگای هەولێر کاندید بوو، یەکەم دەنگی لە نێوان پاڵێوراوانی هەولێر و یازدەیەمین کەسی عێراق بوو.

[5]. زۆریی ڕێژەی دەنگی کەسایەتییە عێراقییەکان، بە تایبەت لە سەر ئاستی پارێزگای بەغدا کە (١٤٠١٣٣٦) دەنگ، بە ڕێژەی (٥٥,١٪)ی کۆی دەنگدەرانی بەغدا، تەنها بۆ پێنج کەسایەتی ڕۆشتووە، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەوەی دەنگدەر زیاتر بە ئاراستەی سیمبولەکان و کەسایەتییە سیاسییە ناسراوەکان دەنگ دەدات، سەرەڕای ئەو هەموو ململانێ سیاسی و گەندەڵییەی لە عێراقدا و لە سایەی ئەم سەرکردانەوە هاتووەتە ئاراوە.

پرسیارەکە بۆ بزووتنەوەی گۆڕان ئەوەیە، ئایا ئەگەر (کاك نەوشیروان مستەفا) لە ئاستی پارێزگای سلێمانی خۆی کاندید بکردایە، لیستی گۆڕان دەنگی زیاتری دەهێنا یان هەر دەنگەکانی نێو لیستەکە بۆ ئەو دەچوو ؟؟!

**خشتەی (١٥)**

**دەنگی دە پاڵێوراوی یەکەمی عێراق لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران (٢٠١٠)**

| ز | پاڵێوراو | هاوپەیمانی | پارت | پارێزگا | ژ. دەنگ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | نوری مالیکی | دەوڵەتی یاسا | سەرۆکی دەعوەی ئیسلامی | بەغدا | ٦٢٢٩٦١ |
| ٢ | ئەیاد عەلاوی | عێراقیە | سەرۆکی بزووتنەوەی ویفاقی نیشتیمانی | بەغدا | ٤٠٧٥٣٧ |
| ٣ | ئوسامە نوجێفی | عێراقیە | سەرۆکی گردبوونەوەی عێراقیونی نیشتیمانی | ئەینەوا | ٢٧٤٧٤١ |
| ٤ | تاریق هاشمی | عێراقیە | سەرۆکی لیستی نوێبوونەوە (تجدید) | بەغدا | ٢٠٠٩٦٣ |
| ٥ | ئیبراهیم جەعفەری | ئیئتیلافی نیشتیمانی | سەرۆکی تەیاری چاکسازیی نیشتیمانی | بەغدا | ١٠١٠٥٣ |
| ٦ | لەتیف مستەفا | گۆڕان | گۆڕان | سلێمانی | ٩٣١٦٩ |
| ٧ | ڕافع عیساوی | عێراقیە | گردبوونەوەی ئایندەی نیشتیمانی | ئەنبار | ٨٣١٤٥ |
| ٨ | بەیان جەبر ئەلزوبەیدی | ئیئتیلافی نیشتیمانی | سەرکردە لە ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی | بەغدا | ٦٨٨٢٢ |
| ٩ | خالید شوانی | هاوپەیمانیی کوردستان | سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان | کەرکووك | ٦٨٥٢٢ |
| ١٠ | ئەرشەد ڕەشاد سالحی | عێراقیە | بەرەی تورکمانی | کەرکووك | ٥٩٧٣٢ |

**دەرەنجام:**

أ. سەبارەت بە عێراق:

١. ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە بە واقیعی گەڕانەوەیەکی بەهێزی عەرەبی سوننەی دەرخستووە، هەر سێ لیستی (عێراقیە، تەوافوق و یەکێتیی عێراق) نزیکەی یەك لە سەر سێی کورسییەکانی پەرلەمانی عێراقیان بردووەتەوە، لە کاتێکدا عەرەبی سوننە، لە باشترین خەمڵاندندا، ناگاتە یەك لە سەر چواری عێراق. ئەم زیادکردنە لە سەنگی سوننەی عەرەب لە لایەکەوە لە سەر حسابی سەنگی کورد بووە، لە لایەکی ترەوە سوننە سەرکەوتووبوون لە ڕاکێشانی تورکمان بۆ بەرەی خۆیان، هەروەها بردنەوەی بەشێك لە کورسییەکانی پارێزگا شیعەنشینەکان لە ڕێگەی پارتەکەی عەلاوی و هاوپەیمانەکانیەوە، بۆیە چاوەڕوان دەکرێت ململانێی هەرێم لەگەڵ ناوەند ئاڵۆزتر و توندتر بێت، بە تایبەت پاش ئەوەی عێراقییە و باڵی توندڕەوی شۆڤێنیی ناو عێراقیە لە حکومەتی نوێدا کاریگەرانە بەشدار بوون.

٢. ئاراستەی دەنگدان لە ناوەندی عەرەبی شیعەدا بۆ هاوپەیمانییەکەی مالیکی تا دێت بەهێزتر دەبێت، لە هەڵبژاردنی پارێزگاکاندا (٢٠٠٩)، دەوڵەتی یاسا (١٩٪)ی دەنگەکانی ئەو چواردە پارێزگایەی بە دەست هێنا، کە هەڵبژاردنی تێدا ئەنجام درا، بەڵام لەم هەڵبژاردنەدا، ئەگەر هەر ئەو چواردە پارێزگایە ئەژمار بکەین، دەبینی ڕێژەی دەنگەکانی بەرزبووەتەوە بۆ (٣١٪)ی کۆی دەنگدەرانی ئەو چواردە پارێزگایە، کەواتە لیستی دەوڵەتی یاسا و خودی مالیکی بەهێزترین هاوپەیمانییە لە سەر ئاستی عێراق. بە واتایەکی تر تا دێت پارتە ئایینییەکان و گوتاری ئایینی لەنێو دەنگدەرانی عەرەبدا بەرەو لاوازبوون دەڕوات، ئەگەر گوتار و ئاڕاستەی سیاسیی مالیکی بە غەیرە ئایینی ئەژمار بکەین. لەبەرئەوەی دەستووری عێراق ماوەی خولی سەرۆکایەتی بۆ ئەنجومەنی وەزیران دیاری

نەكردووە، پێدەچێت هێزە عەرەبەكانی شیعە لە ژێر سایەی مالیكیدا كۆ ببنەوە، بە تایبەت پاش ڕازیكردنی زۆربەی لایەنەكانی ئیئتیلافی نیشتیمانی و، هەستكردن بە خەتەری بەهێزبوونی سوننە، پاش ئەوەی لیستی عێراقییە و هەموو لایەنە سوننییەكان هاتنەوە نێو گۆڕەپانی سیاسیی عێراق.

٣. بەهێزبوونی هەر دوو بەرەی شیعە و سوننە لەم هەڵبژاردنەدا، دواتر لە پێكهاتە و بڕیارەكانی حكومەتدا ڕۆڵی كورد لاواز دەكات، لە خولی پێشوودا تاڕادەیەك شیعەكان دەیانتوانی بۆ ڕازیكردنی كورد پشت لەبەرەی تەوافوق بكەن، چونكە بەرەیەكی لاواز بوو، بەڵام لەم خولەدا ناتوانن هیچ موساوەمەیەك لەگەڵ كورد بكەن، لە سەر حسابی عێراقییە، چونكە لایەنێكی بەهێزی پرۆسە سیاسییەكەیە.

٤. چۆنێتیی دابەشكردنی كورسییەكانی پەرلەمان بە سەر پارێزگاكاندا لە بەرژەوەندیی كورد نەبوو، هەروەها شێوازی دابەشكردنی كورسییەكان بە پێی ئەنجامی هەڵبژاردنەكە لە بەرژەوەندیی كورد نەبووە و بەڕادەی (٥) بۆ (١٠) كورسی زەرەر لە كورد كەوتووە.

٥. هەڵبژاردنی ئەمجارەیش هاوشێوەی ئەوانەی پێشوو پاك و بێخەوش نەبوو، چۆنێتیی دابەشكردنی كورسییەكان بە سەر پارێزگاكاندا لەگەڵ بنەما یاساییەكانی دابەشكردنی كورسییەكان بە سەر لیستە براوەكان و تەرخانكردنی كورسیی قەرەبوو، لایەنگریی نەتەوەیی و سیاسیی تێدا بوو. هەروەها چۆنێتیی ئامادەكردنی تۆماری دەنگدەران و بەڕێوەچوونی دەنگدان هەڵە و كەموكورتیی زۆری تێدا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لە هەڵبژاردنەكانی پێشووتر باشتر بوو.

## ڕاسپاردەکان

- پێویستە بەرەی کورد بە گشتی هەوڵی هەموارکردنی یاسای هەڵبژاردن بدەن و، بە مەرجێکی بنچینەیی بەشداریکردنی هەڵبژاردنی خولی داهاتووی پەرلەمانی دابنێن، چونکە کورد بە گشتی و سەرجەم هێزەکانی کوردستان لەم یاسایە زەرەرمەندن، بەڵام (پ د ك) لەم یاسایە زەرەرمەند نەبوو، چونکە بە ناڕەوا دوو کورسی بۆ دهۆك زیاد کرا، کە بۆ (پدك) بووە لە ئەنجامدا، هەروەها لە زیادکردنی ژمارەی کورسییەکانی نەینەوایش هەر (پدك) سوودمەند بووە.

چۆن یاساکە هەموار بکرێتەوە

- ئەنجامدانی سەرژمێریی گشتی و دابەشکردنی کورسییەکان بە سەر پارێزگاکاندا بە پێی ئەنجامی سەرژمێرییەکە.
- پەیڕەوکردنی شێوازی مایەوەی گەورە (الباقي الاقوى) لە دابەشکردنی کورسییەکان بە سەر لیستە براوەکاندا.
- زیادکردنی ژمارەی کورسیی قەرەبوو، لەگەڵ گۆڕینی شێوازی دابەشکردنەکەی، لەم شێوازەی ئێستای کە قەوارە گەورەکان سوودی لێوەردەگرن بۆ ئەوەی قەوارە زەرەرمەندەکان لێی سوودمەندبن، واتە ئەو قەوارانەی لە ئاستی پارێزگا کورسییان بردووەتەوە، بەڵام بە ئەژمار کردنی هاوکۆڵکەی نیشتیمانی بۆ هەر کورسییەك، بەشێك لە دەنگەکانیان فەتاوە، بە گوێرەی دەنگە فەوتاوەکانیان کورسیی قەرەبوو وەربگرن. بۆ نموونە قەوارەیەك (٦) کورسیی پارێزگاکانی بردووەتەوە، بەڵام بە ئەژمارکردنی هاوکۆلکەی نیشتیمانی بەشی (١٠) کورسیی دەنگی بە دەست هێناوە، لەو کاتەدا (٤) کورسیی قەرەبووی بەر دەکەوێت.
- پەیڕەوکردنی شێوازی لیستی نیمچەکراوە لە هەڵبژاردندا، واتە دەنگدەر لەبری ئەوەی تەنها دەنگ بە یەك کەس بدات لە لیستەکەدا، بۆی هەبێت بە

گـوێرەی ژمـارەی کورسـیـیەکانی پارێزگاکـە ڕیزبەنـدیی پاڵێوراوەکـان بکـات لـە لیستەکەدا. بۆ ئەوەی دەنگدەر زیاتر لە خیارێکی لەبەردەستدا بێت بۆ دەنگدان بە پاڵێوراوەکانی نێو لیستەکە.

# پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغداد: سەرەتایەکی نوێ: دیدێکی ستراتیژی

د. سەردار عەزیز

ئەم پشێوییەی میزۆپۆتامیا مێشکمی تێکداوە!

وینستۆن چرچڵ لە نامەیەکیدا بۆ لوئید جۆرج

ئابی ساڵی ١٩٢٠

## پێشەکی

ئەم نووسینە خوێندنەوەیەکی شیکاریی ستراتیژییە بۆ پەیوەندیی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی لە دۆخی ئێستایدا. ئەم لێکۆڵینەوەیە لەو ڕوانگەیەوەیە کە هەتا ئەم دواییە پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغداد لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی تایبەتدا بەڕێوە دەچوو. ئەو چوارچێوەیەیش بریتی بوو لە بەغدادێکی لاواز و هەرێمێکی بە بەراورد بەهێز. ئێستا پاش نزیکەی دە ساڵ کۆتایی ڕژێمی بەعس، دۆخەکە بەرەو پێچەوانەبوونەوە دەچێت، چیتر بەغداد لاواز نییە و، لە بەرامبەر بەغدادا هەرێم هێندە بەهێز نییە. ئێمە بڕوامان وایە کە جیوپۆلەتیکی ناوەند و جیوپۆلەتیکی کوردی هەر دوو لە سەر بنەمای هێز بەندە، بەم پێیە هەر دوو ناتوانن لە هەناوی عێراقدا بەهێزبن، بۆیە بەهێزیی لایەك بێهێزیی لایەکەی ترە یان دەبێتە بەهێزیی لایەکەی تر. ئەم هاوکێشەیە کە لە سەر هێز وەستاوە، بە تایبەت هێزی سەربازی، دیارە دەبێت ئەوە ڕوون بکەینەوە کە هێزی سەربازی بۆئەوەی بێتە ئاراوە پێویستە پاشخانێکی ئابووری و ڕێکخراوەیی و نێودەوڵەتی و تەکنیکی و ئایدیۆلۆژیی بۆ ڕەخسابێت. ئەم دەرئەنجامە کە بریتییە لە زیندبوونەوەی عێراق و خواستەکانی وەك دەوڵەتێکی ناوەندی، ئێستا بۆ کورد ئاسان نییە قووت بدرێت، بەڵام گۆڕانکارییە ئابووری و لۆجستی و دەسەڵاتییەکان هەموو بە ڕوونی ئاماژە بە ئەمە دەدەن. بە داخەوە لە بەرامبەر ئەم وەرچەرخانەدا کورد، لەبری

هەڵهێنانی هەنگاوی بونیادنەرانە بۆ بونیادنانی هاوسەنگیی هێز، تەنها خەریکی، ململانێی ناوخۆیی و خۆنواندنی میدیاییانەیە. کەواتە شتێك بە ناوی ستراتیژی کورد بوونی نییە. جیوپۆلەتیکی کورد، جیوپۆلەتیکی دەسەلاتی کەمینەکی کەمە، کە مەرج نییە هەمیشە بەرژەوەندییەکانیان تەبابێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای کوردیدا.

سەرەتا بۆ لێکدانەوەی ئەم دۆخە بەخێرایی بە مێژووی عێراقدا ڕادەگووزەرین بۆ ئەوەی ئەو بنەما گشتییانە بناسینەوە کە ئەم وڵاتە هەیەتی. عێراق وەك وڵاتێکی داهێنراو، کە عێراقناسی ناسراو (تۆبی دۆج) لە کتێبەکەیدا لەم بارەوە وەها ناوی دەبات[1].

پاشان لە خاڵی وەرچەرخانەکان دەدوێین. بۆ ئێمە بە گشتی دوو خاڵی وەرچەرخانی گرینگ هەیە، یەکەم: ڕاپەڕین، دووەم: هاتنی سوپای ئەمریکا. ئێستا ئێمە بەرەو ڕووی خاڵی وەرچەرخانی سێهەم دەڕۆین کە زیندوبوونەوەی عێراقە.

لەم ڕووەوە هەندێك بنەمای چەسپیو هەیە وەك دراوی ماتماتیك وەهان:

یەکەم: تەنها لە لاوازیی بەغدادا کورد دەنگی دەبێت، بەغدادێکی بەهێز، ئەگەر لە سوید و نەرویج دیموکراتیتریش بێت بۆ کورد زیانبەخشە.

دوو: بوونی کورد لە بیست ساڵی ڕابردوودا بە هۆی لاوازیی بەغداوە بووە، نەك بە هۆی بەهێزی و دانایی و لێهاتوویی کوردەوە، ئەم قۆناغە بەرەو کۆتایی دەچێت. کورد ئەگەر نەتوانێت خۆی بۆ قۆناغی نوێ ئامادە بکات ئەوا چوونەوە ژێر دەسەلاتی ناوەند تەنها مەسەلەی کاتە.

لەم باسەدا هەوڵ دەدەین ئەو شێوازە لە سیاسەت بخەینە بەرچاو کە کورد دەبێت لە قۆناغی داهاتوودا بیگرێتە بەر. ئەم سیاسەتەیش بەکورتی بریتییە لە

1. TOBY DODGE 2003Inventing Iraq, The Failure of Nation Building and a History Denied, by. New York: Columbia University Press.

بەرهەمهێنانی هێز، بۆ هەبوونی توانا لە بەرامبەر هێـزی بەرهـەمهاتوودا. هێـز لـە پرۆسـەیەکی ئـاڵۆزی فرەچەشـنی، فرەئاسـتی، جوڵـاوی، بـەردەوامی کـراوەدا بەرهەمدێت، کە بتوانێت زۆرترین پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی لـە خۆیـدا کـۆ بکاتەوە.

لێرەدا تەنها بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە ئەو هاوکێشە ئاڵۆزە دەخەینە ڕوو کە (ئەحمەد داود ئۆغلۆ) لە کتێبی (سـتراتیژییەتی قـووڵ)دا بـۆ بەرهـەمهێنانی هێـز بەرچاوی دەخات. بە پێی داود ئۆغلۆ هێز = ﴿(مێژوو + جوگرافیا + دیموگرافیـا + کەلتوور) + (هێزی ئابووری + هێزی تەکنەلۆجی + هێزی دیموگرافی)﴾ هـەموو ئەمانە پێکەوە لێکـدانی (ئاگـایی سـتراتیژیی لێکـدانی پلانـی سـتراتیژی لێکـدانی ئیرادەی سیاسی). بەم پێیە دەبینین کە هێز تەنها کاتێك بەرهەم دێت کە خاوەن هێزە بەئاگابێت لە هەموو سەرچاوەی تواناکانی، چۆنێتیی پێکەوە گرێدانیان[1].

ئەم شێوازەی بەرهەمهێنانی هێز نامۆیە بە کورد. بە داخەوە بیست ساڵ لـە شکست لە حکومڕانی خود، نەبۆتە مایەی ئەوەی کە کورد بتوانێـت وانـەی لێـوە فێربێت.

### ١: عێراقی داهێنراو:

عێـراق وڵـاتێکی دەسـتکردی داهێنـراوە. لـە هـەمان کاتـدا لـە سـاتەوەختی دروسـتبوونیدا عێـراق خـەونێکی ئینگلیـزی بـوو، بـەم پێیـە بەشـێك بـوو لـە جیوپۆلەتیکی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی.[2]

---

[1]. بۆ زیاتر زانیاری بنواڕە (ستراتیژییەتی قووڵ) نووسینی (ئەحمەد داودئۆغلۆ) چاپی جەزیرە لاپەڕە ٣٥.
داود اوغلو،٢٠١٠ العمق الاستراتیجي، موقع ترکیا ودورها في الساحة الدولیة، مرکز الجزیرة للدراسات.

[2]. بۆ زانیاریی زیاتر بنواڕە (تۆنی دۆج) هەمان سەرچاوەی سەرەوە. هەروەها بنواڕە،
Haddad, Fanar 2012 Political awakenings in an artificial state: Iraq, 1914–20, International Journal of Contemporary Iraqi Studies, Volume 6 Number 1.

هێنانە ئارای عێراق لەم شێوازە تایبەتەیدا بۆ فەراهەم بوونی ئامانجێکی ئینگلیزی بوو. گەر ئامانجەکە لەروی مێژووییەوە بەسەرچووە ئەرا خەونە فەراهەم بووە کە هێشتا لە زۆر باردا کاریگەریی ماوە، بە تایبەتی بۆ خەڵکێکی وەك کورد، کە هەر لە سەرەتاوە دژ بە پڕۆسەی دروستکردنی عێراق بوون.

کە دەڵێین خەونی ئینگلیزی مەبەستمان لە خەونێکە کە دەخوازێت دونیا ڕێك بخات، لە سەر شێوازی تایبەتی ئینگلیزی، بۆ مەبەستی فەراهەمبوونی بەرژەوەندیی ئابووری و، ململانێی هێز. ئەمە بەکورتی ئیمپریالیزمە. ئەم خەونە کە ئێمە لێرەدا دەرفەتی پەرژێنکردنیمان نییە ڕەگی قووڵی لە جیوپۆلەتیکی ڕۆژئاوا و وڵاتێکی وەك بەریتانیاوە هەیە، کە دەڵێین جیوپۆلەتیك مەبەستمان لەوەیە کە بەریتانیا چۆن ناوچەکە دادەڕێژێت بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی ئەو هەڵبسورێت، بەرجەستەبوونی ئەم خەونە لە پەیمانی سایکس-پیکۆدایە.



## ٢: نەخشەی سایکس-پیکۆ:

مارك سایکس کە دیپلۆماتێکی ئینگلیز بوو، یەکێکە لە داڕێژەرانی پەیمانەکە، هەرچەندە پەیمانە پێشنیارکراوەکە لە لایەن ئەم دوو دیپلۆماتەوە وەك خۆی جێبەجێ نەکرا، بەڵام بەناوی ئەمانەوە ناسراوە. مارك سایکس بە پیادە و بە ئەسپ بەکوردستاندا گەڕاوە، ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوەی دەربارەی ناوچەکە و سەفەرەکەی نووسیوە، هەموو عەشیرەتەکانی کوردی ناسیوە و هاتۆتە موسڵ.[١]

کاتێك پلانەکەیان بڵاوکردەوە، بەلفۆر کە خۆی خاوەن یەکێکی تر لە پەیماننامە بەناوبانگەکانە بەڵام تایبەت بە فەلەستین، کە ناسراوە بە پەیماننامەی بەلفۆر دەربارەی پەیماننامەی سایکس-پیکۆ چاکی بۆچووە کە دەڵێت:

نامۆ بە چەمکەکانی مۆدێرنی وەك نیشتیمانێتی یان نەتەوایەتی کە لە پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا نووسراون. ئەم بەڵگەنامەیە (سایکس-پیکۆ) ئاماژە بە ئەوە دەکات کە ئەگەر بێتو ئێمە کۆمەڵێك خەڵك پێکەوە کۆ بکەینەوە، کە بە گشتی لە ڕووی زمان و ئایینەوە هاوچەشنن، بە یارمەتییەکی کەم و بڕێ ئامۆژگاری، بیانپارێزین لە مەترسیی دەرەکی و ڕێگەیان لێ بگرین لە توندوتیژی دژ بەیەکتر لەنێو خۆیاندا، بەخێرایی و لە خۆیانەوە خۆیان وەك دەوڵەتێکی دیموکراتی ڕێکدەخەن بە شێوازی مۆدرێن.[٢]

---

1. بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بنوارە:
Mark Sykes1908The Kurdish Tribes of the Ottoman Empire The Journal of the Royal Anthropological Institute of Great Britain and Ireland Vol. 38, (Jul. - Dec.,), pp. 451-486.

2. لە ئێف سی نایدینەوە وەرگیراوە لە بڵاوکراوەی ولسونی وەرزانە:
F. S. Naiden2007 Lines in the Sand The Wilson Quarterly (1976) Vol. 31, No. 1 (Winter,), pp. 52-63.

ئـەم توانجـە بەرامبـەر پلانـی دروسـتکردنی وڵاتـانی ناوچـەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست لەنێویانیشدا عێراق لە زۆر ڕووەوە یارمەتیدەرە بۆ ڕەخنـەکردنی ئـەو پێکهاتەیەی، کـە پێـی دەڵـێن عێـراق. دیـارە ڕەخنەکـەی بـەلفۆر ئـاڵۆزە، بـەڵام لەهەناویدا دەتوانین چەند هێڵێك دیاری بکەین:

یەکـەم: بـە خـەونی مـۆدێرنی ڕۆژئـاوایی کێـشەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت چـارەسـەر نابێـت. دیـارە بـەلفۆر ئاگـادارە کـە لـە مێـژووی ڕۆژئـاوادا نەتـەوە دەسـتکردەو، ئـەم دەسـتکردیە چـەنـدین شێوازی هەیـە، باڵاترینیـان نموونـەی فەرەنسییە. لە نموونـەی فەرەنـسیدا دەوڵـەت پـێش نەتـەوە دەکـەوێت، چـونکە کاتێك شۆڕشی فەرەنسی خۆی وەك دەزگایەکی باڵا بە سەر کۆمـەڵگادا ڕاگەیانـد لـە بەرامبـەر پاشایەتی کلێـسادا، ئـەوا ناچـاربوو بـۆ پێکـەوە گرێـدانی کۆمـەڵگا نەتەوە بهێنێتە ئاراوە.[1]

دیارە نەتەوەی بەرهەم هاتوو، شـێوازێکی باڵـای دەوڵەتییـە کـە دەخوازێـت خۆی بە سەر هەموو پێکهاتەکانی تـردا بسەپێنێ. ئـەزموونی تورکیـا بـە هـەمان شـێوە لاسـاییکردنەوەی ئـەم ئەزموونەیـە. لـەم پرۆسـەیەدا دەوڵـەت دەتوانێـت سـەرجەم خەڵکـەکانی نـاو سـنووری لـە بۆتەقـەی یـەك نەتـەوەدا بتوێنێتـەوە. فەرەنسا نموونەیەکی سەرکەوتووە لەم بوارەدا، بەڵام دووبارەکردنەوەی لـە هـیچ کوێیەکی دونیا هەمان دەرئەنجامی لێ نەکەوتوەتەوە.

هێنانی خەونی مۆدێلی فەرەنسی بۆ بونیادنانی کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای عێراقـی جگـە لـە یوتۆپیایـەك هیـچی تـر نییـە. پیـادەکردنی یوتۆپیـا بـە سـەر کۆمەڵگادا هەمیشە پێویستی بە برێکی زۆر لە توندوتیژییە، بۆیە دەکرێت بوترێت عێراق، وەك پـرۆژەی هـەموو یوتۆپیاکـانی تـر، یوتۆپیایەکـە کـە بـە توندوتیـژی

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەوە بنوارە:

Hans Kohn, The Idea of Nationalism. A Study in its Origins and Background, New York, Macmillan, 1946, p. 330

ئاودراوە. هەموو یوتۆپیایەك كاتێك هەوڵی پیادەكردنی دەدرێت توندوتیژی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. كارەكانی كارل پۆپەر لەم بارەوە یارمەتیدەرن.[1]

دیارە سیستەمی سیاسی نییە بە بێ یوتۆپیا، تەنانەت دژە یوتۆپیای وەك نیولیبراڵ بۆ خۆی یوتۆپیایە و هەڵگری برێكی زۆر لە توندوتیژییە.[2]

بەكورتی سیاسەت لە توندوتیژی جیاناكرێتەوە، بەڵكو دەكرێت سیاسەت وەها پێناسە بكرێت كە هەوڵدانە بۆ دەستەمۆكردنی توندوتیژی لە ڕێگای توندوتیژی یاساییەوە، بۆیە هەرچۆنێك بیر لە عێراق دەكەیتەوە جگە لە كانگای توندوتیژی هیچی تر نییە و، نابێت. هۆكاری سەرەكیش ئەوەیە كە عێراق دروستكراوێكە، دژ بە سروشتی خەڵكانی ناوچەكە. گەر لە ڕۆژئاوا خەڵك ئامادەبوون یان لە ڕێگای شەڕە درێژخایەنەكانەوە ناچاركران دەستبەرداری شوناسی لۆكاڵی خۆیان بن، ئەم پرۆسەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەت لە بەرامبەر بە كورد، بە هیچ كوێ ناگات، چونكە لەبری گۆڕینی شوناسی خەڵكی دەوڵەتی عێراقی شوناسی لۆكاڵی پتەوتر كرد.

سەرنجی دووەم ئەوەیە كە ئەگەر بێتو، خەونی دروستكردنی عێراق ڕۆژئاواییە ئەوا لە ساتەوەختی فەراهەمبوونیدا دەبێتە ڕۆژهەڵاتی. بە بوونی بە ڕۆژهەڵاتی یانی چیدی سڵكردنەوە نییە لە بەكاربردنی هیچ شێوازێك لە توندوتیژی. مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی كە دێتە سەر كێشەكانی وەك لەیەكگەیشتن، توانای پەیوەندیكردن، سنگفراوانی، دیموكراسی، حوكمی یاسا هێشتا زیاتر لە پێنج سەد ساڵ لە دوای مرۆڤایەتییەوەیە. ئایین هۆكارێكی نێگەتیفی گەورەیە

---

1. بۆ پەیوەندیی نێوان یوتۆپیا و توندوتیژی بنوارە وتاری كارل پۆپەر،
KARL R. POPPER1986 Utopia and Violence World Affairs Vol. 149, No. 1 (SUMMER), pp. 3-9.

2. لەم بارەوە زیاتر بنوارە سلاڤیو ژیژاك،
Slavoj Žižek. 2009"Denial: the Liberal Utopia." in: Lacan.com.
http://www.egs.edu/faculty/slavoj-zizek/articles/denial-the-liberal-utopia

لەم بوارەدا. دیارە ئایین بۆ خۆی لە هەمان کاتدا دەکرێت سەرچاوەی ئەخلاقێکی مرۆڤانەی سەردەمی بێت، بەڵام کاتێك لە هەناوی شێوازی دەسەڵاتی ڕژێمەڵاتیدا دەردەکەوێت ڕەهاگەرایی، دڵڕەقی، لاوازیی کەسایەتی، خۆ بەباڵازانی زۆر نەخۆشی تر دەهێنێتە ئاراوە. دیارە مەرج نییە کەسێك ئایینی بێت بۆنەوەی هەڵگری ئەم سیفەتانە بێت، چونکە وەك وتمان هیچ کام لەم بەهانە تایبەت نین بە ئایینەوە، بەڵکو کاتێك ئایین دەکرێتە پاشخانیان هێندەی تر بەهێز دەبێت. مێژووی عێراق مێژووی خوێنڕشتن و یەکترکوشتن و لێکنەبوردنە. ڕەنگە ڕووداوی کوشتنی ئیمام حسەین لە کەربەلا سەرەتای ئەم جەنگە سیاسییە بە ئایینییە ئاو دراوە بێت. جەنگی نێوان سوننە و شیعە لە پاش ڕووخانی سەددام لەم پاشخانەوە سەرچاوەی گرتبوو. لە ناو سوننەدا کۆمەڵێك دیدی سیاسی دڕندانە هەیە ئەویش لە ڕێگای توندوتیژییەوە دەتوانرێت زۆرینە بکرێتە کەمینە، ئەمە نەك لە ڕێگای قڕکردنیان، بەڵکو لە ڕێگای چاوشکێنکردنیان. هەرچەندە ئەم پڕۆسەی قڕکردنە لە پڕۆسەی ئەنفالدا بەرامبەر بە کورد بەکار برا، ڕەگی ئەم دیدە دەگەڕێتەوە بۆ عەباسییەکان، سوننە لە پاکستان و جێگاکانی تری وەك بەحرەین بەکاری دەبەن.

پەیوەندیی مرۆڤ بەخوداوە پەیوەندییەکە کە دەکرێت بنەمای ژیانێکی ئاسوودەی پڕ لە ئەخلاق بێت کاتێك مرۆڤ لە میانەی پەیوەندیی بە خوداوە لە سنوورداری و لاوازی و هەژاری خۆی بە ئاگا دەبێتەوەو، فێری ئەوە دەبێت کە پێویستی بە مرۆڤێکی ترە بۆنەوەی بکاتە ئاسوودەگی.[1]

---

1. بۆ زیاتر زانیاری لە سەر ئەخلاق لە پەیوەندیی بە ئەوی ترەوە بنواڕە کارەکانی (ئیمانوئێل لیڤیناس) لێرەدا پوختەیەکی ئەم دیدە، نامەی دوکتۆرای جێنێفەر ڕۆساتۆ؛

Jennifer E. Rosato 2010 OPENING ONESELF TO AN OTHER: SARTRE'S AND LEVINAS' PHENOMENOLOGICAL ETHICS http://etd.nd.edu/ETD-db/theses/available/etd-04082010-161003/unrestricted/RosatoJE042010D.pdf

بەڵام کێشەی ئاین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوەیە کە بیر لیَ نەکراوەیە، تەنها وەك چوارچێوەیەك و پاشخانێك وەردەگیرێت بۆ فەراهەمبوونی ئامانجی تەسکی مرۆڤانە. بەم پێیە کاتێك عێراق دوورە لە ڕۆژئاواوە و بەها ڕۆژهەڵاتییەکان تیایدا بیر لیَ نەکراوەن ئەوا تەنها توندوتیژی دەزانێت نەك ئەخلاق و عەقڵ. دیارە ئەمە بەمانی ئەوە نییە کە ئەخلاق و عەقڵ بوونی نییە. لێرەدا دەبێت ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە ئەخلاق و عەقڵ بە مانا زانستییەکەی نەك بە مانا گشتییەکەی مەبەستە. بە زمانێکی تر ئەخلاق یانی بەرپرسیارێتیی بەرامبەر ئەوی تر و عەقڵ یانی بوێریێك لە پرسیارکردن لە سروشتی هەموو شتێك. نەبوونی ئەم دوو ڕەهەندە وەهای کردووە کە ئەخلاق لەپاراستندا کورت بکرێتەوە و عەقڵیش لە چوارچێوەی باوەڕدا.

لە هەمان کاتدا ئەمە دیدێکی ڕوونە، کە عێراق ئەو بۆتەقەیەیە، کە پێکهاتەکانی ناچار بە توانەوە دەکات لە ڕێگای میکانیزمی ناوەوە و هێزە دەرەکییەکانەوە. لە مێژوودا هێزە دەرەکییەکان خواستیان وەها بووە، عێراق بەرەو ئاقارێکی وەها بڕوات کە ببێتە وڵاتێك کە نەتەوەی عێراق بهێنێتە ئاراوە. کەواتە عێراق هەر لەسەرەتاوە بەو خەونەوە هاتۆتە ئاراوە کە نەتەوەی خۆی بهێنێتە ئاراوە. بە بیَ بوونی هیچ بنەمایەك بۆ ئەم مەبەستە. وتەیەکی ناسراوی مەلیك فەیسەڵ هەیە لەم بوارەوە:

عێراق یەکێکە لەو وڵاتانەی کە لە ڕووی ئایینی، جڤاتی، یەکبوونی کەلتووری بە سەر خۆیدا دابەش بووە، دەسەلاتی پەرتەوازەیە.[1]

---

1. لە کتێبی ناجی شەوکەت ژیان و یادەوەری هەشتا ساڵ.
Naji Shawkat, Sira wa Dhikrayat Thamanima ʻAman, 1894-1974 [Biography and Memoirs of Eighty Years, 1894-1974] (Baghdad: Maktabat al-Yaqdha al-ʻArabiya, 1990), pp. 623-626

هەروەها لە ساتی هاتنی بۆ عەرش لە ساڵی (١٩٢١) فەیسەڵی یەکەم دەڵێت: بەوپەڕی دڵتەنگییەوە دەیڵێم بە باوەڕی من هەتا ئێستا لە عێراقدا گەلێك بوونی نییە، ئەوەی هەیە تۆپەڵە خەڵکی خەیاڵکراون، بەتاڵ لە بیرێکی نیشتیمانی، سیخناخ بە تەقلید و ئەفسانەی دینی، گوێهەڵخەرن بۆ خراپە و گێرەشێوێن، هەمیشە ئامادەن ڕاپەڕن بەرامبەر هەر حکومەتێك:

أقول و قلبي ملآن آسي... أنه في اعتقادي لا يوجد في العراق شعب عراقي بعد، بل توجد كتلات بشرية خيالية، خالية من أي فكرة وطنية، متشبعة بتقاليد وأباطيل دينية، لا تجمع بينهم جامعة، سماعون للسو و ميالون للفوضي، مستعدون دائما للإنتفاض علي أي حكومة كانت، فنحن نريد والحالة هذه أن نشكل شعبا نهذبه وندربه و نعلمه، ومن يعلم صعوبة تشكيل وتكوين شعب في مثل هذه الظروف يجب أن يعلم أيضا عظم الجهود التي يجب صرفها لإتمام هذا التكوين وهذا التشكيل.. هذا هو الشعب الذي اخذت مهمة تكوينه علي عاتقي.

ئەم ئەركە لە عێراقدا مەحاڵە، چونكە ئەگەر فەرەنسا توانی بەكارێكی وەها هەستێت ئەوە نەبوو كە تەنها دەوڵەت و سیستەمی وەهای هەبوو، بەڵكو مێژوویەكی دوورودرێژ لە كەلتووری كەڵەكەبوو بەو ئاقارەدا و هەروەها شۆڕشێكی گەورەی وەك شۆڕشی فەرەنسی لەگەل تیرۆرێكی بێ وێنە لەو ڕۆژگارەدا بەو ئاقارەدا.[1]

---

1. جەمكی تیرۆر لە شۆڕشی فەرەنسیدا هاتە ئاراوە، بۆ زانیاریی زیاتر بنوارە:
K.M. Baker 1994 (ed.), The French Revolution and the Creation of Modern Political Culture, vol. 4, The Terror (Oxford: Pergamon Press).
M. Bouloiseau, 1983The Jacobin Republic, 1792–94 (Cambridge: Cambridge University Press).
F. Furet, 1996 'The Terror, in Peter Jones (ed.), The French Revolution in Social and Political Perspective (London: Arnold).
H. Gough, 1997The Terror (Basingstoke: Macmillan).
C. Haydon and W. Doyle 1999 (eds), Robespierre (Cambridge: Cambridge University Press).

سەرباری ئەمە ئـەزموونی کۆمەڵایـەتی دووبـارە نابێتـەوە، ناتوانرێـت کـۆپی بکرێت. ئەمە جۆرێك لە ئاگایی بوو تایبەت بە مۆدێرنەکردن، کە ڕەگی لە دیدێکی میکانیکیدا هەبوو. ئەم دیاردەیە پێی دەوترێت مۆدرینایزەیشن، مۆدێرنەکردن.[1]

بە پێی تیۆرەی مۆدێرنـەبوون ئەگـەر بێتـو کۆمـەڵێك هـەنگاو بـە ئاڕاسـتەی مۆدێرنـەدا بنرێـت، کـە ببێتـە هـۆی داڕشـتنی بنەمایـەك، ئـەوا لـە دەرئەنجامـدا دەگەینە ئەو ئامانجە. ئەم دیدانە ئەمڕۆ، بەداخەوە هێشتا برەویـان مـاوە بـەڵام تەنها شێوازیان گۆڕاوە. ئەوەی مایەی پێکەنینە کە ئەم جۆرە پێکەوەبوونە ناوی نراوە پێکـەوەبوونی مـەدەنی، کـە گوایـە خـەڵکی بـە ئـارەزووی خۆیـان پێکـەوە گرددەبنەوە و نەتەوە بونیاد دەنێن.

ئەوەی شایانی ئاماژەپێدانە لە هەمان کاتـدا ئەوەیـە کـە ئـەم ناسـیونالیزمە مەدەنییە بوو بە هۆی هاتنە ئارای ناسیونالیزمی کەلتووری یان شێوازی ئـەڵمانی ناسیونالیزم، کە لە سەر زمان و کـەلتوور و مێـژوو ڕەنگرێـژکراو بـە ڕۆمانـسیەت. هــەر دوو ئــەم دوو ناســیونالیزمە بەریەککــەوتن بــەڵام هــەر زوو ناســیونالیزمی دەوڵەتی لە عێراق بوو بە ناسیونالیزمی ئیتنی، یـان لەڕاسـتیدا تـایفی، لـە لایـەن سوننەوە. لە لایەکی ترەوە عێراق بە بێ ئامرازی مۆدێرنە ناتوانێت عێـراق بێـت. لــە یەکــەم ڕۆژی دروســتبوونیەوە عێــراق پێویــستی بــە فڕۆکــە هــەبووە بــۆ بۆمبارانکردنی ئەو خەڵکانەی کە دەسەلآتی بە سەریاندا نەدەشکا. بە بـێ فڕۆکـە

R.R. Palmer, 1989Twelve Who Ruled: The Year of the Terror in the French Revolution (Princeton, NJ: Princeton University Press).
C. Petitfrère, 1996 'The origins of the civil war in the Vendée, in Peter Jones (ed.), The French Revolution in Social and Political Perspective (London: Arnold).

1. بۆ زانیاریی زیاتر لە دیدێکی ڕەخنەییەوە بنواڕە:
Adam Przeworski and Fernando Limongi 1997 Modernization: Theories and Facts, World Politics, Vol. 49, No. 2 (Jan.,), pp. 155-183

عێراق هەرگیز نەدەبووە وڵاتێك كە دەستی بە سەر سەرتاپا سنوورەكانیدا زاڵ بێت. مۆدێرنەی ئامرازی تێكەڵ بە ستەمكاریی ڕۆژهەڵاتی، پێكهێنەرەكانی دەسەلاتی عێراقن. [1]

**٣: میتۆدی ئەم لێكۆڵینەوەیە:**

میتۆدی ئەم لێكۆڵینەوەیە چەمكی خاڵی وەرچەرخانە. ئەوەی لە زانستی سیاسیدا پێی دەڵێن كریتیكاڵ جەنكچەر. بەم پێیە دوو جۆر لە ساتەوەخت هەیە لە میانەی ڕەوتی مێژوودا، ساتەوەختی ئاسایی و ساتەوەختی قەیران. [2]

ئەگەر هاتوو ساتەوەختی قەیران بوو بە هۆی وەرچەرخان لە ئاساییدا، ئەوا ئەو ساتەوەختی قەیرانە دەبێتە ساتەوەختی وەرچەرخان. وەرچەرخان بە مانای گۆڕانكاری لە سیستەمی دەزگاییدا، كە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گۆڕانكاری لە شێوازی هەڵسوكەوت و پەیوەندی و باوەڕدا.

كە دەڵێین سەردەمێكی نوێ چەمكێكی وەها چی دەگەیەنێت؟ سەردەمی نوێ، كاتێك دێتە ئاراوە كە وەرچەرخانێك ڕوو دەدات لەو دۆخەی كە لە ئارادایە. دوو ڕوانگە هەیە بۆ لێكدانەوەی ئەم وەرچەرخانە، یەكێكیان فەلسەفی ئەوی تریان زانستی سیاسی. بۆ خوێندنەوەی ئەم دۆخە ئێمە سوود لە هەر دوو دیدەكە وەردەگرین، چونكە لەڕاستیدا هاوبەشییەكی زۆر هەیە لە نێوانیانداو، بە تێكەڵكردنیان تێگەیشتنمان دەوڵەمەندتر دەبێت. ئێمە كە قسە لە سەر ئەم پەیوەندییە دەكەین قسە لە سەر وردەكارییەكانی ناكەین، زیاتر مەبەستمان

---

1. بۆ زانیاریی وردتر لەم بارەوە بنواڕە:

Toby Dodge 2003 Inventing Iraq: The Failure of Nation Building and a History Denied Columbia University Press،

2. JOHN HOGAN 2006 Remoulding the Critical Junctures Approach Canadian Journal of Political Science / Revue canadienne de science politique 39:3 (September/septembre) 657–679.

هەنگاوە گەورەکانیەتی، ئەو سەردەمانەی کە مەبەست و توانا تیایدا دەگۆڕێت.
ئێمە ئاگادارین کە سیاسەت لە ئاستی وردەکاری بەڵام لەنێو چوارچێوەی گەورەدا ڕوو دەدات. ڕەخنەیەك بە ئاسانی دەتوانرێت لە سیاسەتی کوردی بگیرێت ئەوەیە کە توانای بینین و دەرك پێکردنی چوارچێوە گەورەکانی نییە، بەڵکو سەرقاڵی وردکارییەکانە، ئێمە ئەم سیاسەتەی کوردی ناو دەنێین سیاسەتی تا دوای نیوەڕۆ. بەمانای ئەوەی تەنانەت توانای دەرککردنی ڕۆژێکیشی بە تەواوی نییە. لە هەمان کاتدا یانی نەبوونی هیچ جۆرە ستراتیژێك.

بۆ ڕاڤەکردنی ساتەوەختی وەرچەرخان لە ڕووی فەلسەفییەوە چەمکی ڕووداو بەکار دێت و لە زانستی سیاسەتدا چەمکی کریتیکاڵ جەنکچەر یان ساتەوەختی وەرچەخان لە هەر دوو دیدەکەدا دوو جۆر لە ساتەوەخت هەیە ساتەوەختی ئاسایی و ساتەوەختی وەرچەرخان. لە ڕووی فەلسەفییەوە، لە ساتی ڕووداوی ڕووداودا پچڕانێك دروست دەبێت و ڕاستی دەردەکەوێت، لە ئەنجامدا زەمینەی ساتەوەختێکی جیاوازتر دێتە ئاراوە، زۆرن ئەو فەیلەسوفانەی کە لەم بوارەدا کاریان کردووە، تەنها ناوی ئالان بادیو، جیل دۆلۆز، پۆل ڕیکۆر، ئیان ماکنزی بهێنین بەسە.[1]

لە ڕووی زانستی سیاسییەوە هەروەها چەمکی وەرچەرخانی کاریگەر (کریتیکاڵ جەنکچەر) بەمانای ئەوە دێت کە دوو سات هەیە یەکیان ئاسایی و ئەوی تریان قەیراناوی، دیارە ئەم چەمکە بەشێکە لە میتۆدێکی ئاڵۆز کە پێی دەڵێن هیستۆریکاڵ ئینستیتیوشن یان گەشەی دەزگا لە میانەی مێژوودا.

بەڕای ئێمە ئێستا ساتەوەختی وەرچەرخانە. بەهانەشمان بۆ ئەمە بەم شێوەیە. عێراق وەك وڵاتێکی داهێنراو، کە مانای وایە هیچ بنەمایەکی

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر لە ڕووی فەلسەفییەوە بنوارە،
MacKenzie Iain 2008 What is a Political Event? Theory & Event Volume 11, Issue 3.

ناسنامەیی و پێکەوەبوون و پەیوەندیکردنی نییە، هەمیشە بۆ زاڵبوون بە سەر ئەم ناسروشتییەیدا هێزی بەکار هێناوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بە سەر سەرجەم پانتاییەکانیدا. هەر لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونییەوە عێراق پێویستی بە فڕۆکە بووە بۆئەوەی خەڵکانی ناو سنووری خۆی بۆمباران بکات هەتا بێنە ژێر ڕکێفی، دیارە ئەمە بەشێك بوو لە نەریتی ئینگلیز. ئەم خەسڵەتە وەهای کردووە کە ئەوە تەنها هێزە کە بەڕێوەبەر و ڕێکخەر و کرۆکی ڕاستەقینەی هەموو جۆرە سیاسەتێکە لە عێراقدا. لە نێو ئەم پەیوەندیی هێزەدا پەیوەندیی کوردو ناوەند لە هەمووان زیاتر قوربانی ئەم جۆرە پەیوەندییە بووە. بەم پێیە دەتوانین بە مێژووی عێراقدا بچینەوە زۆر بە ئاسانی هەموو ئەو ساتەوەختانە دیاری بکەین کە کورد تیایدا دەرکەوتوون و هەموویان ساتەوەختی لاوازیی حکومەتی ناوەندین.

بەڵام ئەم دەقە بە دیدێکی میکیاڤیللیانەوە نووسراوە. مەبەست لە دیدی میکیاڤیللی چییە؟ میکیاڤیللی وەك هەموامان دەزانین نزیکەی پێنج سەدە لەمەوپێش لە شاری فلۆرنس لە ئیتالیا ژیاوە. ساتەوەخت و ژینگە و سیستەمی سیاسی ئەو ڕۆژگارەی کە میکیاڤیللی لە ژێر سایەی خێزانی میدیچیدا ژیاوە زۆر لە ئێستای عێراق و هەرێم دەچێت. ململانێی خێزانەکان، ناسەقامگیری، دەستی دەرەکی و، لە هەمان کاتدا گەشەی هونەر و ئابووری. لە لایەکی ترەوە میکیاڤیللی ئەو کەسەیە کە نزیك بووە لەم سیستەمەوە و بە شێوەیەکی مەبەستدار دەربارەی نووسیوە. مەبەستمان لە شێوازی مەبەستدار ئەوەیە ئەو کەسێك نەبووە تەنها بێت و مێژوو بنووسێت یان ڕووداوەکان ڕاڤە بکات، بەڵکو ئامانجی ئەوە بووە لە ڕێگای دیدەکانیەوە، لە ڕێگای نووسینەکانیەوە ببێتە بەشێك لە سیستەمی سیاسی. ئێمەیش لێرەدا کە ئەم دیدانە دەخەینە پێش چاو بە مەبەستی بەشداریکردنە لە پرۆسەی سیاسی. جۆرێك لە بەشداریکردن کە

دەگمەنە و لە هەمان کاتدا لاوازە. لە پێشەکی خیتابێك بۆ لیڤی میکیاڤیللی دەبێت پۆزش بهێنێتەوە بەوەی کە تەنها کتێبێکی هەیە پێشکەشی لۆرینزۆی بکات، لە کاتێکدا خەڵکی تر ئەسپ و شتی تری گرانبەها بە میر دەبەخشن. ئێمە بە پێچەوانەی میکیاڤیللییەوە پۆزش ناهێنینەوە و دیارییەکەمان بە بەنرخترین دیاری دەزانین، نەك بۆ میر، بەڵکو بۆ خەڵك.[1]

لە لایەکی ترەوە میکیاڤیللی هەرچەندە خۆی وەها دەردەخات کە لەپشت زمانە ڕاستەوخۆکەوەیە بە تایبەت لە کتێبی میردا، چەندین مەبەستی شاراوە هەبێت، بەڵام زمانی میر زمانێکە کە دەربڕی سروشتی بێ بەزەیی و بێ ئەخلاقی واقیعی سیاسییە. سروشتی سیاسەتکردن لەو بەشەی دونیای ئێمەدا لە دڵڕەقی و بێ بەزەیی و زۆرجار لە بێ ئەخلاقیدا میکیاڤیللیی تێپەڕاندوە. لە ڕاستیدا زەقی و دڵڕەقی میکیاڤیللی کاتێك بەراورد دەکرێت بە دەقی کەلتوورەکانی تر ئەهوەن دەبێتەوە. ماکس ڤیبەر لەم بارەیەو دەدوێت لە دەقی سیاسەت وەك پیشە، کاتێك میر بەراورد دەکات بە دەقی ئەرتاشاسترای کۆرتیلی کە دەقێکی هیندییە چەندین سەدە پێش لە دایکبوونی عیسا نووسراوە. هەروەها دەقی موقەدیمەی ئیبن خلدون بە هەمان شێوازە.[2]

لە سەرووی هەموو ئەمانەوە ڕاڤەکانی میکیاڤیللی، ئامۆژگارییەکانی، ئەگەر بێتو بەرگێکی سەردەمییانەیان بە بەردا بکرێت ئەوا لە هەموو نووسراوێکی تری ڕۆژئاوایی بەسوود تر دەبێت.

داکۆکیکردنی میکیاڤیللی لە سەر شەڕ و هونەری شەڕ و هێزی سەربازی بۆ بردنەوەی پێگەی سیاسیی ئەمڕۆ واقیعێکە لە عێراقدا پیادە دەکرێت. کاتێك

---

1. بۆ هەبوونی دیدێکی گشتگیریی نیمچە ئەکادیمی بنوارە:
http://plato.stanford.edu/entries/machiavelli
2 .Max Weber Politics as a Vocation
http://anthropos-lab.net/wp/wp content/uploads/2011/12/Weber-Politics-as-a-Vocation.pdf

ئێمە ئەم دیدانە دەخەینە بەرچاو کوردستان لە ژێر هەڕەشەی هێرشی سەربازیدایە لە لایەن سوپای عێراقی ناوەندەوە. میکیاڤێللیەت لە کوردستان لە زۆر ڕووەوە لە ئارادایە، دەسەلاتی بنەماڵە و شەڕکردن لەپێناو مانەوەی بنەماڵە و ئاڕاستەکردنی سیاسەت و گەشە و هەموو بوارەکانی تر لەم پێناوەدا، لە زۆر ڕووەوە لە سەردەمی قۆناغی پێش دەوڵەت دەچێت. ئێمە کە میکیاڤێللیانە ئەم دۆخە دەبینین بۆئەوەیە بەرەو بەڕێوبردنێکی دەوڵەتی ئاڕاستەی بکەین. شایانی باسە کە میکیاڤێللی یەکەم کەسە لە مێژووی بیری سیاسیدا کە چەمکی دەوڵەتی بەکارهێنابێت.

ئەوەی زیاتر لە هەمان کاتدا هاندەرە بۆ بینینی واقیعەکە بەم شێوەیە ئەو هەموو دید و پڕوپاگەندە و لێکدانەوەی خێرا و هەنوکەییانەیە کە مەبەستیان چەواشەکردنە.

لە ڕووی واقیعی سیاسی دەسەلاتخوازییەوە دەکرێت بۆ نموونە هەموو شتێك ڕەوایە لەپێناوی مانەوە لە سەر دەسەلات، یان ئامانج بەهانەی ئامرازە و زۆر میتۆدی تر بە ئاشکرا لە دونیای سیاسەتی ناوچەکەدا ببینرێت. ئەم بنەمایانە هەموو ئەمڕۆ لە کوردستان بە زەقی و بە ڕوونی پیادە دەکرێت.

ئێمە لەم باسەدا بە دوو هێڵی تەریب دەڕۆین، یەکەمیان زیندوبوونەوەی عێراقە و گۆڕانی عێراقە لە وڵاتێکی لاوازەوە بۆ سیستەمێکی تاکەکەسی بەرەو دیکتاتۆری و، لە هەمان کاتدا قەیرانە کوشندە و درێژخایەنەکانی هەرێم لە بەرامبەر ئەم گەشەیەدا.

### ٤: دۆخەکە چۆن بینرا؛

ڕانانی دیدی ئەوانی تر بەشێکی بنەڕەتی هەموو نووسینێکە. لێرەدا دەکرێت دیدەکان بە گشتی بکەینە دوو پۆلێنەوە: یەکەم دیدە دەرەکییەکان، دووەم دیدە ناوەکییەکان. دیدە دەرەکییەکان بە گشتی جەخت لە سەر نەوت دەکەنەوە، وەك فاکتەرێکی گەورە و بگرە تاقانەی پشت ئەم پشێوییە. بێن ڤان هێڤلیون لە

راپۆرتێکیدا لە واشنتۆن پۆست هۆکاری سەرەکی دەگەڕێنێتەوە بۆ هاتنی کۆمپانیای نەوتی ئێکسۆن، بە تایبەت بۆ ناوچە جێناکۆکەکانی نزیك موسڵ.[1]

ئێمە هێندە جەخت لە سەر دیدی دەرەکی ناکەینەوە، چونکە بۆ خوێنەرێك نووسراوە کە وردودرشتی دۆخەکە بەلایەوە مەبەست نییە، هەروەها هەمیشە هەوڵ دەدات بە جۆرێك لەجۆرەکان بە وڵاتی خۆیانەوە ببەستێت. ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە نەوت هیچ بایەخێکی نییە، بەڵکو لە کرۆکی دۆخەکەدایە، چونکە سامانی سروشتی توانابەخشە و هەروەها دەتوانێت ببێتە هۆکاری گۆڕینی جیوپۆلەتیکی ناوچەکە، بە تایبەت لە پەیوەست بەتورکیاوە. هەر ئەمەیشە کە ئەمریکا لە هەموو ئاستێکدا دژ بەم گەشەیە، بە تایبەت بۆ کۆمپانیان تورکەکان.

لە لایەکی ترەوە، پێکهێنان و هاتنی هێزی دیجلە بۆ ناوچەکانی کوردستانی ژێردەستی حکومەتی ناوەندی لە لایەن چاودێرانەوە بە چەند شێوازێك بینراوە، لێرەدا بە کورتی دیدەکان و کەموکورتییان دەخەینە پێش چاو وەك راڤەکارییەکی سەرەتایی بۆ داڕشتنی چەند مەبەستێك، یەکەم: تێگەیشتن و جۆرەکانی تێگەیشتنی ئێمە لە دۆخەکە. دووەم: پەرچەکرداری چاودێران و رۆشنبیران بۆ دۆخەکە و سێیەم: خستنە پێش چاوی ئاستەکانی تێگەیشتن. هەروەها سەرباری ئەمانە وەك جۆرێك لە رانانی ئەدەبیات لەم بارەوە، رانانی ئەدەبیات، بەشێکی سەرەکی هەموو کارێکی توێژینەوەیە، بۆ ئەوەی پێشانی بدەیت کە پێشتر لەم بارەیەوە چی کراوە و چی وتراوە و ئەم توێژینەوەیە چی زیاد دەکات و، پەرە بە چی دەدات و چی رەخنە دەکات.

---

1. لەم بارەوە بنوارە:

Ben Van Heuvelen 2012In Iraq, Exxon oil deal foments talk of civil war, December 18, http://articles.washingtonpost.com/2012-12-18/world/35887389_1_kurdistan-region-kurdistan-president-massoud-barzani-civil-war.

دەکرێت پەرچەکردارەکان بەم شێوەیە پۆلێن بکەین، ئێمە بۆیە دەڵێین پەرچەکردار چونکە بیری کوردی بە گشتی پاشکۆی ڕووداوە و لە میانەی ڕاڤەکاری بۆ ڕووداودا، هەمیشە بە گشتی لەبەر ئەو دۆخە سەقەتەی لە هەرێم لە ئارادایە، بە زۆری لە هەوڵی ئەوەدایە کە پۆشین و پاساو هاندان و ورووژان و ئەجێندای حیزبی بخاتە پێش چاو. هەرگیز بیری کوردی، بە دەگمەن نەبێت تێڕامان نییە لە ڕووداو، گەڕان نییە بە دوای ڕەگ و ڕیشەیدا، هەوڵێك نییە بۆ تێگەیشتن لە ڕوانگەی گشتییەوە. ئیتر ئایا ئەم گشتییە کوردە، نەتەوەیە، خەڵکە، نیشتیمانە یان هەرێمە.

دیدی یەکەم بەختیار عەلی، ڕەنگە پێویست بە پاساو نەکات بۆچی لە بەختیار عەلییەوە دەست پێ بکەین. بەختیار کە لە ڕێگای پرسیارێکی تا هێندێك ڕیتۆرێکەوە دەپرسێت، دەیانەوێت چ کوردستانێك داگیر بکەن ؟ کردنی پرسیارەکە بۆ خۆی ئاماژەیە کە زیاتر لە کوردستانێك هەیە، کە لای ئەو بە گشتی بەشکراوە بۆ دوو کوردستان: یەکەمیان کوردستانی یەکێتی و پارتی و دووەمیان کوردستانی دەرەوەی یەکێتی و پارتی. دەتوانین بڵێین کوردستانی مادی و کوردستانی خەیاڵی. لای ئەو کوردستان لای پارتی و یەکێتی داگیر کراوە، لە هەمان کاتدا ئەو دوو حیزبە، 'سەرکەوتووبوون لەوەدا ئەو ئەفسانەیە بچێنن کە کوردستان موڵکی ئەوانە'. پاشان دێتە سەر ترسناکیی ئەم جۆرە داگیرکردنە.

'دەرەنجامە ترسناکەکانی ئەو بە تایبەتیکردنە، ئەمڕۆ دەردەکەوێت. لە ساتێکدا کە کوردستان دەکەوێتەوە بەر هەڕەشەیەکی دەرەکی. لەو ساتەدا تەواوی ناکۆکییەکانی ناو مێژووی سیاسی ئێمە دێتەوە پێشێ. ئەمڕۆ ژمارەی ئەو دەنگانەی کە دەڵێن کوردستان موڵکی کێیە و کێ خواردوێتی با ئەوانە بەرگری لێ بکەن کەم نین'. ئەم دۆخە بە لای بەختیارەوە 'بەرهەمی ئەو هەستە قووڵەن

بە نامۆیی کە بیست ساڵە سەوز دەکرێت. هەستێکە دەری دەخات ئەو نوخبە دەسەڵاتدارەی کوردستانو لەگەڵیشیدا ئۆپۆزسیۆن تا چەند بەشداربوون لە دروستکردنی وێنەیەکدا بۆ کوردستان وەك خاکێك کە موڵکی کەسانێکەو سەرزەمینی کەسانێکی دی نییە.'[1]

بەڵام سەرباری ئەم جۆرە داگیرکردنە یان نامۆکردنە ئێستا دۆخەکە جیاوازە، چونکە 'کێشەی سەرەکی لەم ساتانەدا کە دوژمنێکی فاشیستی ناسیونالیست هێرش دەهێنێت، ئەوەیە ئەم دوژمنە هێرش ناکاتە سەر ئەو کوردستانە کە موڵکییەتی تایبەتی پارتیو یەکێتییە، پەلاماری ئەو کوردستانە نادات کە کارخانە و کەپیتاڵو بیرە نەوتە، بەڵکو بەر لە هەر شت هێرش دەکاتە سەر ئەو کوردستانەی کە سەمبولی ژیانە بۆ هەموومان، ئەم هێزە تەنیا پەلاماری ئەو کوردستانە نادات کە ڕەهەندێکی ئابووری هەیە، بەڵکو پەلاماری کوردستانی زمان، کوردستانی خەیاڵ، کوردستانی یادەوەری، کوردستانی ژینگە دەدات'، بۆیە گەورەترین هەڵە بیکەین ئەوەیە وا بزانین کاتێك ناسیونالیستێك پەلاماری نەتەوەیەکی تر دەدات، تەماعی تەنیا لە سەر سامانە ئابوورییەکانە، بە پێچەوانەوە شەڕی ناسیونالیستەکان هەمیشە شەڕێکی سەمبولیکە، هەمیشە تێکشکاندنی هێزی ئەوی ترە لە سەر ئازادبوون'. بەختیار پاشان دیالێکتیکی ئاغا و کۆیلە دەهێنێتە ئاراوە بۆ شێوازی پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغدا یان کورد و بەغدا، بەڵام بە تێگەیشتنی ئێمە ئەم دیدە هەڵەیە. پەیوەندیی نێوان بەغدا و هەرێم پەیوەندیی نێوان کۆیلە و ئاغا نییە نە بە مانا هیگڵییەکەی و نە بە مانا کوردییەکەی، مەبەستمان لە هەناوی زمانی کوردیدا، کۆیلە و ئاغا مانایەکی سادەیان هەیە، هەرچەندە سیستەمی کۆمەڵاتیی کوردی کۆیلەی نەبووە بەڵام

---

1. ڕۆژنامە ئاوێنە:

http://www.awene.com/opinion/2012/11/20/16650

ئەوەی هەیە خزمەتکار و پیاو و دەت و پێوەند و شێوازی ترن کە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە ڕۆڵ و کاریگەرییان جیاوازە.

ڕەخنەیەکی تر کە دەتوانرێت لەم دیدە بگیرێت پەراوێزکردن یان کەمنرخکردنی ئابوورییە لە بەرامبەر شووناسدا، کە بە هەڵە تێگەشتنە لە سەرتاپا پرۆسەکە چونکە هەمیشە شووناس هیچ نییە جگە لە ڕووپۆشێك بۆ خواستی ئابووری. ئەگەر هەرێمی کوردستان جێگایەکی بێ نرخ بوایە لە ڕووی ئابوورییەوە، ئەوا پەیوەندی لە نێوان هەرێم و بەغدادا زۆر جیاواز دەبوو لەوەی کە ئێستا هەیە، چ لە ڕوانگەی بەغداوە و چ لە ڕوانگەی کوردوە. ئەم دیدە بەرهەمی ئەو تەوژمە سەقەتەیە کە سەرتاپا بوارەکانی زانستی مرۆڤایەتی و ئەدەبیاتی گرتۆتەوە لەم چەند ساڵەی دواییدا. پشتگوێخستنی ئابووری و جەختکردن لە سەر بەهای وەك ناسنامە یان شووناس. وەك ڕەخنەگرانی پۆست–مارکسیست بە باشی ئاماژەی پێ دەدەن ئەمە هیچ نییە جگە لە کەوتنە نێو خزمەتکردنی پرۆسەی کەپیتالیزمەوە. بە گشتی وەرچەرخان لە ئابوورییەوە بۆ کەلتوور وەرچەرخانە لە مارکسەوە بۆ نیتچە. لە هەمان کاتدا وەرچەرخانە لە قسەکردن لە سەر دادپەروەری، گووزەران، ژیار، بژێوی، دەرفەت، ئازادی بە مانا ڕاستەقینەکەی بۆ هەندێ بواری تراویلکەیی کە هیچ نین جگە لە بەرهەمی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی جیهانی. بەختیار دەڵێت 'کاتێك نازییەکان لە جەنگی جیهانیدا پەلاماری میللەتانی تریان دەدا، لەبەر سامانو سەروەتەکانیان نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو بیسەلمێنن دەتوانن هەموو میللەتانی دونیا بکەنە کۆیلە، بیسەلمێنن مرۆڤی ئەڵمانی باڵاتر و ئەوانی تر بچوکترن'. ئەمە بە هەڵەتێگەیشتنە لە سەرتاپا دۆخی کۆماری ڤایمەر. پاشان بەختیار عەلی بە بونیادنان لە سەر ئەم بونیادانە دەڵێت: "کێشەی سەرەکیی ناو عەقڵییەتی ناسیونالیستی کێشەی

بەهێز و بێهێزی، گەورە و بچوکییە، تەماحە ئابوورییەکان لێرەدا بەپلەی دووەم دێن". دیسانەوە هەڵەیەکی کوشندەی تر.

ئەگەربێت و بەراوردێك بکەین لە نێوان شێوازی سیاسەتەکانی حکومەتەکانی بەغدا لە ناوچە نەوتییەکان و ناوچەکانی تر لە ڕووی ڕامالین، بەعەسیکردن، دەستپێکردنی پرۆژە، هەموو دەرئەنجامی ترمان پێ دەڵێن. ئێمە بە پێچەوانەی بەختیارەوە کە دەڵێت 'جۆری ناسیونالیست هەمیشە بە ناوی سەروەریی نەتەوەوە شەڕ دەکات، شەڕەکەی ئەو شەڕیکلاسیکیو هەمیشەییەیە، کە دەرەنجامەکەی بە دروستکردنی «ئاغایەك» و «کۆیلەیەك» کۆتاییدێت'، بڕوامان وایە پرۆسەکە لێرەدا کۆیلە و ئاغا نییە. ئەوەیً لە ئارادایە سەپاندنی دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندە بە سەر سەرتاپا سنوورەکانیدا بە هەموو ڕەهەندەکانی. ئەم سەپاندنە بۆ ململانێکردن نییە لەگەڵ کورددا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ئەوان ئاغای کورد، بەڵکو بۆ توانەوەی کوردە، چونکە ئەگەر لە پرۆسەی ئاغا و کۆیلە ڕابمێنین ئەوا ئاغا کۆیلە ناکوژێت، نایەوێت شووناسی کۆیلەبوونی بگۆڕێت، ئاغا و کۆیلە لە پەیوەندییەکی ئالۆزدان کە بە پەیوەندیی دانپیانان ناسراوە هەر دو ولا پێویستییان بە یەکترە. لێرەدا حکومەتی ناوەندی دەخوازێت کورد نەبێت و جۆری نەبوونە یان بتوێنەوە یان ملکەچ و پەراوێزبن یان بە تەواوی بسڕێنەوە وەك لە ئەنفال و هەڵەبجەدا هەولیدا. کاتێك سڕینەوە شێوازی پەیوەندییەکەیە ئەوا پەیوەندیی ئاغاو کۆیلە لە ئاراد نییە. دوو دیاردە بە زەقی هەڵەی ئەم تێزەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ڕاگواستن و قڕکردن. ئەوەی ئێمە لەگەڵ بەختیاردا هاوڕاین ئەوەیە کە 'مەترسیی هەرە گەورەیش لێرەدایە، ئایا دوو هێزی وەك پارتیو یەکێتی کە نەیانتوانی وێنەی کورد وەك بوونەوەرێکی ئازاد بچەسپێنن، دەتوانن بەرگری لە مانا قووڵەکانی پشت ئەم هەڕەشە و جەنگە بکەن ؟ ئەوە شتێکە من گومانی گەورەم لێی هەیە'.[1]

---

1. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی دیالێکتیکی کۆیلە و ئاغا بنواڕە،
Andrew Cole (2004) What Hegel's Master/Slave Dialectic Really Means Journal of Medieval and Early Modern Studies 34.3 577-610

ئەم دیدەی بەختیار عەلی بە شێوەیەکی زەقتر لای عومەر حاجی عینایەت ڕەنگ دەداتەوە لە نووسینێکیدا لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی. بە لای ئەم بەڕێزییەوە "گەر سوپای مالیکی هێرش بکا ئەجێندای شۆڤێنیەتی عەرەب و بەرنامەی وڵاتێکی هاوسێمانی پێیە کە باوەڕی بە بوونی کورد نییە، مالیکی بۆ ئەوە نایەت تەنها دەسەلات لە دەسەلاتدارانی هەرێم وەربگرێ و سەروەت و سامانی نامەشروعیان زەوت بکا، ئەو دێت و دەیەوێ زمانی کوردی، هزری کوردایەتی، کلتووری کوردی خاک و نیشتیمانی کورد داگیر بکات و هەڵبوەشێنێ، ئەوەی (٢٢) ساڵە بونیاد نراوە بەو هەموو کەموکوڕییەیشەوە تەخت و تارانجی دەربهێنێ، ئێمە دەزانین ئەوانەی کە ئێستا سەرمایەدار و دەسەلاتدارن دەتوانن لەگەڵ داگیرکەراندا پێکبێن و هەڵ بکەن ئەوەی داگیرکەری قەبوڵ نییە و باجەکەی دەدا ڕۆشنبیر و کرێکار و جووتیار و پاڵە و هەژار و نەدار و خاوەن هەڵوێستە نیشتیمانییە ڕاستەقینەکانن کە تاقە خەمیان پاراستنی سەروەرییەکانی ئەم گەلەیە، بۆیە پێویستە ئەوانەیش کە کوڕی نازداری دوو حیزبەکە و حیزبە هاوپەیمانەکانیان نین ئەم جارەیش شان بدەنە بەر هێرشی کوللەئاسای ڕەگەزپەرستانی عەرەب و بەرگری لە خاکی نیشتیمان بکەن و بۆ دەسەلاتدارانی بسەلمێنن کە ئەوان پارێزەری ڕاستەقینەی ئەم خاکەن و جارێکی دی بیانکەن بە قوربانی وتەکەی ئیسماعیل بێشکچی کە دەڵێ: (خراپترین دەسەلاتی کوردی بۆ کورد لە باشترین دەسەلاتی نا کورد بۆ کورد باشترە). وەبیر دەسەلاتدارانی هەرێمیشی دەهێنمەوە کە چۆن دەبێت بەرگری لە ڕەوی کوللەی خوارووی بکرێت هەروایش دەبێ بەرگری لە هێرشی قەلەڕەشەکان لە باکوور و داڵاشەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە بکرێت، ئەو ڕاستییە لەیاد نەکەن ئێمەی کورد سێ دوژمنمان هەیە نەک یەک". ئەم دیدە هێندە شرۆڤەکاری نییە، ئەوەندەی خستەڕووی دۆخێکی سەختە لە ڕارایی. دەکرێت بوترێت کە پرۆسەکە لە ڕووی

فیکرییەوە بریتییە لە مامەڵەی عەقڵییانە، مەبەستمان لە عەقڵ بەکاربردنە لیبراڵ و نیولیبراڵەکەیەتی، بەوەی ئایا بەش دەکەیتە قوربانی هەموو. ئەگەر کوردستان لە لایەن یەکێتی و پارتییە و داگیرکراوە ئەوا تەنها بەشێکی داگیرکراوە، ئەگەر بێتو مالیکی بێت ئەوا هەمووی داگیر دەکات، بۆیە نابێت بەش بە گشت بگۆڕینەوە، بەڵام لە هەناوی هەر دوو دیدەکەدا یەك داواکاری خۆی پەنهان داوە ئەویش ترس لەوەی کە هەڵسوکەوتی بیست ساڵی ڕابردووی یەکێتی و پارتی، لاوازیی ئینتمای لای زۆرێك لە خەڵك گەیاندبێتە ئاستێك کە ئامادەنەبن بەرگری لە نیشتیمانیان بکەن، بۆیە هەر دوو نووسینەکە هەمان دونیابینی بونیاد دەنێن، لە هەمان کاتدا جۆرێکن لە بانگەشە نەك پرۆسەیەکی فرەلایەنی قووڵ.

دیدێکی تر کە درێژەپێدەری ئەم دیدەیە، بەڵام بەشێوازێکی تۆزێك جوداتر لە ڕووی وەبەرچاوخستنی ئارگومێنتەوە، ئەویش دیدی شێرکۆ کرمانج و ئارام ڕەفعەتە، ئەو دوو بەڕێزە لە مێژووی سەرەتای عێراقەوە دەست پێدەکەن، کە گوایە هەڵەیەکی کوشندە لە سەرەتای دروستبوونی عێراقدا ڕووی داوە بەوەی کە 'منەوەرەکانی کوردستان لە دوای جەنگی جیهانیی یەکەم هەڵەیەکی مێژووییان کرد کە گەلی کوردستان تا ئێستایش باجی ئەو هەڵەیەی ئەوان دەدات. ئەوان لە ململانێکانی نێوان مەلیك مەحمودی کوردو مەلیك فەیسەلی عەرەبدا پشتیان لە مەلیکە کوردەکە کرد و ڕوویان لە مەلیکی وڵاتێك کرد کە خەونی داگیرکردنی کوردستانی دەبینی'. لەسەرەتادا کورتکردنەوەی سەرتاپا پرۆژەی خستەسەر عێراقی باشووری کوردستان بۆ هەڵوێستی منەوەران، هەڵەیەکی کوشندەیە، چونکە بەدڵنیاییەوە ئەگەر منەوەران هەڵوێستیان بە شێوەیەکی جودایش بووایە ئەوا باشووری کوردستان هەر دەخرایە سەر عێراق، چونکە یەکێك لە هەرە زلهێزەکانی گۆی زەوی لە پشت ئەو پرۆژەیەوە بوو، کورد خۆی و خواستی لە بەرامبەر خواستی ئیمپراتۆردا هەرگیز بە هێند وەرنەگیرابوو، بەڵام مەبەست لەم

زیادەڕۆییە ڕووناکی خستەسەر ئەوە دۆخەیە کە ئێستا لە ئارادایە، بۆیە هەر زوو هەر دوو نووسەر دێنە سەر مەبەستەکەیان.

"بەداخەوە، ماوەیەکە ژمارەیەکی بەرچاو لە ڕووناکبیرانو خوێندەوارە ڕەخنەگرەکانی کوردستان هەڵوێستی پاسیڤ و بێموبالاتانەلە سەر هاتنی هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی دیجلە و لەشکرکێشییەکانی حکومەتی عێراقی لەخۆ نیشان دەدەن، بە تایبەتی لە سەر لاپەڕەکانی فەیسبووك. لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی لەسەرەوە باسکرا لەمەڕ هەڵوێستی منەوەرەکانی کوردستان لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا هەڵوێستی هەندێك لە خوێندەوارەکانی ئێستای کوردستان لە حکومەتی هەرێم، دەکرێت بڵێین خەریکە مێژوو بەشێوازێکی دیکەو لە زەمەنی ئەمڕۆدا دووبارەببێتەوە. کەمنین ئەو منەوەرە کوردانەی ئەمڕۆ کە لەبەر بوونی گەندەڵیو ناعەدالەتیو پاوانخوازیی یەکێتیو پارتی خەریکن شوێنپێی هەمان منەوەرەکانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو هەڵگرن. بە ئاشکرا یان بەنهێنی، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بانگەواز بۆ پشتکردنە نیشتیمان/کوردستاندەکەنو بێدەنگی لە هاتنی لەشکری مەلیکە نوێکەی عێراق (مالیکی)بۆ کوردستان هەڵدەبژێرن".

پاشان هەر دوو نووسەر دێنە سەر بەراوردکاری دۆخی هەرێم و دۆخی بەغدا و دەرئەنجام هەرێم براوەیە. هەر دوو نووسەر ئەوەیان لە بیردەچێت کە بڕ کێشە نییە، بەڵکو بوونی دیاردەکە بۆخۆی کێشەیە. گەندەڵی ملیارێك بێت یان دوو ملیار هەر گەندەڵییە. دیارە دەبێت گەورەیی و بچوکی نێوان هەرێم و بەغدا لە بەرچاو بگرین، چونکە ئەگەر هەرێم بە هەمان ئاستی بەغدا لە ڕووی بڕەوە گەندەڵ بێت ئەوا دەبێت هەموو بودجە بە تەواوی ببرێت.

ئەم نووسینە بەشێوازی نووسینەکانی تری پێشوو بانگەشەیە بۆ داکۆکیکردن لە کوردستان، سەرباری هەموو ناشیرینییەکانی، چونکە ئەو هێزەی

کە دەخوازێت داگیری بکات ناشیرینترە. لە هەر سێ نووسینەکەدا کۆمەڵێك هاوبەشی هەیە جگە لە بانگەشەکەیان، یەکەم: سەختی ئارگومێنتەکە، کە هەموو نووسەران پێویستییان بە بەهانە و بەڵگە و ترس و تۆقاندنی زۆر هەیە بۆ بونیادنانی ئارگومێنتەکەیان. دووەم: هەموو نووسەران لە دۆخێکی ویژدانیی سەختدا دەژین کە ناچارن داکۆکی لە بوونێك بکەن کە خوازیارن وەها نەبووایە، بەڵام لە جۆرێك لە ڕاڕایی سەختدان. سێیەم: هەموو نووسەران لە میانەی و بەرچاوخستنی ئەم دیدە ئازاراوییەدا کۆمەڵێك لایەنی گرینگیان فەرامۆشکردووە، جگە لە بەختیار عەلی لە دوا دێڕدا بە گومانێکەوە بەرچاوی دەخات.

پرسی گرینگی وەك، ئایا ئەم دۆخە لاوازیی شپرزی و دووبەرەکی و ململانێی ناوخۆیی و تۆران لە نیشتیمان هەرێمی هێندە لاواز نەکردووە لە توانای بەرگری نەبێت. هەموو نووسەران لەوە بێ ئاگان کە ئەمە قۆناغێکی نوێیە، عێراق تیایدا دروست دەبێتەوە و هەرێم دەبێت شەڕێکی درێژخایەن بکات، کە بەداخەوە مێژووی کورد پێمان دەڵێت لە کاتێکدا کورد قارمانانە شەڕ دەباتەوە بەڵام هەمیشە جەنگ دەدۆڕێنی. هیچ کام لەم نووسەرانە دۆخی جەنگیان وێنا نەکردووە، بەڵام هێشتا وا دەزانن ئەوەی ڕوو دەدا بریتییە لە شەڕێك و پاش ئەنجامدانی لە ساتێکی کورتدا کۆتایی دێت. دوو شت کاریگەریی کوشندەیان هەبوو و هەیە لە سەر کورد، یەکەم: هەڵوێست و هەڵوێست—نواندن. دووەم: قارەمانێتی. هەر دوو ئەم دوانە لە زۆر ڕووەوە لە یەك دەچن، بریتین لە دەرکەوتەیەکی سوپەرمانانە، لە ساتەوەختێکی کەمدا بۆئەوەی کونێك بکاتە ئەو دۆخەی کە لە ئارادایە، بەڵام چونکە توانای بەردەوامبوونی نییە ئەوا لە ئەنجامدا تەنها وەك گردێکی بچکۆلە دەردەکەوێت لە دەشتاییەکی فراواندا.

لە بەرامبەر ئەم دیدە بانگەشەییانەدا نووسینێکی بورهان یاسین زیاتر قووڵتر و بە ئاگایانەیە. بورهان لە سایتی سبەی دەنووسێت 'کاتێك سیاسەت

ئاراسته ڕاست و دروستەکانی لە دەست دەدات'. بە لای بورهانەوە، 'زۆرجار کەس و لایەنەکان دەکەونە هەڵەیەکی زۆر جیدییەوە، کاتێك بۆ تێگەیشتن لەو قەیرانەی کە ئەمڕۆ بەرۆکی پانتاییی سیاسی لە باشووری کوردستان گرتوە، باس لە سەرەتای دروستبوونی ئۆپەراسیۆنی دیجلە یا هەندێ ڕووداوی تری لەو جۆرە دەکەن. بەلای ئەوەوە قەیرانەکە سەربازی یان ئانی نییە، بەڵکو ڕەگی قووڵی هەیە. 'لەبەرامبەردا دەمەوێ ئەوە جەخت بکەمەوە کە تەواوی کێشەکە پێ لە کۆمەڵێك هەڵەی جیدی هەڵدەگرێ کە هەر لە سەرەتای سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق، دوای کەوتنی دیکتاتۆر، سەرکردایەتیی سیاسیی باشووری کوردستان تێیان کەوت. ئەم هەڵە سیاسییانەیش زیاتر دەربڕی خۆشبینییەکی سیاسی بێ بنچینە و بێ بنەما بوو. ئەو خۆشبینییەیش دەرهاوێشتەی خوێندنەوەیەکی بە هەڵەی سەروبەری ڕوانگە سیاسییەکە بوو'. ئەو خۆشباوەڕییەی کە سەرچاوەی هەڵەکانە بە لای بورهانەوە خوێندنەوەیەکە کە ڕەنگدانەوە و دەربڕی جیهانبینییەك بوو کە هی دوێنێیەکی زوو و کات بە سەر داچوو بوو، جیهانبینییەك کە خۆی لەو بڕوایە دەبینییەوە کە شێوەیەك لە شێوەکانی ئۆتۆنۆمی دەتوانێ چارەسەری کێشەی کورد بکات. دیوەکەی تری ئەو باوەڕەیش ئەوە بووە کە دیموکراسی دەتوانێ ئەو زامنە بێ کە کورد لە چوارچێوەیدا بە مافەکانی بگات، بە بێ ئەوەی بیری لەوە کردبێتەوە کە سیستەمی هەڵبژاردن دەکرێ نەتەوەی سەردەست بکات بە خاوەنی پێگەی زۆرینەی دیکتاتۆری. لە لایەکی ترەوە لەم ڕۆژانەدا، دوای ئەوەی کورد زۆر درەنگ کەوت لە تێگەیشتنی ئەو مەسەلەیە، ترسێکی گەورە لەوە هەیە کە حکومەتی داهاتوو هی زۆرینە (تۆ بڵێ دیکتاتۆریەتی زۆرینە) بێ و ئەگەرێکی هەرە بەهێزیش ئەوەیە کە کورد بێبەش بکرێ لەو حکومەتە زۆرینەیە.

بورهان بە پێچەوانەی نووسەرانی پێشوو دەنووسێت 'هەڕەشەی گەورە بەغدا نییە، بەڵکو هەڕەشە ئەوەیە کە هەڵگرانی لۆژیکی سیاسیی هەڵە و جیهانبینییەکی چەوت و شکستخواردوو سەرکردایەتیی کورد دەیکەن، وەك مۆتەکە لە سەر کێشە جوان و ڕەواکەی دانیشتوون' خەراپتریش لەوە ئەو کێشە جوانەیان کردووە بە دیوارێك خۆیانی لە پشت حەشار دەدەن و دەیکەن بە قەڵغانی بەرگریکردن لە خۆیان... بەردەوامیی هاوکێشەکان بەم شێوەیە بە ئەگەری زۆر کاریسەیەکی نەتەوەییی گەورە بۆ کورد بە دوای خۆیدا دەهێنێ[2].

گەرچی ئەم دیدەی بورهان لە هەموو دیدەکانی تر ستراتیژییانەتر داڕێژراوە و خۆی لە وەهمی ناسیۆنالیزم و قسەی خۆشی ڕۆژانی ئاشتی بە دوور گرتووە. دەکرێت ڕەخنەی گەورە لە دیدەکانی بورهان یاسین ئەوە بێت کە ئایا چۆن لە نێوان مەترسیی بەهێزبوونی عێراق و بە لاوازمانەوەی کورددا سیاسەت بکرێت. دیارە بێگومان ئەرکی ئۆپۆزسیۆنێکی وەك گۆڕان دووجار قورسە یان لەڕاستیدا سێ جار. چونکە، کاتێك بەشدار نابێت ئەوا هەر زوو ئامرازەکانی میدیای ورووژێنەری دەسەڵات وێنای خیانەتکاری بەر بەردا دەکەن و خەڵکی بە گشتی لە دۆخێکی پڕ لە ڕاڕایی و نا سەقامگیر وەهادا ڕەنگە خۆیان لە بیرکردنەوەی قووڵ بە دوور بگرن. دووەم: لە کاتی ڕوودانی ڕووبەڕووبوونەوەدا ئەوا جۆرێك لە سڕینەوەی یادەوەری دێتە ئاراوە، بەم پێیە ئەگەر چالاکانە ئامادە نەبێت، ئەوا ڕەنگە ببێتە یەکەم قوربانیی شەڕ یان باجێکی قورسی بدەی. سێیەم: چۆنێتیی مامەڵەکردنی یەکێتی و پارتی لەگەڵ قەیرانەکەدا، لە ئەنجامدا کاریگەری هەیە لە سەر پێگەی بزووتنەوەی گۆڕان، بۆیە گۆڕان سڵ نەکاتەوە لە جەختکردن لەوەی کە تەنها لە ڕێگای کوردستانێکی تۆکمە و بەهێز و ئازاد و گەلدۆستەوە دەتوانێن ڕووبەڕووی قۆناغی داهاتوو ببینەوە.

بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە ئەوەی دەگووزەرێت بەرئەنجامی قەیرانێکە لە ئیپستیم. مەبەستمان لە قەیرانی ئیپستیم ئەوەیە کە نەتوانی لە ئەزموونت، لە یادەوەریت، لە دۆخی ڕاستەقینەت، لە شێوازی پەیوەندیت، لە دۆخی بوونت، لە پێگەی نێودەوڵەتیت، لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیت، لە مێژووی تراژیدیاکانت، لە کەلەپوورت، لە بەهاکانت سوود وەربگریت، بیانکەیتە کۆمەڵە سەرچاوەیەك بۆ تێگەیشتن لە ئێستا. هەر سیاسەتێك نەتوانێت بیری قووڵ و پەرچەکرداری ئانی پێکەوە گرێ بدات ئەوا هەمیشە قوربانی دەستی ئەوانەیە کە دەتوانن بەو کارانە هەستن. دیارە قەیرانی ئیپستیمی سیاسیی کوردی کۆمەڵێك سەرچاوەی هەیە، یەکەم: تەسکیی ئاسۆ، دووەم، خۆشباوەڕی یان کاڵفامی، سێیەم: بیرکردنەوە تا دوای نیوەڕۆ، چوارەم: لە سەرووی هەموویەوە تەسکردنەوەی هەموو شتێك لە ئاگاییی چەند کەسێکدا. باڵاییی بەرژەوەندیی خێزان و بنەماڵە لەبری بەرژەوەندیی خەڵك. لەڕاستیدا خەڵك وەك بوونەوەر هیچ مافێکی سیاسییان نییە، لە هەرێمدا، داخوازییان هەموو خزمەت و دامەزراندن و کاروباری بژێوییە، کە زیاتر ڕەهەندی ئابووری هەیە لەبری سیاسی، بەڵام خواستی ئابووری نیشانەی قەیرانی سیاسییە، کە بەداخەوە دەرکی پێ ناکرێت. ئەوە سیاسەتە ئابووری لە قاڵب دەدات لە جێگایەکی وەك هەرێمدا، نەك بە پێچەوانەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵێك هۆکاری تر هەیە وەك هەست بە کەمیکردن. ڕامان لە ڤیدیۆکانی سەدام حسێن لە کاتی کۆبوونەوەکانیدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کەسی سەرکردەی دیکتاتۆر هێندە نارسیسە ناتوانێت هەرگیز بیرێکی تر قبوڵ بکات لە دەرەوەی بیرکردنەوەی خۆی، لە بەرامبەر هەر جیاوازێکدا هەڵەشەیی و تووڕەبوون و سزادان بەکار دەبات. هەموو ئەمانە ترسن لە پێگەی خود وەك بیرکەرەوەیەك کە بێ توانایە لە بیرکردنەوەو، هەر ساتێك کە بیر دەخرێتەوە لە بێ توانایی ئەوا هەڵوێستی بازاڕی و توند و پڕ لە توندوتیژی دەبێت.

جێی ئاماژەیە کە هەر دوو نووسەران، مەریوان وریا قانیع و ئاراس فەتاح دوو بابەتی درێژیان لە ڕۆژنامەی ئاوێنە نووسی. نووسینەکەیان لە بەرامبەر نووسینەکانی تردا تۆکمەتر بوو، بەڵام وەك ڕەخنەیەکی گشتی ڕەهەندییەکان، ئەوان زیاتر بایەخ بە دەرکەوتە و بەکاربردنی ڕووداو دەدەن لەبری هۆکار و دەرئەنجام. ڕەهەندییەکان بە گشتی لە لۆجیکی جیوپۆلەتیك و ئابووری و سیاسەت و پەیوەندیی نێودەوڵەتی و دەوڵەت وەك پێکهاتەیەکی ئاڵۆز خۆیان بە دوور دەگرن و هیچ کامێکیان تایبەتمەند نین لە هیچ کام لەم بوارانەدا. دیارە بێگومان پارتی ئەم ڕووداوە بەکار دەبات بۆ خۆ بەقارەمانکردن هەروەها بۆ هۆنینەوەی حیکایەتی جەنگ کە مێژووی پاش ڕاپەڕینی لێی بێبەرییە. ئەو نەوە نوێیە کە پارتی دیموکراتی کوردستان پێك دەهێنن لە تەمەنیاندا فیشەکێکیان بەرامبەر غەیرە کورد نەتەقاندوە. دۆخێکی ئەخلاقی سەختە، بۆ کەسێك بیر لە ئەخلاقی سیاسی بکاتەوە و هەڵگری خیتابی نەتەوەیی بێت، بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی مێژووی درێژخایەنەوە، لۆنگ جیورەی، تەماشای بکەین، لە پێنج سەدەی ڕابردوودا کورد زۆر ململانێی یەکتری کردووە بەڵام فاکتەر و بزوێنەر و دەرئەنجامەکان هەرگیز بە مەبەستی هێزە کوردییەکان نەکەوتۆتەوە. گەرچی هەمیشە فاکتەری ناوەکی فاکتەری سەرەکییە. شەڕی کورد بەرامبەر بە کورد گەورەترین و پیرۆزترین شەڕە بەلای زۆرینەی هێزە کوردییەکانەوە بە تایبەت هێزە چەکدارە بنەماڵەییە تەقلیدییەکان، بەڵام دەستکەوت هەمیشە دۆڕان بووە.

### ٥: عێراق وەك ئامێری بەرهەمهێنی دیکتاتۆر:

دیکتاتۆریەت زاراوەیەکی پڕ ئازارە، لە عێراقدا لە مێژوویەکی نزیکدا کەسێك بوو. پاش ڕۆشتنی ئەو کەسە باشتر بۆمان ڕوون بووەوە کە ئەو کەسە هەرچەندە

دیکتاتۆر بوو، بەڵام دیکتاتۆربوونی تایبەت نەبوو بە ئەوەوە، لێرەدا قسە لە عێراق دەکەین وەك ئامێرێك کە بواری دا بوونەوەرێکی وەك سەددام بهێنێتە ئاراوە و پاشان بیکاتە کەلتوور. دیکتاتۆر خاوەن دەسەڵاتی ڕەهایە. کە مرۆڤ خاوەن دەسەڵاتی ڕەها بوو وەك جۆرە شێتێك مامەڵە دەکات، بەڵام ئەم شێتبوونە کاری ئێمە نییە لێرەدا ڕاڤەی بکەین. ئەم شێتییە خۆی لە سەرکێشی و خۆنواندن و سواڵی سەرنج و زۆر کاری تردا دەردەکەوێت.(١)

وەڵامی ئەو پرسیارەی ئێمە لێرەدا بە دوایەوەن ئەوەیە کە، ئایا عێراق کارگەییەکی بەرهەمهێنانی دیکتاتۆرە؟ بۆ ئەوەی دیکتاتۆربیت چیت پێویستە، با لەسەرەتادا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بگەڕێین. گەر بگەڕێینەوە بۆ پێناسە سادەکەی دیکتاتۆر ئەوا بۆمان دەردەکەوێت، بوون بە دیکتاتۆر پێویستی بە کەسێکە کە بتوانێت لە خۆیدا دەسەڵاتی ڕەها کۆ بکاتەوە. بەو مانایە خۆی ببێتە تاقە سەرچاوەی شەرعیەتی بڕیاری سیاسیی خۆی. لە هەمان کاتدا دەبێت بپرسین ئایا چۆن دەتوانرێت کە لە کەسێکدا، لە تەنها کەسێکدا، دەسەڵاتێکی ڕەها کۆ بکرێتەوە، بەو مانایە کە کەسی تر، هیچ پێکهاتەیەکی تر، هیچ لایەنێکی تر بۆی نەبێت هیچ دەربارەی دەسەلات بڵێت، سەرجەم کۆمەڵگا کورت بکرێنەوە بۆ پەیڕەوکەری دەسەلات، پیادەکەری دەسەلات. ئەمەیە کە هەمیشە تۆتالیتاریەت، یان سەرتاپاگەرایی، بەستراوەتەوە بە دیکتاتۆریەتەوە. دەسەڵاتی دیکتاتۆری بۆئەوەی فەراهەم بێت دەبێت سەرتاپا کۆمەڵگا بخاتە ژێر ڕکێفیەوە، هەموو جیاوازێك بسرێتەوە، هەموو سەرچاوەیەکی مەترسی لە ناو ببات. بەکورتی سەرتاپا کۆمەڵگا ببێتە یەك تۆپەڵ. دیارە ئەم بیرە بە ڕۆژهەڵات نامۆ نییە. ئیسلامی سیاسی بۆ نموونە خۆی بە بزووتنەوەیەك دەزانێت کە ئەرکی ئەوەیە سەرتاپا کۆمەڵگا وەك یەك لێ بکات.

---

[1]. Jacques Derrida, The Beast and the Sovereign, Volume 1, Geoffrey Bennington (tr.), U. of Chicago Press, 2009, 349p.

وەك زوهێز جەزائیری لە کتێبی ستەمکاردا (چاپی عەرەبی بەیروت) دەڵێت، هەڵەیە وەها بزانین کە سەرۆکپەرستی بەرهەمێکی تایبەتی بەعسە، بەعسییەکان لە کۆمەڵێك نەریتەوە درێژەیان پێدا کە ڕەگەکەی لە ئایینداپە کە مرۆڤی لاواز لە بەرامبەر سروشت و جەوری کۆمەڵگادا پاڵ پێوە دەنێت بۆئەوەی پەنا بەرێت بۆ ئیمامێکی بێگوناه بۆئەوەی ببێتە واستە لە نێوان ئەو و خالقیدا، هەروەها لە کەلتووری خێڵەوە کە لە سەر گرێبەستێکی ئەبەدی دروست بووە لە نێوان تاکەکان و سەرۆك عەشیرەتدا، کە لەبری هەمووان هەڵسوکەوت دەکات، لە هەمان کاتدا سەرۆکپەرستی ڕەگی لە ژیانی سیاسیی ئەم سەردەمەشدا هەیە کاتێك کە کەسایەتیی حیزبی سەرۆك ڕۆڵێك دەبینێت کە باڵاترە لە ڕۆڵی ئەو بیرانەی کە هەوڵی پێکەوەنانی پێگەی سەرۆك دەدەن، بە مانایەکی تر کەسایەتیی خۆی باڵاترە لە هەموو ئایدیۆلۆژیایەك. ئەم دۆخە لە ناوەندە تایبەت و بچوکەکانیشدا بەرجەستە دەبێت کاتێك باوکێك لە خێزاندا وەك ڕۆڵی دەسەلاتی باڵا دەبینێت و هەموو دەبێت ملکەچی بن، لە هەمان کاتدا کاتێك سەرۆك دەبێتە باوك ئەوا هەمووان دەبنە منالی و دەبێ گوێڕایەڵی بن. زوهێز جەزائیری لە کتێبی ستەمکاردا بە وردی باسی ئەم دۆخە دەکات لە ئاماژەکردنیدا بە دەسەلاتی سەدام.

بەڵام ئێمە لێرەدا جەخت لە سەر عێراق دەکەینەوە وەك ئامێرێك بۆ بەرهەمهێنانی دیکتاتۆریەت بە شێوازی تایبەتیی خۆی. کە وەها دەڵێین مەبەستمان لەوەیە عێراق وەك پێکهاتە، وەك سەرچاوەی ئابووری، وەك مێژوو، وەك ئاگاییی مرۆیی ئامادەیە بۆ دیکتاتۆر.

عێراق وەك پێکهاتە، مێژووی مۆدێرنی عێراق مێژووی دیکتاتۆرە یەك لە دوای یەکەکانە. ئەوانەی خۆیان بە دیکتاتۆر نازانن بە ئاسانی دەچنە خانەی دیکتاتۆرەوە. یەکەم سەرچاوەی دیکتاتۆربوون ئەوەیە کە هێشتا لە ئاگاییی

مرۆڤی ئەم ناوچەیەدا ئەو ئاگاییە نەهاتۆتە ئاراوە کە دەسەلات لە دەرەوەی کەس بێت. هێشتا بە ئاسانی پێناسەی دەسەلات لە کەسەکاندایە. هێشتا مرۆڤ لە عێراق ناتوانێت وێنای دەسەلات بکات لە دەرەوەی کەس. ئەم خەیاڵە ئامادەیە، هەمیشە کارئاسانییەو هاندەرە بۆئەوەی هەرکەسێك کە دەرفەتی بۆ دەستکەوێت ببێتە ئەو کەسەی کە هەمووان بە خاوەن دەسەلاتی دەزانن. بەو مانایە فشارێکی کۆمەڵایەتی لە سەر کەسی بەرپرس هەیە بۆئەوەی ببێتە ئەو کەسەی کە هەمووان لە خەیاڵیاندا هەیە بۆ کەسی دەسەلاتدار. لە ئەنجامدا کەسی دەسەلاتدار دەبێتە کەسێکی کاریکاتۆری، بەوەی هەمیشە لە هەوڵی خۆسەپاندندایە بە سەر ئەوانی تردا بە هەموو ڕێگایەك. هەر ئەمەیش سەرچاوەی ئەوەیە لوی ئەلتۆسێر ستەمکاری ڕۆژهەڵاتی بە جۆرێك لە کاریکاتۆر ناو دەبات. (١)

لە کاتێکدا کە پاڵنەرێکی وەها هەیە ئەوەی ترسناکە کە پێکهاتەی عێراق وەك ئیتنی هۆکارێکی ترە بۆ ئەم دیاردەیە. هەرگیز هیچ سەرۆکێك نابێت لە عێراقدا بە دڵی هەمووان بێت، بەڵام هەموو بەرپرسێکی باڵای عێراق لە هەوڵی ئەوەدایە کە ببێتە دەسەلاتدار بە سەر هەمووانەوە یان هەمووان وەها لێ بکات کە دان بە دەسەلاتی ئەودا بنێن. بەڵام لە هەمان کاتدا بە ئاگایە کە کارێکی وەها مەحاڵە بۆیە، سڵ ناکاتەوە لە بەکاربردنی هێز و توندوتیژی بۆ فەراهەمبوونی ئەم خەونە. ئەم دۆخە ڕێك بۆ کوردستانیش ڕاستە. هیچ لایەنێکی سیاسی لە توانایدا نییە ببێتە دەسەلاتداری سەرتاسەری هەرێم، بەڵام هەموو یان بە تایبەت دوو لایەنە سیاسییەکەی مێژووی نوێ هەمیشە لە خەونی فەراهەمبوونی ئەم خەونەدا بوون. هەموو هەوڵێك بەو ئاقارەیە. سەدام حسێن لە ڕۆمانەکەیدا (زوبیدە و

---

[1]. Althusser, L 1970, 'From capital to Marxs philosophy, in Reading capital, eds L Althusser
E Balibar, trans. B Brewster, New Left Books, London, pp. 11–69 .

مەلیك) بە ڕوونی ئاماژەی پێ دەدات. کاتێك مەلیك سڵ ناکاتەوە لە بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ ناچارکردنی زوبیدە بۆ ئەوەی خۆشی بوێت. دیارە لە کەلتووری کۆمەڵایەتیی ڕۆژانەدا خۆشەویستیی وەها دەبینرێت کە جۆرێکە لە ڕاهاتن. ئەمە بە ڕوونی لە لێکدانەوەی پەیوەندیی خۆشەویستیشدا ئامادەیە.

هۆکارێکی هێجگار کاریگەری تر لەم بوارەدا بوونی سەرچاوەیەکی سروشتی بێشومارە لە عێراقدا کە دەست و برد دەخرێتە خزمەتی فەراهەمبوونی ئەم خەونانەوە. سامانی سروشتیی عێراق لە ڕووی نەوت و گازەوە هێندە زۆرە کە بەشی زیاتر لە ٢٠٠ ملیون خەڵك دەکات، بەڵام بە جۆرێکی وەها بەفیڕۆ دەدرێت کە لە وڵاتێکی کەمتر لە سی ملیۆن خەڵك زۆرینەیان لە ژیانێکی ژێر هەژاریدا دەژین. هەمان دید بۆ ئێستای هەرێم ڕاستە کە سامانی سروشتی بەکار دێت بۆ سەپاندنی جۆرێکی تایبەت لە سیستەم ئاگاییی سیاسی، کە تەنها خزمەتی دوو بنەماڵەو دار و دەستەکەیان دەکات.

هەبوونی ئەم بنەمایانە هەموو پێکەوە کە خۆی لە کەلتوور و وێناو پێکهاتەی فرەییی عێراق و سەرچاوەیەکی زۆری سامانی سروشتیدا هەموو پێکهێنەری ئەو ئامێرەن کە دەبنە هۆی دروستبوونی دیکتاتۆر، بۆیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ عێراقدا دەبێت هەمیشە وەها ببینرێت کە دیکتاتۆریەت یەکێکە لە ئەگەرە گەورەکانی دەرئەنجامی دەسەڵات.

ئێمە لێرەدا دەبێت دیکتاتۆر لە شێوازە ڕۆژهەڵاتییەکەیدا وێنا بکەین نەك شێوازە ڕۆژئاواییەکەی. گەرچی هاوشێوەییەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەم دوانەدا بەڵام تایبەتمەندیی تایبەتیش بوونی هەیە. گۆبڵز لە وتارێکی کورتیدا لە ساڵی (١٩٣٩) دەڵێت کە دیکتاتۆریەت پێویستی بە سێ شتە کەسێك، ئایدیایەك و خەڵکێك کە دوای بکەون. بەڵام جیاوازییەکی گرینگ لە نێوان ئەم دیدە ئەڵمانییە بۆ دیکتاتۆریەت و دیکتاتۆریەت لە عێراقدا ئەوەیە کە دیکتاتۆریەت لە

عێراقدا پێویستی بە ئایدیا نییە. خەڵکی عێراق خەڵکێك نین کە لە ڕێگای ئایدیاوە بەیەکەوە خۆیان گرێ بدرێن، زیاتر ئایین و تایفە و ئیتنی بونیادی یان چیمەنتۆی پێکەوە بەستنیانە، بۆیە پێویست نییە دیکتاتۆر ئایدیۆلۆژیای هەبێت. لەڕاستیدا هەبوونی ئایدیۆلۆژیا ڕێگرە بۆ بوون بە دیکتاتۆر چونکە ئایدیۆلۆژیای کەس دیکتاتۆر دەکاتە دەسەڵاتدارێك کە شێوازێك لە باوەڕ و ژیان و ژیار بسەپێنێت، بەڵام دیکتاتۆر لە عێراقدا ناتوانێت بە کارێکی وەها هەستێت بەڵکو دەبێتە درێژەپێدەری ئەو کەلتوورە تاکپەرستییەی کە لە ئارادایە بە گۆڕانکارییەکی ڕووکەش لە ناو و شێواز و میکانیزمدا.[1]

کاتێك ئێمە بەشێکین لە وڵاتێك کە بنەما کۆمەڵایەتی و کەلتووری و ئایینی و ئابوورییەکە هەموو ڕاستەوخۆ و ناراستەخۆ دروستکەری دیکتاتۆرن، ئەوا یەکەم دەبێت دەرك بەم ڕاستییە بکەین و وەك ڕاستییەکی نەگۆڕاو مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. هەوڵی مالیکی بۆ بوونبە دیکتاتۆر وەك لە جێگایەکی تری ئەم باسەدا ڕاڤەی دەکەین نیشانەی ئەوەیە کە سەرباری ئەو هەموو نەهامەتی وتراژیدیا و قاتوقڕییانە عێراق هێشتا وەك ئامێرێك یان کارگەیەکی دروستکەری دیکتاتۆرە.

### ٦: ڕاپەڕین:

ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) لە چەند ڕوویەکەوە گرینگە بۆ تێگەیشتن لە ئێستا.
یەکەم: ڕاپەڕین ساتەوەختێك بوو کە عێراق تیایدا لاوازبوو، لە جەنگدا دۆڕابوو، لە ڕووی نێودەوڵەتییەوە تەریك بوو، باوەڕ و بڕوا بە سەرتاپای سیستەمەکە لە ناو خەڵك و سوپادا ڕووخابوو. تا لەم ساتەوەختەدا کورد توانی ڕاپەڕێت و بە ئاسانی شارەکانی خۆی، بە تایبەت ئەو شارانەی کە هەموو کوردنشین بوون لە دەسەڵاتی عێراقی پاك بکاتەوە. ئەم خاڵە زێدە گرینگە، لە هەرکوێ جێگایەك

---

[1] خوێندنەوەی وتارەکەی گۆبلز سەردانی ئەم بەستەرە بکە:
http://www.calvin.edu/academic/cas/gpa/angrif13.htm

زۆری زۆری کوردبێت ئەوا باڵادەستی کورد تیایدا ئاسان دەبێت، لە هەرکوێ جێگایەك تێکەڵ بوو، ئەوا کورد ناتوانێت بە ئاسانی تیایدا حکوم بکات. ئەمە وانەکانی بونیادی هێزمان بە باشی بۆ ڕوون دەکاتەوە. بەڵام ئاگایی ستراتیژی کوردی نەیتوانیوە ئەم قەیرانە چارەسەر بکات. بە مانایەکی تر ئەگەر دیمۆگرافیا هێندە گرینگە چۆن دەتوانرێت کاری لە سەر بکرێت، ڕۆڵەکەی کەم بکرێتەوە یان هاوسەنگیی دیموگرافی بهێنرێتە ئاراوە.

ڕاپەڕین خاڵی وەرچەرخان بوو لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم: دەسەڵاتی بەغدا لە کوردستان سەرەتا لاوازبوو پاشان نەما،

دووەم: هەر دوو هێز کوردی دەستیان کرد بە فەراهەمکردنی پرینسیپی کرۆکی خۆیان ئەویش کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگای کوردستان، لەپێناوی سەپاندنی دەسەڵاتی تاکلایەنەی هەمیشەیی حیزبییاندا.

لە ئەنجامی لاوازیی بەغداد و دروستبوونی پانتایی بۆ دەسەڵاتی کوردی، دەسەڵاتی کوردی لە دوژمنی دەرەکی ڕزگاری بوو و پرۆسەی ڕوویەڕووبوونەوەی یەکتر دەستی پێکرد. ئێمە ئەم ساتەوەختە بە خاڵی وەرچەرخان دادەنێنن، چونکە شێوازی مامەڵە، کوردبوون، پەیوەندی، گوزارەکردنی دەسەلات هەمووی گۆڕاو، لە ئەنجامدا کۆمەڵێك دەزگای سیاسی و کۆمەڵایەتی و حکومکردن هاتنە ئاراوە. هەر دوو یەکێتی و پارتی بە دوو شێوازی جیاواز پەلاماری کۆمەڵگای کوردستانیاندا. پارتی وەك هێزێکی لاوازی دوور لە خەڵکی لە بەرامبەردا یەکێتی وەك هێزێکی باوەڕ بە خۆی، ئامادەبوو و خاوەن هێزی ئامادە لە یادەوەریی خەڵکدا. پارتی هەموو کەسێکی لە خۆی دەگرت، یەکێتی لەبری لەخۆگرتن خۆی دەسەپاند. پاش ماوەیەکی کەم لە ئەنجامی ئەم سیاسەتە پارتیش وەك هێزێك دروستبۆوە.

باوەڕی نەگۆڕ لە هەناوی هەر دوو لایەندا ئەوەیە کە هیچ کام ناتوانێت دان بە بوونی ئەوی تردا بنێت و، هەر دوو لا وەها لە خۆیان دەڕوانن ئەگەر بێتو لەنێو پرۆسەی دیموکراسیدا لایەك دان بە باڵادەستی یان سەرکەوتنی لایەکەی تردا بنێت ئەوا لای سەرکەوتوو هەوڵ دەدات بۆ هەمیشە لای سەرنەکەوتوو بسڕێتەوە، یان هێندە لاوازی بکات تەنها بوونێکی ئاهەنگی هەبێت. بوونی ئاهەنگی بریتییە لە جۆرێك بوون کە تەنها لە ڕۆژانی ئاهەنگ و ڕووداوەکاندا وەك پێداویستییەك بۆ پڕکردنەوەی وێنە یان کۆمبارس دەردەکەویت. ئەم دۆخە ئاگایییە سەرچاوەی دۆخی شەڕە کە سروشتی پەیوەندیی نێوان یەکێتی و پارتییە.

**٧: دۆخی شەڕ: وەك سروشتی پەیوەندی:**

بۆ سروشتی پەیوەندیی نێوان یەکێتی و پارتی چەمکی دۆخی شەڕی بەردەوام بەکار دەبەین. دۆخی شەڕ سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کتێبی بەناوبانگی تۆماس هۆبز (لیڤیاسان).[١]

لای هۆبز ئەم دۆخە سروشتییە. مرۆڤەکان ترسیان هەیە لەیەکتر، هەموو کەس دەتوانێت کەسێکی تر بکوژێت، هەموو کەس کەسێکی تر وەك مەترسی و دوژمن لە قەڵەم دەدات. بێ بڕوایی و بەدگومانی و مامەڵەکردنی ئەوی تر وەك نەیار سروشتی پەیوەندییەکانە. ئەمەیش لەبەرئەوەی ئەو سەرچاوانەی کە هەن بەشی هەمووان ناکەن و هەموو لە هەوڵی ئەوەدان کە بەشی خۆیان بپچڕێنن.

پیادەکردنی ئەم دیدە لە سەر یەکێتی و پارتی بەم شێوەیەیە: دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان دەبێت لە لایەن هێزێکەوە بەڕێوە بچێت. بەڵام ئەوە هێزە کێیە؟ هیچ کام لە دوو هێزەکە ناتوانن دان بەوەدابنێن کە ئەوی ترە، بۆیە لە ئەنجامدا ئەوەی دێتە ئاراوە بریتییە لە شەڕی هەر دوو لا بۆ ئەوەی لایەك

---

1. Jean Hampton1985 Hobbes's state of war Topoi, March, Volume 4, Issue 1, pp 47-60

براوەبێت و ببێت بە خاوەن دەسەلاّتەکە. لێرەدا وەك دەبینی لە هەناوی ئەم دیدەدا خاوەندارێتی بۆ دەسەلاّت هەیە، کە بنەماکەی لە ستەمکاریی ڕۆژهەلاّت دایە. هەروەها باوەڕ بە خاوەندارێتیی تاقانە هەیە وەك ماف. هەتا ئەم دیدە لە ئارادبێت کە خەلّکانێك هەن کە مافیانە لە سەر کورسیی دەسەلاّت بن ئەوا هەرگیز دیموکراسی بە مانای مافی خەلّك بۆ حوکمکردن یان تەنانەت بەشداریکردنیشیان لە حکومدا نایەتە ئاراوە. دووەم: بەشکردنی کوردستان بۆئەوەی هەر دوو ببنە خاوەن دەسەلاّت و سێیەم: هەر دوو پێکەوە بە هاوتەریب خاوەنن. هەموو ئەم شێوازانە ئێستا لە ئارادان. هەموو ئەم شێوازانە هیچ نین جگە لە ڕێگەگرتن، نەبوونی توانا بە داننان بەیەکتردا. کاتێك دوو هێز لەم جۆرە پەیوەندییەدان ئەوا هەرگیز دەستاودەستی دەسەلاّت نایەتە ئاراوە، هەرگیز ئۆپۆزسیۆنبوون نایەتە ئاراوە، هەرگیز دیموکراسی بەرقەرارنابێت. لەبری ئەمانە ململانێی و بێ باوەڕی و کێنەبازی و پاشقول لەیەکدان و هەولّی پشتگیریی دەرەکی بۆ شەڕی یەکتر دەبێتە سروشتی دۆخەکە. ئەمانە بەداخەوە لە واقیعدا دەگوزەرێن. نەبوونی خواست یان توانا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەردەوامییان هەبێت.

ئێمە ئەم دۆخە ناو دەنێین دۆخی دەسەلاّتی کۆنترۆلّی تەنها. بە مانای هەر هێزێك لە هەولّی ئەوەدایە کە سەرتاپا پانتاییەکانی کۆمەلّگا و ئابووری و سیمبولی بۆ خۆی کۆنترۆلّ بکات. ئەمە سەردەمێکی جودا بوو لە مێژووی خەباتی کوردیدا، چونکە کورد لە میانەی دەسەلاّت سەپاندندا لەبری ئەوی تر ڕووبەڕووی خۆی دەبۆوە. سەردەمێکی نوێ یانی چی؟ لە پاش ڕاپەڕینەوە باشووری کوردستان لە قۆناغێکەوە گواستیەوە بۆ قۆناغێکی جودا. قۆناغی پێش ڕاپەڕین قۆناغێك بوو کە کورد تیایدا بە دەست ناوەندی دوژمنەوە لاوازکرابوو. پاش ڕاپەڕین ناوەند وەك دوژمنی کورد لاوازبوو. ئەم گۆڕانکارییە گۆڕانکاری لە

سروشتی سیاسەتکردنیشدا هێنا. لە زانستی سیاسەتدا، وەك لە سەرەوە ئاماژمان پێدا، ئەم سانەوەختانە بە وەرچەرخان یان جەکنچەر دادەنرێن. لە پاش ئەم قۆناغە کورد لە لاوازیی دوژمنی دەرەکیدا دەستیان دایە ڕووبەڕووبوونەوەی یەکتری. لە لایەکەوە لە دەرئەنجامی لاوازیی دوژمنی دەرەکی بوو، لە لایەکی ترەوە خەونی لە مێژووینەی هەر یەك لە هێزە کوردییەکان بوو. من دیدی حیزبی کوردی بۆ سیاسەت بە تۆتالیتاری دادەنێم. مەبەستم لە تۆتالیتاریەت ئەوەیە، کە خەونێك هەیە لە هەناوی دەسەلاتی حیزب کوردیدا کە دەخوازێت سەرتاپا پانتاییەکانی کۆمەلگا و ژیانی مرۆڤی کورد بۆ خۆی کۆنترۆل بکات. دیارە ڕەنگە کەسێك ڕەخنە بگرێت لەم دیدە بەوەی تۆتالیتاریەت پێویستیی بە ئایدیۆلۆژیایە، بەلام کرداری حیزبی کوردی بۆ خۆی ئایدیۆلۆژیایە. بەوەی ئەم خەونە نەگوازراوەتەوە بۆ وشە ئەوە مانای ئەوە نییە کە بوونی نییە، بەلکو وەك کردارێکی بێ وشە ئەنجام دەدرێت. کرداری بێ وشە یان لال بێ وشەیە، چونکە ئەنجامدەرەکەی بێتوانایە لە ڕووی عەقلییەوە بۆئەوەی دیدی خۆی بگوێزێتەوە بۆ وشە. بەلام لە ڕووی خواست و ئارەزوو و دەروونییەوە ئامادەیە بۆی. نەبوونی ئایدیۆلۆژیا لەبەر نزمی ئاستی تێڕوانینە لە سیاسەت و کۆمەلگا و داهاتوو و چۆنێتیی کارکردن و بەڕێوەبردن. ئەوە ئاستێکی بالایە لە دەربڕین، کاتێك بتوانیت دونیابینیی خۆت لەنێو دەقێکی نووسراودا دەربڕیت، بەلام کاتێك بێ توانایی لەمە مانای ئەوەیە کە هێشتا لە ئاستە سەرەتاییەکانی مرۆڤبوون دای بە هەبوونی خەونێکی گەورە. لێرەدا ئارەزوویەکی ئاونەدراو بە عەقل لە ئارادایە. لە کاتێکدا گواستنەوەی ئارەزوو بۆ عەقل مانای ئەوە نییە گواستنەوە بۆ دۆخێکی مرۆڤانە ڕووی داوە. تۆتالیتاریەتی ئەلمانی لە هەموو بوارێکدا گوازراوەتەوە بۆ عەقل، بەلام وەحشیگەریترین شێوازی تۆتالیتارییە.[1]

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی تۆتالیتاریزم بڕوانە:

لە هەمان کاتدا کردار وەك باوەڕ دەکرێت ببێتە سەرچاوەی سیاسەت. دیارە کۆنترۆڵ لە ڕێگای ئایدیۆلۆژیاوە زۆر وەحشیگەرانەترە لە کۆنترۆڵی بێ ئایدیۆلۆژیا، بۆیە کۆنترۆڵی مۆدێرنە زۆر دڕندانەترە لە کۆنترۆڵی پێش مۆدێرنە، چونکە ئایدیۆلۆژیا تەکنەلۆژیای ئەنجامدانە کە دەچێتە پاڵ تەکنەلۆژیاکانی تری وەك ئامێر و سیستەم. کۆنترۆڵی بێ ئایدیۆلۆژیا لە ڕێگای هەڵسوکەتەوە دەبێت. کەسی کۆنترۆڵکراو لە ژێر سیستەمی تۆتالیتاریی بێ ئایدیۆلۆژیادا دەبێت بەردەوام بە کرداری پیشانی بدات کە خزمەتکاری حیزبە، سەر بە حیزبە، بێدەنگە لە بەرامبەر هەموو کارێکی حیزبدا، وەك حیزب بیر دەکاتەوە، هەمیشە پاساو بۆ کارەکانی حیزب دەهێنێتەوە.

دیارە حیزب لێرەدا پێکهاتەیەکی تایبەتە، جودایە لە حیزب لەنێو پرۆسەی سیستەمی دیموکراسیدا. حیزب بریتییە لە دەزگایەك بۆ فەراهەمبوونی خواستەکانی کەسی یەکەمی حیزب. کاتێك دوو هێز لە کۆمەڵگادا لە خەونی ئەوەدان کە سەرتاپا کۆمەڵگا بۆ خۆیان کۆنترۆڵ بکەن، ئەوا بە سروشت لە ئەنجامی هەوڵدان بۆ فەراهەمبوونی ئەم خەونە ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. کاتێك ڕووبەڕووبوونەوە ڕووی دا، چارەسەر ئەوە بوو کە لە مێژووی نوێی کوردیدا بە فیفتی فیفتی ناسراوە، کە خۆی لە نەبوونی تواناندا دەبینیەوە بۆ دانپیانان بەوەی کە کەسێك براوەیە و کەسێکی تر دۆڕاو. چارەسەر ئەوە بوو کە هەموو براوەبن. دیارە فرە براوەیی یانی فرە خاوەنی، فرە خاوەنی لە سیستەمی سیاسیدا یانی نەبوونی بەرپرسیاری؛ نەبوونی ئەجێندای گشتی، نەبوونی بەرپرسیارێتی، کە ئەمانە لە ئەنجامدا بوونە خەسڵەتی سەرەکیی حوکم لە کوردستاندا، بۆیە هەر دوو براوەیی نەبووە هۆی کۆتاییی ململانێ بەڵکو

---

Hans Maier 2004(Ed) Totalitarianism and Political Religions Volume I: concepts for the comparison of dictatorships, Tran Jodi Bruhn, Routledge, London .

ململانێکانی ناوەکی کرد. ئەم ڕووبەڕووبوونەوە بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای کوردی شاقۆڵی و ئاسۆیی دابەش ببێت. کە جەنگی ناوخۆ هات وەك دەرئەنجامێکی چاوەڕوانکراوی ئەم سیاسەتە، ئیتر هەموو شتێك بۆ یەکجاری کۆتایی هات، چیدی قسەکردن لە سەر یەك کوردستان، یەك کۆمەڵگا، یەك سیستەم، یەك حکومەت بوو بە ئەفسانەیەك تەنها میدیای حیزبییەکان لە ساتەوەختی پێویستدا بە گوێی خۆیاندا دەدا، ئەمە ڕێگربوو لە هەموو شتێك.

ئەم دەرفەتە لە دەستدراوە، ناو دەنێین دەرفەت، چونکە حکومەتی ناوەندی لاوازبوو، دەرفەت خوڵقا بۆ ئەوەی کورد ببێتە نەتەوە. مەحاڵە خەڵکێك بەڕاستی ببنە نەتەوە بە بێ دەزگا، بەڵام هەموو شتێك بە پێچەوانەوە ڕووی دا، لەبری نەتەوە دۆخێکی نانەتەوەیی، پەرتەوازەیی، ناسیاسی هاتە ئاراوە. ئەوەی وەهای کرد دۆخەکە هێندە مەترسیدار نەبێت ئەوە بوو کە بەغدا هێشتا لاوازبوو و نیاز و توانای نەبوو دەسەڵاتی خۆی بە سەر کوردستاندا بسەپێنێ. بەم جۆرە دۆخێکی نە تەقلیدی نە سەردەمییانە هاتە ئاراوە. دۆخێك کە پڕە لە شتی سەردەمییانە بە عەقڵ و ئارەزووی تەقلیدییەوە.

**٨: هاتنی ئەمریکا:**

عێراقی بەرهەمهاتوو لە سەرەتاوە بە هۆی هاوسەنگیی هێز و شارەزابوونی سوننە لە بیرۆکراتیەت لە سەردەمی عوسمانی و بوونیان لە ناوەند لە ڕووی جوگرافییەوە و هێنانی کەسێکی دەرەکیی سوننە، وەهای کرد کە لە ئەنجامدا سوننی تیایدا ببێت بە حاکم. حوکمی سوننی لە هەموو شێوازەکانیدا دڕندە و وەحشیگەری و نامرۆڤانە بوو. بە هەموو پێوەرێك عەرەبانە بوو. عەرەب وەك خەڵکێك لە پێنج سەد ساڵی ڕابردوودا دوور بوون لە هەموو شارستانیەتێکی مرۆڤانە. بە هیچ شێوەیەك ئامادەییان نەبووە لە ئاستی مرۆڤایەتدا. کەلتووریان، دیدیان، شێوازی پەیوەندییان، بیرکردنەوەیان، بە هیچ شێوەیەك

نەکێڵراوە. مەبەستمان لە کێڵان پرۆسەی بە کەلتووریکردنە. دیارە وشەی کەلتوور خۆی لە زمانە ئەوروپییەکاندا لە فەرهەنگی جووتیارییەوە هاتووە. مەبەست لە کێڵان هەڵدانەوە، ئەمدیودیو، کەوتنە بەر ئاوهەوا، تۆوکردن، گەشەکردنە. ئەمانە هەموو لە ڕووی مەجاز (میتافۆر) ەوە،کاتێك مرۆڤ لە خودی خۆیدا ئەنجامی دەدات ئەوا لە ڕووی ئاگاییەوە گەشە دەکات. من ئەم پرۆسەیە ناودەنێم خودجووتیاری. پێویستە مرۆڤ بۆ ئەوەی بوونی مرۆڤانەی خۆی بهێنێتە دی، دەبێت بەردەوام لە پرۆسەی خود جووتیاریدا بێت. خود جووتیاری تەنها لە ڕێگای خوێندنەوەوە دەبێت. خوێندنەوە مرۆڤ فێر دەکات چۆن ببینێت، بیر بکاتەوە، بیری فراوانبێت، ببێتە خاوەن داتا و زانیاری، کە پێویستە بۆ بونیادنانی دیدێکی زانستی. گەلی عەرەب گەلێکی نەخوێنەرن، لە هەمان کاتدا نەخوێنەوارن. دیارە ئەفسوس بڕێکی زۆری ئەمەیش بۆ کورد ڕاستە. کاتێك دەسەڵاتێك زادەی دیدێکی هێندە دابڕاوە لە مرۆڤبوون ئەوا بە دڵنیاییەوە دەسەڵاتێکی مرۆڤانە نابێت.

عێراق دیکتاتۆری بوو هەتا هاتنی ئەمریکا، کە دەڵێین دیکتاتۆری مەبەستمان لەوەیە کە کەسێك تیایدا حاکم بوو، ئەو کەسە چەند بازنەیەکی بەدەوردا بوو، بازنەی خێزان، عەشیرەت، ئینجا چینی ڕاگر.[1]

چینی ڕاگر چینێك لە خەڵکن کە دەسەڵات لە پاشخانی ئابووری و کۆمەڵایەتیی جیاواز، بەڵام هاوبەش لە مانەوەی دەسەڵاتدا بەرهەمیان دەهێنێت. دەکرێت بوترێت چینی ڕاگر لە عێراقدا سوننە بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا

---

[1]. مەبەستمان لە چینی ڕاگر، ئەو دەستەواژەیە کە فەیلەسوفی فەرەنسی (جان کلۆد ملینێر) بەکاری دەبات. ئەم چەمکە لە سلاڤیو ژیژاکەوە وەرگیراوە، (سەرچاوە ڕۆژنامەی گاردیانی بەریتانی.)
http://www.guardian.co.uk/commentisfree/2012/nov/13/obama-ground-floor-thinking

خەڵكانێكی تری زۆر لە پێكهاتەكانی تر لە مانەوە و درێژەپێدانی ئەم سیستەمەدا بەشداربوون.

بە هاتنی ئەمریكا ئەم پێكهاتەیە كۆتایی هات. تێكچوونی ئەم سیستەمە، مانای تێكچوونی ئەم عەقڵیەتە نییە، بەڵام با سەرەتا ساتێك قسە لە سەر هاتنی ئەمریكا بكەین چونكە ڕووداوی هاتنی ئەمریكا بەشێكی سەرەكییە لەو دۆخەی كە ئێستا لە ئارادایە. ئەمریكا وەها هات بۆ عێراق كە بیكاتە خاڵی دەستپێكردنی بۆ گۆڕینی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو ڕۆژهەڵاتێكی ناوەڕاستی نوێ، وەك كۆندەلیزە ڕایس ئاماژەی پێدا. ئەم گۆڕانكارییە بەشێك بوو لە پرۆسەی پارێزەرە نوێكان بۆ سەپاندنی هێژەمۆنیەتی ئەمریكا بە سەر جیهاندا. بۆچی دەستپێكردن لە عێراقەوە؟ عێراق وەك سیستەمی سیاسی و جیوپۆلەتێك گرینگییەكی زۆری هەبوو بۆ فەراهەمبوونی ئەم پرۆژەیە، چونكە عێراق لاوازبوو هەروەها لە ڕووی جیوپۆلەتیكەوە لە جێگایەكی دەگمەندایە. تێگەیشتنی پارێزەرە نوێكان بۆ پرۆسەكە لە زانستی سیاسیدا پێی دەڵێن باندواگن، كە پێچەوانەی باڵانس ئۆف پاوەرە. باندواگن یانی ناچاربوون بە دواكەوتن، بەڵام باڵانس ئۆف پاوەر یانی هاوسەنگیی هێز. بەو مانایە، كاتێك ئەمریكا فشار دەخاتە سەر هەر هێزێك یان وڵاتێك لە ناوچەكەدا، بە هۆی كۆتاییهاتنی جەنگی سارد و باڵادەستی ئەمریكاو نەبوونی هێزی بەرامبەر ئەوا هەر هێزێك ئەمریكا فشار بخاتە سەری ناچارە دوای ئەمریكا بكەوێت، یان ناتوانێت بكەوێتە ململانێی هاوسەنگیی هێزەوە لەگەڵیدا. بەم پێیە هاتن بۆ عێراق و گرتنی بە ئاسانی لەبەر لاوازی لە ئەنجامدا وڵاتانی ناوچەكە ناچار دەكات، بە تایبەت ئێران كە بێتە ژێر باڵی ئەمریكاوە، بەڵام ڕووداوەكان پاشان سەلماندیان كە ئەم دیدە هەڵە بوو.[1]

كاتێك ئەمریكا بۆی دەركەوت ڕووداوەكان بەو ئاڕاستەیەدا ناڕۆن، ئەوا هەر زوو پلانی گۆڕی، گۆڕینی پلانەكە بریتی بوو لە دابینكردنی جۆرێك لە سەقامگیری

---

[1]. THE AMERICAN INVASION OF IRAQ: ،Hinnebusch Raymond 2007 CAUSES AND CONSEQUENCES PERCEPTIONS ،Spring

له عێراقدا و جێهێشتنی. دەتوانین بڵێین کە عێراق تاقیکرایەوە وەك سەرەتای ئەنجامدانی پرۆسەیەکی فراوان کاتێك سەرکەوتوونەبوو ئەوا زوو لێی کشانەوە.
ئەمە لە ئەنجامدا بووە هۆی ئەوە ئەمریکا نیوەناچڵی عێراق بەجێ بهێڵێت.

### ٩: عێراقی نیوەناچل:

عێراق کە لە لایەن ئەمریکاوە بەجێهێڵرا عێراقێك نەبوو کە خاوەن سیستەم و بونیاد و ئاگاییی دیموکراسی بێت. ئەم لاوازییانە وەهای کرد ئەو پێکهاتە دیموکراسییانەی کە عێراق بە دەستی هێنا لە میانەی ساڵانی بوونی ئەمریکا لە وڵاتەکەدا وەك دەستوور و پەرلەمان هێندە کاریگەر نەبن. لە هەمان کاتدا ئەمریکا خۆی پرۆسەی بە دیموکراتیزەکردنی فەرامۆشکرد، یان هێندەی لێ بە پێویست زانی کە زەمینەی کشانەوە برەخسێنێت. بەم پێیە هەموو شتێك لە عێراقدا بە پەلەو خێرایی هێنرایە ئاراوە بۆئەوەی واقیعێك بخوڵقێنی کە ئەمریکا بکشێتەوە.

ئەم واقیعە پێمان دەڵێت کە سیستەم لە عێراقدا لاوازبوو، بۆشاییی گەورە هەبوو لە بونیادی نوێی دەوڵەتی عێراقدا، ئەولەویەت درابووە سەقامگیرو، هێزەکانی دەرەوە ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە. مەحمود ئەحمەدی نەژاد بە سەرسوورمانەوە دەپرسێت: ئەمریکا لە عێراق دارێکی ناشت. ئەو دارەیان ئاودا، خزمەتیان کرد، بایەخیان پێدا. لە هاوەڵە ئەمریکاییەکانتان بپرسن بۆچی ئەو دارە بەجێ دەهێڵن ئێستا، پێش ئەوەی بەربدات. پرسیارێکی وەها بەڕوونی پێمان دەڵێت کە ئێران چۆن لە عێراق دەڕوانێت. لە هەمان کاتدا دیدی دیپلۆماسی ئێرانیشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. سەرباری ئەمە ئەوەیش ڕووناك دەکاتەوە کە ئەمریکا بە ئامانجیان نەگەیشتن. ئەم دۆخە نیوەناچڵە هێندە بەهێز نەبوو هەتا بتوانێت گۆڕانکاری لە پارادیمی شێوازی پەیوەندیی دەسەلات بهێنێتە ئاراوە، بۆیە ئاسان بوو جارێکی تر بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخە ڕۆژهەڵاتییەکەی یان دۆخە دیکتاتۆرییەکەی.

## ڕەگی دێرینی ستەمکاریی ڕۆژهەڵاتی

کە هێزەکانی ئەمریکا هات هیوایەك هاتە ئاراوە، بە تایبەت لای کەسانێك کە دیکتاتۆر لە عێراق بۆ یەکجاری دەڕوات، بەڵام ئەمڕۆ عێراق لە ساتەوەختی خۆ ئامادەکردندایە بۆ هاتنەوەی دیکتاتۆر. ڕەنگە ئێستا گومانێك لای هەمووومان سەوزبووبێت کە ڕاپەڕین و شۆڕش و تەنانەت هێرشی سەربازیش ناتوانن دیکتاتۆرەکان لابەرن. لە چ جێگایەکی سەختدان دیکتاتۆرەکان؟ ئەم ڕاستییە مێژووییانە پێمان دەڵێت کە دیکتاتۆرەکان تەنها بریتی نین لە کەسەکان، بەڵکو تەنها لە کەسەکاندا بەرجەستە دەبن. دیکتاتۆرەکان بەرهەمی شێوازێکی تایبەت لە ژیارن، لە گووزەرانی ئابووری، لە جوگرافیا نیشتەجێبوون، بەڵام لە سەرووی هەموویەوە لە جۆری ئاگایی. دیارە دەبێت ئەوە بوترێت کە هەر جوگرافیایەك، هەر پانتاییەکی جیوپۆلەتیك، هەر مێژوویەك لە دەسەڵاتی سیاسی، شێوازی تایبەت بۆ خۆیان لە سەرکردەی سیاسی دەهێننە ئاراوە. گەر جوگرافیا و کەلتوور و ژیار بۆ عێراق گرینگ بێت ئەوا ئەگەر لەگەڵ مارکسدا تۆزێك دەمەتەقێ بکەین، ڕەنگە بگەینە جۆرێك لە تێگەیشتن. مارکس بڕوای وایە ڕەگی ستەمی ڕۆژهەڵات لە جۆری ژیاری گونددایە. گوند لای ئەو، پانتاییەکە دوور لە جێگاکانی تر، مرۆڤەکانی تێیدا ژیانێکی خودگوزرانی بەڕێوە دەبەن، بەدەگمەن نەبێت هیچی نوێ تیایدا ناگوزەرێت. بۆیە مرۆڤەکان سروشت و جۆری ژیان دەبنە جۆرێك لە خۆ دووبارەکردنەوە. مارکس کاتێك بیری لەم پانتاییە دەکردەوە لە ئاگاییدا سەرقاڵی بیری گەشەی سەرمایەداری بوو.(١)

گەر بمانەوێت ئەمڕۆ لەم دیدەی مارکس تێ بگەین، ئەوا پێویستمانە جۆرێك لە توێژەنکردنی تیادا ئەنجام بدەین. کرۆکی بیرەکەی مارکس بریتییە لە دابڕان،

---

[1]. بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ:

Gaurang R. Sahay 2007Marxism and the Orient: A Reading of Marx, borderlands, VOLUME 6 NUMBER1

بەوەی مرۆڤەکان، لە ڕۆژهەڵات بە هۆی جوگرافیای نیشەجێبوون و شێوازی ژیار و باری ئابوورییانەوە گۆڕانکاری لە ژیانیاندا ڕوو نادات، لەگەڵ ئەوانی تردا بەریەکناکەون، گۆڕانکاری نییە، خەمی نوێ، گەشە و ململانێ نییە، لە ئەنجامدا هەموو شتێك وەك خۆی دەمێنێتەوە. کە مرۆڤەکان لە یەکتر دابڕابوون کە شێوازی ژیانیان پاڵنەر نەبوو بۆنەوەی خواستی گۆڕانکارییان هەبێت، ئەوا سیستەمی سیاسی سیستەمێکی چەسپیوی، نەگۆڕی ستەمکار دەبێت. ئەم دۆخە هێشتا لە ئاگاییدا ماوە لە ڕۆژهەڵات بە تایبەتی لە کوردستان. ئابووریی کوردستان بریتی نییە لە ئابووریی سەرمایەداری کە خەمی پێشکەوتن و نوێ و داهێنان و باشتر و گەشتنە بازاڕ و ساخکردنەوە و خۆ دەوڵەمەندبوون بخوا لە سەر بنەمای کاڵا و خزمەت و داهێنان، بەڵکو ئابوورییەکە لە سروشتەوە دێت، لە دەرەوەی توانای مرۆڤەکان، لە ڕێگای دەزگای باڵاوە، هەندێکی لێ دەبەخشرێتەوە، لەپێناو مانەوەی دۆخەکەدا وەك خۆی. کاتێك ئاگایی، کە بە گشتی ئاگاییەکی ئایینییە دژ بە گۆڕان، پشت بەم جۆرە سەرچاوەی داهاتە دەبەستێت ئەوا ڕۆحی فاوستییانەی تینو بە مەعریفە تیایدا چرۆ ناکات. ئەوەیشی ببێتە خاوەن ڕۆحێکی وەها هەر زوو پەراوێز و تەریك دەکرێت. سیستەمی ستەمکاری هەمیشە یەك پەیامی هەیە، ئەی ڕەعیەت ژیانێکی سادە و ساکار و دوور لە بەڵا بژین، زمانتان بگرن با سەرتان سەلامەت بێت. لە کوردستان مامۆستایەکی بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی سلێمانی پێی وتم چیت داوە لە کۆرگێڕان. ئەم ڕۆحە سستگەراییە، بەرهەمهێنی ستەمکارییە. گەر مارکس جەخت لە سەر گوندبوون وەك دۆخێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و عەقڵی و پاشان سیاسی دەکاتەوە ئەوا ماکس ڤیبەر جەخت لە سەر نەبوونی شار دەکات. شار لای ڤیبەر پانتاییەکە جودایە لە گوند و هەروەها جودایە لە میترۆپۆل (شاری گەورە). دیدی ڤیبەر گەشەپێدانی بیری تونایس و زمیل و مارکسە. لای ڤیبەر

جۆری سیاسەت خەسڵەتی سەرەکیی شارە، بۆیە شار جێگایەکە کە دەسەڵات لە سەر بنەمای عەقڵانی بەڕێوە دەبرێت نەک کاریزمی و ترادیسیۆن، یاسا بە سەر هەمووان دەسەپێنرێت نەک تاکەکەسی، بە مانایەکی تر کەس لە دەرەوەی یاسا نییە، پێکەوەبوون لە سەر بنەمای چینە نەک خێزان و خزم، هێزی شار لە ئابوورییەوەیە نەک لە سەربازییەوە: (١)

وەک دەبینین بنەمای شار لای ڤیبەر دۆخی سیاسییە کە بەرهەمی سەرمایەدایە. لێرەدا مارکس و ڤیبەر لەوەدا هاوڕان کە شار بەو شێوەی کە هەیە بەرهەمی سیستەمی سەرمایەدارییەو، ئەگەر شارێك هەبوو دۆخی کۆمەڵایەتی سیاسی و سەرمایەداری تیایدا نەگوونجەرا ئەوا شار نییە بە مانا ڕۆژئاواییەکەی، بەو مانایە ئازادی و ئابووری و عەقڵانیەت و یاسا و پانتایی گشتی و پانتایی تایبەت و زۆری تر لە خەسڵەتەکانی مۆدێرنەی تیادا نییە. لە هەر دوو دیدەکەدا دەبینین کە ژیاری ڕۆژهەڵاتی ژیارێك نییە کە دژ بە دیکتاتۆریەت بێت، بەڵکو لەڕاستیدا بەرهەمهێنیەتی، کەواتە لە دۆخێکی وەهادا دیکتاتۆریەت ئاساییەو، نەبوونی نائاساییە.

لێرەدا مەبەستمان لە دۆخی ڕۆژهەڵاتی ئەو چەمکەیە کە پێی دەڵێن ئۆریەنتاڵ دیسپۆتیزم یان ستەمکاریی ڕۆژهەڵاتی. لێرەدا ڕەنگە بواری ئەوە نەبێت کە بە دوای ڕەگ و ڕیشەی چەمکێکی وەها ئاڵۆزدا بڕۆین. بە گشتی ئەگەر مارکس و ڤیبەر و زۆرێك لە ئەوانی تر پێکەوە گرێ بدەین ئەوا دەڵێین کە شار وەك ئەوەی لە کەلتووری ڕۆژئاوادا هەیە لە ڕۆژهەڵات بوونی نییە. مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی مرۆڤێکی لادێییە، کاتێك کە لە شاری ڕۆژهەڵاتیشدا جێگر دەبێت. لای مارکس ئەم دۆخە بریتییە لەوەی کە دابڕانێك هەیە لە نێوان کەسەکان و بیرەکاندا، بە تایبەت لە دۆخی کۆمەڵایەتی گونددا، کاتێك دابرانێك هەیە لە گەڵ

[1]. Weber, Max 1978 "The city (non-legitimate domination)." In his Economy and Society: An Outline of Interpretive Sociology. (Berkeley: University of California Press) 2 vols. Vol.2, ch. XVI: 1212-372.

دونیـای دەرەوە و بـیری تـردا. بیرەکـان و شـتەکان بـەردەوام وەک خۆیـان دەمێننەوە، بە هیچ شێوەیەک نوێیان تیادا نایەتە ئاراوە، چونکە کرۆکی نوێگەری بەریەککەوتنی جیاوەزەکانە. ئێمە بە بەکاربردنی دەڵێین ئەم دۆخـە ئاگاییـە لـە شاری رۆژهەڵاتیـشدا ئامادەیـە، بـەو مانایـە کـە مرۆڤـەکان بـیر و ئاگاییـەکانیان ناخەنە ململانێوە و بەریەککەوتنی ئاگایی و بیر ڕوو نادات، چـونکە یـان یـەک بـیر هەیـە، یـان ئەگـەر بـیری جـوودا هـەبوو ئـەوا نابێتـە هـۆی دایـەلۆگ و گەشـە و گۆڕینەوە. مارکس هۆکاری ئەمە بۆ دۆخی ژیـاری و ئـابووری دەگەڕێنێتـەوە، لـە بەراورد بەمەدا سەرمایەداری مرۆڤەکان ناچار دەکات کە بەریـەک بکـەون، بیریـان بگۆڕنەوە، لە ئەنجامدا ئەوە بێتە دی کە پێی دەڵێن جەدەلیەت، بەڵام ڤیبەر ئەم دۆخە لە شاردا دەبینێتەوە. ڤێبەر بڕوای وایە کە شار بە مانا رۆژئاواییەکـەی لـە رۆژهـەڵات نییـە، کـە شـار نـەبوو ئـەوا هاوڵـاتی و پانتـایی گشتی و سیاسـەت و رێکخستن و مۆدێرنە بە مانا گشتییەکەی نابێت.

هـەردوو دیدەکـە تەواوکـەری یـەکترن. ئەمـەی سـەرەوە بـەخێرایی وەک پاشخانێك خستە ڕوو. کاتێك کە ئەمریکییـەکان نـەیانتوانی گۆڕانکـاریی ڕیـشەیی بهێننە ئاراوە، ئەوا هەر زوو سیاسەتکردن لە عێراقدا خلیسکایەوە بـۆ دۆخەکـەی جاران. ئەمە بە گشتی لـە هـاتنی مالیکیـدا ڕوون و زەق دەبێتـەوە، نـەک تـەنها و تایبەت لە بەر کەسایەتیی مالیکی، بەڵکو لەبەر هۆکاری تری تایبەتمەند بە دۆخی عێراقەوە.

### ١٠: مالیکی بەرەو دیکتاتۆریەت:

با ئێستا قسە لە سەر مناڵەکەی گوریج بکەین. کە لە دایك بوو هێشتا عێـراق مەلـەکی بـوو، یـەکێك لـە باوانـە گـەورەی وەزیـر بـووە. نـووری کامیـل هـیچ تایبەتمەندییەکی نییە بۆئەوەی ببێتە کەسێکی باڵا. گەرچی دەرچووی عەرەبییە بەڵام قسەکەرێ باش نییە و ڕواڵـەت و ڕۆشـنبیری لـە ئاسـتی کەسـێکی باڵادایـە. لەڕاستیدا ڕەنگە ئەمە تەنها هۆکاربێت کە ئەو لەم پێگەدایە. یـەکێك لـە هۆکـارە

سەرەکییەکانی بوونی مالیکی بە سەرۆک وەزیران، ئەو دیدە بوو کە بەرپرسە حیزبییەکانی تری عێراق هەیان بوو بۆ ئەو کە گوایە کەسێکی لاوازە. هەمووان هاوڕابوون لە سەر دانانای کەسێکی لاواز بۆ ئەوەی نەبێتە مەترسی بە سەر پێگەکەیانەوە. لە هەمان کاتدا حیزب بە باڵادەستی بمێنێتەوە و حکومەت لاوازبێت. مالیکی گەرچی لە سەرەتاوە وەها خۆی نواند کە وایە بەڵام هەر زوو دەستی کرد بە پلانەکانی. سەرەتا لە سەرکردایەتیی حیزبەکەیەوە دەستی پێ کرد، پاشان بە هێنانی کوڕ و خزم و خوێشی. پلانە کۆنەکەی دیکتاتۆربوون: خەڵکانی جێی باوەڕی نزیك بە خۆت، خەڵکانی خاوەن شارەزایی دوورتر بەڵام سەر–بەخۆت. پلانی مالیکی وەهابوو، کە لە میانەی بونیادنانی دەزگاکاندا و کشانەوەی ئەمریکا ئەو کەسانە دابنێت کە سەربە ئەون. لەم ڕێگایەوە توانی لە دەوری خۆی بازنەیەك پێك بهێنێت و لە ڕێگای ئەم بازنەیەوە چەند کەناڵێ دروست بکات بۆ پەیوەندکردن بە کەسانی خوار پلەی وەزیر هەتا بتوانێت حکومەت و وەزیرەکان لە دەسەلات دابڕێت بە بێ ئەوەی ڕووبەڕوویان بێتەوە. کە ئەم پلانانە جێبەجێبوون هەنگاوی داهاتوو تێکشکانی نەیاران بوو. هاوتەریب بەم هەنگاوانە مالیکی بۆ سەقامگیریی بنەمای حیزبی تایبەت بەخۆی لە لایەك و لە لایەکی تر دروستکردنی وێنای خۆی وەك ناسیونالیزمێکی عێراقی، هێرشکردنە سەر سەدر، پاشان سوننە، ئینجا کورد، هەموو هەنگاون لەم پێناوەدا. مالیکی دەخوازێت سەرۆکی تاقانەی عێراقێکی بەهێزبێت، لەم پێناوەدا دەیەوێت هەموو هێزەکانی تری ناو عێراق لاواز بکات. ئەم دیدە وەهای لێ دەکات دژ بە فیدراڵی بێت، دژ بە ماف و جیاوازیی بێت. دوو ڕۆژ پاش دەربڕینی پشتگیری بۆ فیدراڵی ناوچە سوننییەکان، هاشمی لە لایەن کوڕەکەی مالیکییەوە لە ماڵ دەرپەڕێنرا.

هێز و لایەنە سیاسییەکانی عێراق کاتێك لە سەرەتادا مالیکیان هەڵبژارد وەك سەرۆك وەزیرانی عێراق، لە سەر یەك بنەما هەڵیان بژارد ئەویش لاوازی بوو.

کەسایەتییە سیاسییەکان، سەرۆک حیزبەکان بۆئەوەی خۆیان هەمیشە خاوەنی دوا وتـە بـن و، بۆئـەوەی ئـەم پێگەیـە لـە دەسـت نـەدەن ئـەوا هەڵبـژاردنی کەسایەتییەکی لاواز بەلایەنەوە گرینگ وەك ڕێگرێك لەو ترسەی کـە کەسێك، بـە هۆی بوونی لە پۆستی سەرۆك وەزیراندا هێندە دەسەڵات لای خۆی کۆکاتەوە کـە سەرۆك حیزبەکان پەراوێز بخات. دیارە سەرۆك حیزب لە دیدێکەوە دەیبـینی کـە تـەنها حیـزب دەتوانێـت کەسـێك بـەهێز بکـات لـە عێراقـدا. ئەمـە نیشانەی ئـەو ئاگاییە لاوازەیە کە بێئاگایە لە توانای ڕێکخستن، دەزگا، هێزی سەربازی.

مالیکی لەسەرەتادا ئەو کەسایەتییە بوو کە هەمووان بە دڵیان بـوو، خۆشـی ئاگاداربوو کە چۆن کارەکانی ئەنجام دەدا. یەکێك لە نموونـە سەرنجڕاکێشەکانی دوای ڕووخـانی سـەدام هەڵکـشانی ئـەم پیـاوە بـوو. مـالیکی لەسـەرەتادا لـە حیزبەکەیەوە دەستی پێ کرد، لەوێدا پێگەی خۆی قایم کرد. لە نیسانی (٢٠٠٧) مالیکی توانی جەعفـەری لـە پۆسـتی سـەرۆکی حیزبـی دەعـوە لابـەرێت. پاشـان دەستی کرد بە دروستکردنی گروپی بچکۆلەی تایبەت بـە خـۆی کـە ناسـراون بـە مالیکییەکان. لە ڕێگای ئەمانەوە مالیکی هەوڵیدا پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ ئەو بەڕێوەبەرانەی کاروباری حکومەتیان بەڕێوە دەبرد لە خوار پلەی وەزیرەوە. پاشان خزم و ئەندامانی حیزبی دەعوەی هێنایە ناوەوە. ئەحمەدی کـوڕی کـردە بەرپرسی پاراستنی خۆی (مـالیکی). لـە پـاش (٢٠٠٧)ەوە تـەرکیزی کـردە سـەر هێزی ئاسایش بە مانا کوردییەکەی نا، بە مانای هەموو ئەو هێزانـەی کـە کـاری پاراستن و دابینکردنـی ئاسـاییش بـەڕێوە دەبـەن. لـە ڕێگـای ئەمـەوە ئەفـسەرە باڵاکـان و سـەرکردەی میلیـشیاکان و بەرپرسـانی ئیـستخباراتی ڕاسـتەوخۆ بەخۆیـەوە گـرێ دەدا. پاشـان ئۆفیـسی سـەرۆك وەزیرانـی پێکهێنـا کـە (فـاروق الاعرجي) کردە بەرپرسی وەك کەسێکی نزیك لە خۆیەوە.

هەنگاوێکی تر بۆ کۆنترۆڵکردنی هێزی چەکدار و سەرباز و پێکهاتەکانی تر بریتی بوو لە دروستکردنی سەنتەری ئۆپەراسیۆن کە لە ڕێگایەوە مالیکی دەستی نەك هەر بە سەر سەربازدا بەڵکو پۆلیسیشدا گرت. هەبوونی بەرپرسە ناوچەییەکان وەزارەتی بەرگری لە کەڵك خست. هەموو ئەفسەرەکانی ئەم ناوەندانە سەر بە مالیکین. کە ئەمریکییەکان هێزی تایبەتیان دروستکرد، مالیکی بیرۆی دژە تیرۆری دروستکرد بۆ ئەوەی سەرپەرشتییان بکات، دیسانەوە لە ڕێگای ئەم دەزگایەوە ئەم هێزەی کردە سەر بەخۆی.

هەر لەم ڕووەوە (محمود عبدالله الشواني) کە بەرپرسی دەزگای سیخوڕی عێراق بوو، هەروەها کەسێکی باوەڕپێکراوی ئەمریکییەکان بوو لابرد و (شیروان وائلي) خستە جێگای کە کەسێکی نزیکە لە ئێرانەوە.

دەسەلاتی مالیکی هێندە بنەمای فراوانبوو و بڕوای بە خۆی پەیداکرد، لە ساڵی (٢٠٠٩) حیزبێکی تایبەتی بۆ خۆی دروستکرد کە ناوی دەوڵەتی قانونە. کاتێك هەڵبژاردن کرا مالیکی پێش هەڵبژاردن بڕیاری دابوو کە لە سەر کورسی بمێنێتەوە. پاش هەڵبژاردنەکانی(٢٠١٠) بە شەش مانگ نەتوانرا حکومەت پێك بهێنرێ و پێکهێنانیحکومەتیعێراق بووە کاریئەکردە و کەوتە گێژاو. هەتا پەیماننامەی هەولێر ڕێکخرا. پەیماننامەیەك کە مالیکی هێندە بڕوای پێ بوو هەتا دۆخەکەی پێ هێمن بکاتەوە. مالیکی وەك لێکۆڵەرەوەی ناسراوی عێراقناس (جودیث یاف) باسی دەکات توانیویەتی زۆربەی زۆری دەزگاکانی حکومەت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، لە لایەك بە دروستکردنی وێنایەك کە کەسێکی ناسیونالیستی عێراقییە، ئامادەیە شەڕ لەگەڵ میلیشیا شیعە و سوننەیش بکات، وەك شەڕی لەگەڵ سەدر و مەجلیسی ئەعلا لە بەسرا و بەغداد، بەڵام هەتا بێت زیاتر وەك سەددامێکی تر دەناسرێت.

کاتێك ئەمریکا وڵاتی بەو پەلەپڕوزێیە جێهێشت و ئامانجی لە دیموکراسییە و گۆڕا بۆ سەقامگیری و پاشەکشە، ئامادەبوو سازش بکات بۆ مالیکی لە سەر

داواکانی. وەك ڕۆژنامەی گاردیان باسی دەکات، ئەمریکا خواستی وەها بوو کە هەشت هەزار سەرباز بەجێ بهێڵێت، بەڵام مالیکی ڕێگەی نەدا. لە هەمان کاتدا ئەمریکا خواستی وەها بوو کە نزیکەی هەزار و شەش سەد کەس لە باڵوێزخانەکەی دانێت و بیکاتە یەکێك لە گەورەترین باڵوێزخانەکانی ئەمریکا لەجیهاندا بەڵام مالیکی ڕێگای بەوەیش نەدا، هەروەها پلان وەها بوو کە حەوت سەد سیخوڕی سی ئای ئەی لە عێراق بمێننەوە ڕێگا بەوەیش نەدرا.

لەم پرۆسەی مانۆڕکردنی مالیکییەوە چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێت. یەکەم: مالیکی زۆر فێڵزانانە توانی بە بێ ئەوەی ڕووبەڕووی حکومەت ببێتەوە، یان هەوڵ بدا حکومەت بوروژێنێت، بە دروستکردنی کەناڵی تر، حکومەتی کورتکردەوە بۆ دەزگایەکی بێ دەسەلات. لێرەوە مالیکی توانی لە پشت حکومەتەوە حکومەت دابڕێت و بێ دەسەلاتی بکات و حکومەتی تایبەت بە خۆی هاوتەریب بە حکومەتی عێراقی بهێنێتە ئاراوە.[1]

ئەنجامدانی ئەم کارە ئاسان بوو، چونکە حکومەتی دروست بوو لاواز و دابڕاو و گەندەڵە. بەلای خەڵکەوە وەها دەبینرێت کە بێ توانایە لە ئەنجامدانی هەر کارێك. کۆمەڵێك هۆکار بەسەریەکەوە کاریگەرن، یەکەم: نەبوونی کەلتووری هاوڵاتیبوون لە عێراقدا، هاوڵاتیبوون بە مانای چالاك و بەدەربەست و خەمخۆر. دووەم: لاوازیی دەزگا نوێکان، سێیەم: گەندەڵی و لاوازیی حکومەت، چوارەم: ئامادەبوونی خەڵکی بۆچوونەوە ژێر باڵی دیکتاتۆریەت. وەك ئیسلام دەڵێت حاکمێکی زاڵم لە پشێوی باشترە. تۆبی دۆج بڕوای وەهایە کە ڕەنگە خۆپیشاندان دژ بە مالیکی دروست بێت، بەڵام جودیپ فیب بڕوای وایە کە کاری وەها لە ئێستادا مەحاڵە ڕوو بدات.[2]

---

[1]. بۆ زیاتر زانیاری بنوارە:

Toby Dodge (2012): Iraq's Road Back to Dictatorship, Survival: Global Politics and Strategy, 54:3, 147-16

[2]. Judith S. Yaphe 2012 Maliki's maneuvering in Iraq, June 6, The Middle East foreign policy mideast.foreignpolicy.com/posts/.../has_the_iraq_experiment_failedCached.

فیب مار بڕوای وەهایە کە بۆئەوەی هەر ڕێگرییەك بکرێت دەبێت کار لە سەر گۆڕانی کەلتوورەکە بکرێت، نەك لە دارشتنی دەستوور یان سەپاندنی دەستوور. لەڕاستیدا ئەم گەمەی دەستوورە مایەی سەرنجە. دەستوور لە نموونەی عێراقدا بریتییە لە کێشمەکێشی ئایدیال بەرامبەر واقیع. جیاوازیی نێوان ئەم دوانە ئاسمان و ڕێسمانە. لە نێوان ئەم دوانەدا دەزگا و حکومەت و کەلتوور و بەرژەوەندی و ئاگایی و ڕاهاتن هەیە. ئەوەی سەیرە لێرەدا ئەوەیە کە ئەو مرۆڤەی لە واقیعەکەدا دەژی دەبێت بێت، لە ڕێگای بەکاربردنی دەزگاکانی حکومەتەوە، واقیعێکی تر بهێنێتە دی، کە دژ بەو واقیعەیە کە لە ئارادایە، بەم پێیە جەنگێك بەرپادەبێت لە نێوان واقیعێکی چەسپیو و واقیعێکی سەپێنراودا، کە لە ئەنجامدا ئەستەمە بۆ واقیعە سەپێنراوەکە بگاتە دۆخی چەسپاندن. ئادید داویشی هەر ئەوەندە لە مالیکی چاوەڕوان دەکات کە گەورەبووی ژێر سایەی ڕژێمی سەدامە و ئەندامی ڕێکخراوێکی نهێنی بووە. دیارە لە هەر دوو دۆخەکەدا بە هیچ شێوەیەك دیموکراسی لە ئارادا نەبووە، هەروەها مالیکی ڕۆژانێکی لە دیمەشق لە ژێر دەسەلاتی ئەسەددا بە سەر برد، کە بە هیچ شێوەیەك بۆنی دیموکراسیی لێ نایەت.

**١١: قەیرانی مالیکی یان عێراق:**

عێراق مەحاڵە ببێت بە دیموکراسی، نە مێژوو، نە کەسایەتی، نە پێکهاتە، نە کەلتوور، نە باوەڕ، نە ژیاری خەڵکی، نە ئاگایی، هیچ کام لەمانە لە عێراقدا هێزێك نین بۆ دیموکراتیزەکردن. لەڕاستیدا هەموویان پێکەوە کۆمەڵە هێزێکن دژ بە دیموکراسییەت. ئەمە دیدێکی ئۆریەنتالیزم نییە، بەڵکو بەداخەوە واقیعە. لە دوای کتێبەکەی ئیدوارد سەعیدەوە بۆتە نەریت کە لەپێناوی ڕازاندنەوە چاوپۆشی بکرێت لە ڕاستی، بەڵام ئەمە هیچ یارمەتیدەر نییە. کەواتە مالیکی تەنها دەرکەوتەیەکی ئەم دۆخەیە، هەر کەسێکی تر بەدوایدا بێت هەر وەها

دەبێت. باڵادەستیی کەس بە سەر سیاسەتدا سروشتی سیاسەتکردنە لە عێراقدا، بە مانایەکی تر لە عێراقدا سیاسەت لە ڕێگای کەس و کەسایەتی و کاریزماوە ئەنجام دەدرێت، خەڵك بە ئاگایی و بێ ئاگایی خوازیاری ئەمەن. فیبی مار لە کارەکانی لە سەر مێژووی عێراق بە جوانی ئەم تایبەتمەندییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

وەك لە سەرەوە پیشانماندا کە ئەو هەوڵەی ئەمریکا دای بۆ دیموکراتیزەکردنی عێراق، هەرزوو سنووردارکرا و ئێستا لە دۆخی تەواو سڕینەوەدایە. لێرەبەدوا دەبێت ئێمە خۆمان بۆ عێراقێك ئامادە بکەین کە ئەگەر دەسەڵات تایدا دیکتاتۆریەتیش نەبێت، ئەوا دیموکراسی نابێت. دیارە بە دڵنیاییەوە دەسەڵات لە عێراقدا دیکتاتۆریەت دەبێت، بەڵام چونکە لە پاشخاندا دیکتاتۆرێکی وەك سەددام ئامادەیە ئەوا دۆخێکی زیهنی وەهای دروستکردووە کە پێناسەی دیکتاتۆریەت بە پێوەری عێراق زۆر جیاوازە. لە بەرامبەر ئەم ڕاستییە تاڵەدا دەبێ ئێمە چی بکەین؟ ئەفسوس هەرێمی کوردستان لە پاش بیست ساڵ لە حوکمی کورد هێشتا هەموو شتێك بریتییە لە کەسەکان، لە قسەکانیان لە دەرکەوتە و هاتوچۆیان.

یەکەم: کورترین وەڵام ئەوەیە کە زیاتر دیموکراسی بین. لە مێژووی نوێدا هەرگیز وڵاتێکی دیکتاتۆری نەیتوانیوە شەڕ لە وڵاتێکی دیموکراسی بباتەوە. دیموکراسی لە هەموو ڕوویەکەوە بەهێزترە لە دیکتاتۆریەت.

دوو: نابێت ئێمە لە عێراق بین بۆ بونیادنانەوەی عێراق، دەبێت لە عێراق بین بۆ بونیادنانی خۆمان. ئەم سیاسەتە هەتا ئێستا بوونی نییە. بیست ساڵ بەفیڕۆ ڕۆشت، نە ئابوورییەکی بەهێز، نە سوپایەکی سەردەمییانە، نە حکومەتێکی کارا، نە نیشتیمانێکی یەکگرتوو، نە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، نە هاوڵاتی، نە ئازادی بە مانا شایستەکەی بە مرۆڤی کورد، بە هیچ شێوەیەك نەهاتۆتە ئاراوە.

سێیەم: لەڕاستیدا ئەگەر ئێمە بتوانین لە دەرەوەی دەسەڵاتی بەغدا بمێنینەوە، وەها باشترە کە بەغدا ببێتە دیکتاتۆر، چونکە ئەو کاتە، ئەگەر ئێمە

وەك دیموكراسی دەركەوین ئەوا دەرفەت و پشتگیریمان بۆ سەربەخۆیی باشتر دەبێت.

چوارەم: دیپلۆماسیكردن وەك گەلێكی خاوەن مێژوو و جوگرافیا و كەلتوور و خەون و خواست، نەك وەك كۆمەڵێك نەوتفرۆش یان ئەجینتی ئەم وڵات و ئەو وڵات.

**١٢: سەردەمێكی نوێ:**

ئەگەر لە پاش راپەڕینەوە سەردەمێكی نوێ دەستی پێكرد، سەردەمی لاوازیی ناوەند، ئەوا ئەمڕۆ ئێمە لە ڕۆژگاری كۆتاییی ئەو سەردەمەدا دەژین و سەردەمێكی تر لە دەستپێكردندایە ئەویش سەردەمی بەهێزبوونی ناوەندە. ئەم بەهێزبوونەی ناوەند چەند پێگەیەكی هەیە، یەكەم: لاوازبوونی هەموو هێزەكانی تر لە بەرامبەر هێزی دەعوەدا و هەبوونی لاوازییەك و بۆشاییەكی وەها كە بوار بڕەخسێنێت بۆ بە دیكتاتۆربوونی سەرۆك وەزیران.

ئەوەی لێرەدا زیاتر مەبەستمانە لە سەردەمێكی نوێ ئەوەیە كە شێوازی نوێ لە پەیوەندی لە نێوان هەرێم و ناوەندا دێتە ئاراوە. پەیوەندیی نێوان هەرێم و ناوەند لە مێژوویدا پەیوەندییەك بووە كە چەند خەسڵەتێكی نەگۆڕی هەیە. خەڵكانێك لە كورد، لە ڕۆژی یەكەمی دروستبوونی عێراقەوە نەیانویستوە عێراقی بن، بۆ داكۆكیكردن لەم خواستە بە هەموو شێوەیەك جەنگاون و بە هەموو شێوەیەك ڕووبەڕووی وەڵامدانەوە بوونەتەوە لە لایەن ناوەندەوە. كەواتە ئەگەر ئەم خەسڵەتانە دیاری بكەین دەڵێین:

یەكەم: خواستی عێراقی نەبوون. ئەم خواستە خۆی لە كێشەی سەپاندنی شووناسێكدا دەسەپێنێ، بە سەر شووناسێكی تردا. دەتوانین بڵێین مێژوو و ڕووداو تراژیدیاكانی ئەم دیاردەیە، كە نزیكەی سەدەیەك دەبێتەوە، گەواهی ئەوەیە كە ناتوانرێت بە ئاسانی پەیوەندی دروست و سەقامگیر لە نێوان ناوەند و

هەرێمدا بهێنرێتە دی. چەمکەکانی ئەم پەیوەندییە زۆرن، لە براوە هەتا هاوپەیمان و هاوبەش و دوژمن دەگرێتەوە. هەموو ئەم چەمکانە هیچ نییە جگە لە ڕەنگدانەوەیەکی تەکتیکی و ئایدیۆلۆژی بۆ چارەسەرێکی کاتی، بەڵام هەموویان شکستیان هێناوە. دەکرێ لەمەودوا قسە لە سەر دوو دوژمن بکەین. دوژمن بە مانای لە یەك نەچوو، لە یەك تۆقیو، جودا و، بڕوا بە یەك نەبوو. چۆن دەتوانرێت دوو دوژمن لە بۆتەقەی یەك وڵاتدا پێکەوە هەڵکەن. تاکە وەڵامێك بۆ ئەم کێشەیە فیدراڵیزمە لە سەر بنەمای ئیتنی و سێکت یان تایفە. لێرەدا فیدراڵیزم یانی هەبوونی توانای جودایی لە هەناوی یەکیەکەدا.

دیارە ڕەنگە بوترێت، کە ئەوەی لە پاش هاتنی ئەمریکا ڕووی داوە ئەمە بووە. لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، هەوڵی کورد بۆ بونیادنانەوەی عێراق، ئاڕاستەیەکی هەڵەبوو، لە هەمان کاتدا دژ بە پرینسیپی فیدراڵیزم بوو. فیدراڵیەت، یانی هەبوونی هێندە جودایی و تایبەتمەندی، کە ناتەوێت ناوەند دەسەلاتی هەژموونی بەسەرت دا بسەپێنێت. بەم پێیە هەبوونی گومانێکی هەتا هەتایی لە ناوەند دەبێت کرۆکی ئەم پەیوەندییە بێت، بەڵام بەشداریی چالاکانەی کورد لە بونیادنانەوەی هێزە سەربازی و هێژەموونییەکانی تری عێراقدا دووفاقی بوو.

کاتێك سەرکردەیەکی کورد دەڵێت: 'کورد لە کاتێکدا سوپای‌عێراقی پێك هێناوەتەوە کە سوننەو شیعە جورئەتیان نەبووە ئەم کارە بکەن ' چونکە بڕوایان وەهابوو، کە عێراق پێویستی بە سوپایەکی بەهێزە بۆئەوەی داکۆکی لە خۆی بکات. ئەمەی لێرەدا ئەم سەرکردە کوردە دانی پیادادەنێت نەبوونی توانایە بۆ بینینی ئەو گومانە هەمیشەییە کە دەبێت ببێتە کرۆکی سیاسەتکردن لەگەڵ ناوەنددا، چونکە دەرئەنجامی لاوازبوونی ئەم گومانە ئەوەیە، کە دەبێت پەشیمانی بکێشی.

دووەم: ناوەندی بەهێز هەمیشە ڕێگرە، فشار دروستکەرە و ئاژاوەگێڕە. ڕووداوەکانی دوز خاڵی وەرچەرخان بوون. پاش ئەوە دەتوانین بڵێین کە ناوەند ئامانجێکی سیاسی هەیە، بەردەوام بەدوای هۆکاردا دەگەڕێت بۆ کردنی بەبیانوو بۆ هێنانە ئارای، ئەم پرۆسەیە درێژخایەن و فرە ئاست و فرە لایەنە.

ئێستێك لە سەر یەکێك لە هەواڵەکانی پاش دوز ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئێمە لە سەرووبەری ڕۆژگارێکی نوێداین.

"بە هۆیەکی نادیارەوە لە شارۆچکەی خورماتوو، پۆلیسی ئیتیحادی هاوڵاتییەکی بە ڕەگەز کورد دەستگیر دەکەن و خانەوادەکەی بە کارێکی سیاسیی دژ بە کورد وەسفی دەکەن. سەر لە بەیانی دوێنێ یەکشەممە ڕێکەوتی ٢٠١٢/١١/٢٥ لە گەڕەکی عەسکەری لە شارۆچکەی خورماتوو هاوڵاتییەك بەناوی (ش، و) دانیشتوی گەڕەکی کۆماری لە لایەن پۆلیسی ئیتیحادییەوە دەستگیر کرا و تاکو ئێستایش هۆکارەکەی نەزانراوە. لەم بارەیەوە کەسێك لە خانەوادەی دەستبەسەرگیراو وتی: دەستگیرکردنی کوڕەکەمان کارێکی سیاسی لە پشتەوەیە، ئەم هێزە بەناو ئیتیحادییە بۆ بێزارکردنی نەتەوەی کورد هاتوون بۆ خورماتوو، چونکە کوڕەکەمان بە مەبەستی کارکردن دەرچووە لە ماڵ و دواتر هەواڵمان بۆ هات کە دەستگیر کراوە".

ئەم هەواڵە بە ئاشکرا ئاماژە بە ئەوە دەکات کە ناوەند لە ڕێگای ئامرازەکانی دەسەلاتیەوە کە لێرەدا پۆلیسە، بێزارکردن، پیشاندانی هێز، فشار دروستکردن، هەموو ئەمانە هەنگاون بۆ ڕێگەخۆشکردن بۆ دوو ئامانج. یەکەم: خۆسەپاندن لە ڕێگای ئەم هەوڵانەوە، دووەم: ئەگەر ئەو ئامانجە بەم شێوەیە فەراهەم نەبوو، ئەوا کردنی ئەم ڕووداوانە بە بیانوو بۆ تەنگەگژێکردنی زیاتری دۆخەکە و ڕێگەخۆشکردن بۆ کاری سەربازی. هەرکام لەم ئامانجانە بێتە دی باڵادەستیی ناوەندی لێ دەکەوێتەوە.

سێیەم: کاتێك ناوەند لە بەرامبەر هەرێمدا بەهێز دەبێت ئەوا ناوەند، وەك ناوەندی دەوڵەتێکی نەتەوەیی دەستوبرد دەست دەکات بە هەوڵی سەپاندنی دەسەلآت بە سەر سەرتاپا پانتاییەکانی ناو سنووری وڵاتدا. ئەمە سروشتی دەوڵەتی نەتەوەییە، بەڵام ئەم دۆخە لە عێراقدا مەترسیدارترە، چونکە عێراق ئەو دەوڵەتەیە کە بەدوای نەتەوەدا دەگەڕێت. شتێك نییە ناوی نەتەوەی عێراق بێت. پاش هاتنی ئەمریکا بۆ عێراق ئەمە بە واقیعی چەسپا، کە تەنانەت شتێك نییە ناوی عەرەب بێت لە عێراقدا. پێکهاتەکانی عێراق ئەمڕۆ جگە لە کورد هیچ کامیان پێکهاتەی نەتەوەییان نییە، بەڵام کاتێك دەوڵەتێکت هەیە کە دەخوازێت دەسەلآتی بە سەر سەرتاپای وڵاتدا هەبێت و لە بەرامبەر ئەمەدا بونیادی کۆمەڵایەتی و ناسنامەیی بۆ سەپاندنی ئەم خواستە لە ئارادا نییە. ئەوا ئەم نەبوونە ناوەند وەها لێ دەکات کە هەمیشە پەنا بۆ هێزی فیزیکی بەرێت لە بەرامبەر شێوازەکانی تری هێزدا بۆ دروستکردنی هێژەموونیەت بە سەر سەرتاپا خاکی عێراقدا. لە کاتێکدا کە شووناسی ناوچەیی دژ بە ئەم خواستەیە، ئەوا هێزی ناوەند و خواستی ناسنامەیی تووشی ڕووبەڕووبوونەوە دەبن. دەکرێت لەم بارەوە قسە لە سەر بنەماکانی لاوازکردنی ناوەند بکرێت. بۆ نموونە دابەشکردنی هێز لە نێوان ناوچەکاندا و، هەروەها دەبێت هەرێم بەردەوام لە خۆ بەهێزکردندا بێت.

مالیکی ئاگادارە لەم ڕاستییە، هەندێك هەوڵی گرتنی هاشمی بۆ ئەم هەوڵانە دەگێڕنەوە. وەك زانراوە، کە هاشمی دوو ڕۆژ پاش دەربڕینی پاڵپشتی بۆ فیدراڵی بوونی ناوچە سوننەکان لە لایەن کوڕەکەی مالیکییەوە لەماڵەکەی خۆی وەدەرنرا.

بە گشتی سەردەمی نوێ بە هۆی ئەم خەسڵەتانەوە شێوازی نوێ لە ململانێی هێز دێنێتە ئاراوە. یەکێك لەو شێوازانە ئەوەیە کە بەهێزی ناوەند ببێتە هۆی لاوازیی هەرێم. چۆن هەرێم دەتوانێت هێزی خۆی بهێڵێتەوە لە کاتێکدا

ناتوانێت ڕێگە لە بەهێزبوونی ناوەند بگرێت. هەرێم لەو قۆناغە تێپەڕی، کە دەیتوانی بەهێزبوونی ناوەند ڕێگە لێ بگرێت یان دوا بخات. سەردەمی نوێ بەوە نوێیە کە ناوەند وەك سەروەرێك بە دوای سەپاندنی سەروەریی خۆیدا وێڵە. بۆ گرتنە ڕێگای ئەم ئامانجە پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، کە هەرێم دەبێت بە وەرچەرخانی دۆخەکە شێوازی خۆی بۆ سیاسەتکردن بگۆڕێت لە پێش هەموو شتێکدا لە ناوەوەدا ئینجا لەگەڵ دەرەوەدا.

**١٣: ناوەوە پێش دەرەوە:**

سیاسەتی دەرەوە دەرئەنجامی پەیوەندییەکی دیالێکتیکییە لە نێوان دەرەوە و ناوەوەدا. هەرێم لەمەودوا لە دۆخی بەرگریدا دەبێت لەگەڵ ناوەندا. ناوەند وەها تەماشای هەرێم دەکات کە پانتاییەکە لە دەرەوەی دەسەڵاتی و دەبێت بکەوێتەوە ژێر دەسەلاتی. کەواتە ئەوەی لێرەدا کرۆکی ئەم سەردەمە نوێیە بەرگرییە. هەرێم دەبێت لە قۆناغێکی بەرگریکردنی درێژخایەندا بێت لەگەڵ ناوەندا. ئەگەر لە ڕابردوودا، دەستوور و داداگا و هێزەکانی ئەمریکا ئامرازبوون بۆ بەرگریکردن ئەوا ئەمڕۆ هەموویان بوونیان یان لاوازبووە یان بە تەواوی نەماوە. بەرگری بریتییە لە پرۆسەی ڕووبەڕووبوونەوە لە هەموو ئاستەکاندا. لێرەدا ئابووری، سەربازی، کەلتوور، باوەڕ، بڕوا، سیستەم، دیپلۆماسیەت هەموو پێکەوە لە پرۆسەیەکی هەماهەنگیدان بۆ دروستکردن و دابینکردنی پێداویستییەکانی بەرگری.

کەواتە داهاتووی ئێمە لە سەر یەك ستراتیژ بەندە، ئەویش ستراتیژی بەرگرییە. لێرەدا هەوڵ دەدەین ستراتیژی بەرگری و ئامرازەکانی بە کورتی ڕاڤە بکەین.

### ١٤: ستراتيژی بەرگری:

کە دەڵێین ستراتیژی بەرگری، مەبەستمان ئەوەیە کە شێوازی پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغدا سەرتاپا بگۆڕدرێت، لە پەیوەندیی بونیادنان و بەشداری و دۆستایەتییەوە بۆ پەیوەندییەك کە دوو لا لە ناو یەك وڵاتدا، کە مێژوویەکی ڕەش لە نێوانیاندا هەیە و، هەتا ئێستا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەو مێژووە دووبارە بێتەوە.

هێڵی بەرگریی یەکەم: گومان

هەبوونی گومان لە پەیوەندیدا، بە مانای ئەوە نایەت کە پەیوەندییەکە نەبێت یان لاوازبێت، بەڵام دەبێت دووربێت لە بڕوا و خۆشباوەڕی و هاریکاری و ئیمزاکردنی بڕوانامە لە دوای بڕوانامە. سروشتی ئەم پەیوەندییە هێزە. هێزیش یان دەبێت لاواز بکرێت یان هاوسەنگ. کاتێك ئێمە دۆخی لاوازی تێدەپەڕێنین، ئەوا لەمەودوا دەبێت بەرەو دۆخی هاوسەنگی بڕۆین.

هێڵی بەرگریی دووەم: پرینسیپ

گەر کورد دەگوێزنەوە لە پێگەی بەهێزەوە بۆ پێگەی کەم هێز یان هاوسەنگ ئەوا ناچارن لەگەڵ ناوەندا بکەونە ململانێی هاوسەنگیی هێزەوە، بەڵام هاوسەنگیی هێز پێویستیی بە پرینسیپە. مەبەستمان لە پرینسیپ ئەوەیە کە دەبێت هەرێم کاتێك هەوڵ دەدات هاوسەنگیی هێز دروست بکات، لەپێناو چ مەبەستێکدا؟ ئایا ئەم مەبەستە پارێزگاری خاکی کوردستانە، پارێزگاری ماف و پێگەی کوردە لە عێراق، پارێزگاری سەروەریی کوردستانە یان پارێزگاری پێگەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییە؟ هەتا ئێستا پرینسیپی یەکێتی و پارتی لە بەغدا تەنها بریتی بووە لە هێنانی پارە بۆ دابینکردنی مانەوەیان وەك دەسەڵاتدار بە سەر خەڵکی کوردەوە. ئێستا ڕۆژگاری ئەم پرینسیپە بەرەو کۆتایی دەڕوات.

### هێڵی بەرگریی سێیەم: بونیادنانی هێز لە ناوەوە

هێز سروشتی نییە، کەس بە سروشت خاوەن هێز نییە، ئەمە مانای ئەوە نییە کە هێز بنەمای سروشتی نییە. سروشت یەکێکە لە هەرە بنەما سەرەکییەکانی هێز، بەڵام تەنانەت لە بوونی سروشتێکی بەهێزدا، گۆڕینی بۆ سەرچاوەی هێزی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی پێویستی بە کار لە سەرکردنە. کەواتە هێز سروشتی نییە بەڵکو بەرهەم دێت. لە دۆخی کورددا چۆن هێز بەرهەم دێت؟ وەك لە سەرەوە پیشاماندا وەك نموونەیەك لای داود ئۆغلۆ، کە پرۆسەی بونیادنانی هێز چەندە ئاڵۆزە و پێویستیی بە دینامیکیەتێکی هەمیشەیی هەیە.

### یەکەم هەنگاو: چاکسازی

دەسەڵاتی کوردی کە ئێستا لە هەرێم لە ئارادایە، لە زۆر ئاستدا پێویستی بە چاکسازییە. ئەم شێوازە دەسەڵاتە لە باشترین شێوەدا جۆرێکە لە دۆخی نائاسایی. نائاساییی دەسەڵات لە میانەی پەیوەندیی دەسەڵاتدایە لەگەڵ یاسادا. پەیوەندیی دەسەڵات و یاسا لە هەرێم پەیوەندیی ئێکسێپشنە، بە پێناسەی جۆرجیو ئەگامبین.[1]

بەو مانایە کە یاسا هیچ نییە جگە لە ئامرازێك بە دەست دەسەڵاتەوە، بەڵام ئەم پەیوەندییە ئامرازییە ئاڵۆزە. یاسا بەکار دێت بۆ پارێزگاریکردن لە حکومەت، یاسا بەکار دێت بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی حکومەت، کەواتە حکومەت لە دەرەوەی یاسا نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانرێت بە پێی یاسا پەیوەندیی لەگەڵ حکومەتدا ببەسترێت. بە مانایەکی تر کاتێك حکومەت دەتوانێت بە پێی یاسا کارەکانی لە بەرامبەر خەڵکیدا ئەنجام بدات لە بەرامبەردا خەڵکی ناتوانن لە ڕێگای یاساوە ڕێگا لە حکومەت بگرن.

---

1. Agamben, Giorgio 2005 State of Exception. Chicago: University of Chicago Press.

## دووەم هەنگاو: ڕێگەدانە بە خەڵك بۆ ئەوەی ببنە بوونەوەرێكی سیاسی

بوونەوەری سیاسی ئەو بوونەوەرەیە كە ئازادی هەیە بەشێوازی دیاریكردن و بەڕێوەبردنی ژیانی خۆی بەدەر لە ترس و فشار و ناچاركردن. ئێستای كوردستان دۆخێكە كە لە ڕێگای ئابووری و ترس و ناچاركردن و فشارەوە زۆرێك لە خەڵك یان خەڵك بە گشتی لە دۆخێكی كەم ئازادیدا یان بێ ئازادیدا ژیان بە سەر دەبەن. ئەم دۆخە خەڵك دەكاتە چەند برێكی جوداوە، هەندێك دەبن بە بەشێك لە سیستەم، گەر بیانەوێت مرۆڤبوونی خۆیان بسەلمێنن بەو شێوەیەی كە دەخوازن، ڕێگەیان پێ نادرێت، بۆیە لە ئەنجامدا لە ژیانێكی پڕ لە ململانێی دووڕووی و قەیراندا دەژین. هەندێكجار ئەنجامی ئەم قەیرانانە بەكارهێنانی توندوتیژییە. هەندێك خەڵك دوور دەكەونەوە و ژیانێكی ناسیاسییانە هەڵدەبژێرن، ژیانێك كە بێدەنگی و بێخواستی و بێ ئامانجی، جگە لە ئامانجی سنووردار و بچوك نەبێت. دیارە ئەم دۆخە بۆ مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ڕەنگە ئاسایی بێت، چونكە مێژووی ڕۆژهەڵات مێژووی مرۆڤی ناسیاسییە. مرۆڤێك كە چالاكانە بەشدار نییە لە بونیادنانی كۆمەڵگاكەیدا، یان بە مانایەكی تر سیستەمی سیاسیی ڕۆژهەڵات خەڵك تیایدا هەمیشە ڕۆڵی سەرباز و ڕەعیەت و بەیعەتبەخش و سەپانیان بینیوە، بەڵام دەسەڵاتی كوردی وەك دەسەڵاتەكانی تری ناوچەكە نییە بتوانێت بە بێ خەڵك یان دوور لە خەڵك بژی، بەڵكو لەڕاستیدا دەسەڵاتێكە لە هەموان زیاتر پێویستی بە خوێنی نەوەكانیەتی. كوردستان ئەو پارچە خاكەیە كە زۆرترین خوێنی نەوەكانی هەڵمژیوە. پاراستنی پارچە خاكێكی وەها بە بێ خەڵكەكەی نابێت. خوێن و خەڵك و خاك سێینەیەكن كە مێژووی خەباتی كوردی دەگێڕنەوە.

## سێیەم هەنگاو: ئابوورییەكی دادپەروەر

ئابووریی كوردستان ئابوورییەكە كە لە خزمەتی سیاسەتدایە، بریتی نییە لە پرۆسەیەك كە تیایدا بەهرە، توانا، خواست، هونەر، ڕەنج، خەونی كەسەكانی كۆمەڵگا جێگای ببێتەوە. لەڕاستیدا ئابوورییەكە بۆ كوشتنی ئابووری. وەك لە

نموونەی ئاژەڵداری و کشتوکاڵدا دەیبینین، شێوازی ئابووریی هەرێم هیچ نییە جگە لە کوشتنی ئابووریی هەرێم خۆی و کردنی بە پاشکۆی ئابووریی وڵاتانی دراوسێ. یەکێك لە دیدەکانی لێکدانەوەی مرۆڤ ئەوەیە کە مرۆڤ هۆمۆئیکۆنۆمیکایە، بەمانایەکی تر مرۆڤ بوونەوەرێکی ئابوورییە. ئابووری یانی بەرجەستەکردنی خود لە شتدا بۆئەوەی خود لەکۆمەڵگادا دەرکەوێت لە لایەك و لە هەمان کاتدا بتوانێت بە مەبەستی دەستکەوتنی پێداویستییەکانی تری شتێکی هەبێت کە بە شتێکی تر بیگۆڕێتەوە. دیارە لەم پرۆسەیەدا پارە وەك ناوەندێك بوونی هەیە. ئێمە لە کتێبی حکومەت و سامانی سروشتی لە هەرێمی کوردستان پێشنیاری مۆدێلێکمان لە بەڕێوەبردنی ئابووری کردووە بۆ کوردستان، کە بە گونجاو و چارەسەری دەزانین.

**چوارەم هەنگاو: کاراکردنی حکومەت**

حکومەت ئەو دەزگا سیاسی و کۆمەڵاتییە باڵایە کە بە پێی دەستوورێك بەڕێوە دەچێت، بۆئەوەی وەك خواستی گشتی، فەراهەمکەری کارە گشتییەکانی کۆمەڵگا بێت. حکومەت تەنها کاتێك حکومەتە کە بێلایەن بێت. ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن هەموو حکومەتەکان لە لایەن حیزبێکی سیاسییەوە بەڕێوە دەبرێن چۆن دەکرێت بێلایەن بێت. ئەمە پرسیارێکی هەڵەیە. کاتێك حیزبێك دەزگاکانی حکومەت بەڕێوە دەبات مانای ئەوە نییە کە دەبێت بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەڕێوەی ببات، بەڵکو مانای ئەوەیە کە دەبێت بە پێی دیدی و ئایدیۆلۆژیای خۆی بەڕێوەی ببات، کە دیدی و ئایدیۆلۆژیا هیچ نییە جگە لە شێوازێك بۆ بەڕێوەبردن. گەر بێتو پارتی سیاسیی براوە حکومەت بۆ خۆی بەڕێوە ببات ئەوە مانای وایە هەڵبژاردن بریتی نییە لە ململانێ بۆ بەڕێوەبردنی وڵات بەڵکو ململانێیە بۆ بردن و قۆرخکردنی وڵات. لەڕاستیدا ئێستا دیموکراسیی وڵاتی ئێمە بەم جۆرەیە، چونکە خەڵك تیایدا بوونەوەرێکی ونن.

ڕۆڵیـان دابینکـەری دەسـەڵاتە، بۆیـە دیموکراسـیی کوردسـتان پێویـستە بـە دیموکراسی بکرێت، چونکە جۆرێکە لـە دیموکراسـی کـە ڕێگرەکـانی دیموکراسی تیایدا زۆرترن لە ڕێگەخۆشکەرەکان بۆ دیموکراسی.

کاتێك ئەم هەنگاوانەی سەرەوە نرا ئەوا بنەماکانی بونیادنانی هێز لە ناوەوە دروست دەبێت.

## ١٥: چۆنێتیی پەیوەندی بە بەغدادەوە:

کورد لە هەرێمی کوردستان ناچارە لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ ناوەنددا، هەتا لە ناو عێراقدا بێت و ئەگەر بێتو جیایش بێتەوە ئەوا هەر دەبێـت لـە پەیوەندیـدا بێت، هەندێ بوار هەیە وەك ئاو، بازرگانی، سەرچاوەی سروشتی، بازاڕ، هاندەری پەیوەندین یان بنەمای بەیەکەوە بەستنی نێوان ئـەم دوو لایەنـەن، بـەڵام ئێـستا ئێمە لـە دۆخـی سـەربەخۆیی نـادوێین، چـونکە ناتوانرێـت سیاسـەت بـۆ دۆخێـك دابڕێژرێت کە هێشتا لە واقیعدا لە ئارادا نییە. دیارە ئەگەر مەبـەستمان بێـت لـە پلانی سەربەخۆیی بدوێین، ئەوا دەبێت بەوردی و بەقووڵی قسە لە جیوپۆلەتیك و ئابووری و سیستەمی حکوم و بەرژەوەندیی ڕکەبەریی وڵاتانی ناوچەکە و جیهـان بکەین، بەڵام لە سەرووی هەموویەوە ئێمە لە ناوخۆدا هیچ هـەنگاوێك نـابینین بـۆ سەربەخۆیی، نە لە ڕووی بونیادی دەزگاوە، نە لە ڕووی بونیـادی نەتـەوەوە، نـە لە ڕووی بونیادی ئابوورییەوە، نە ڕووی بونیـادی کۆمـەڵگاوە، نـە ڕووی بونیـادی دیپلۆماسییەوە، نە لە ڕووی بونیادی زانست و تەکنەلۆژیاوە. ئەوەی لـە ئارادایـە خرۆشـانی سـۆزی خەڵکییـە بـۆ مەبـەستی ڕاکێـشانی سـۆزیان بـۆ لای پـارتێکی تایبەت. دیارە ئەگەر هەرێم پرۆسەی جیابوونەوەی هەبێت ئەوا زیاتر لـە دەسـاڵ دەخایەنێت هەتا ئـەم پرۆسـەیە دەگاتـە دۆخـی سـەرەتایی لـە ڕووی ناوچـەکانی ژێردەستی حکومەتی ناوەندی و، زۆر بواری تر.

کورد لە ناو عێراقدا وەك هەرێمێکی فیدراڵ لە چەندین ئاستدا پەیوەستن بە بەغداوە، بۆیە ناتوانرێت قسە لە نەبوونی پەیوەندی بکرێت بە هیچ شێوەیەك، چونکە پەیوەندیی حەتمییە ئەوا دەسەلات و ململانێ و سیاسەتیش بەشێکی لێکدانەبڕاوی ئەم پەیوەندییەیە. وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا کە هاوسەنگیی هێز باشترین شێوازی ئەم پەیوەندییەیە. هاوسەنگیی هێز چەمکێکی فراوانە.[1]

لە سەرەتا دەبێت ئەوە ڕوون بکەینەوە، هاوسەنگیی هێز بە مانای ئەوە نایەت کە دەبێت چاوەڕوانیی ئەوە بکەیت کەی هێزێك هاتە ئاراوە ئەوا ئەو کاتە تۆیش هەوڵی هاوسەنگیی ئەو هێزە بدەیت. دیارە هاوسەنگیی هێز شێوازێکە کە زیاتر بۆ پەیوەندیی نێودەوڵەتی دەگونجێت، چونکە لە سەر بنەمای ئەوە بونیادنراوە کە هیچ وڵاتێك نییە خاوەن دەسەلاتی سەقامگیربێت، وڵاتان بەردەوام توانایان لە گۆڕاندایە، بەم دۆخە بە گشتی دەڵێن پشێوی یان ئەنارکی. بەو مانایە کە دۆخێك لە ئارادایە کە کەس توانای نییە بەسەری دا و، هێزی وڵاتان بەردەوام لە کەم و زیاددایە. ئەم دۆخە وەها نابینرێت کە دۆخی ناوەوەی وڵات بێت، چونکە پێناسەی دەوڵەت بە مانا ماکس ڤیبەرییەکەی ئەوەیە کە هێزێکی باڵا هەیە، کە هیچ هێزێکی تر نییە هێندەی ئەو هێزە بەهێزبێت، بۆیە هەموو هێزەکانی تر ناچارن ملکەچی ئەو هێزە بن، بەم پێیە دۆخی ئەنارکی یان پشێوی لە ئاراد نییە و، ئەگەر هاتوو لە ئارادابوو ئەوا مانای ئەوەیە کە دەوڵەت بە تەواوی خاوەن سەروەریی نییە، کەموکورتی سەروەری لە ئارادایە، بەڵام دۆخی

---

[1]. بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بنواڕە،
WILLIAM C. WOHLFORTH, RICHARD LITTLE, STUART J. KAUFMAN, DAVID KANG, CHARLES A. JONES, VICTORIA TIN-BOR HUI, ARTHUR ECKSTEIN, DANIEL DEUDNEY and WILLIAM J. BRENNER2007, Testing Balance-of-Power Theory in World History European Journal of International Relations , SAGE Publications and ECPR-European Consortium for Political Research, Vol. 13(2): 155–185

عێراق جیاوازە. هاوسەنگیی هێز پرۆسەیەکی بەردەوامە کە لە دوو ئاستدا فەراهەم دەبێت، ئاستی یەکەم واقیع و ئاستی دووەم پوتێنشاڵ. واقیع مانای ئەوەیە کاتێك هێزێك دێتە ئاراوە هەوڵی هاوسەنگی بدرێت، لە ڕێگای هاوپەیمانی لەگەڵ هێزێکی تردا، لە ڕێگای هاریکاریی هێزێکی نەیارەوە. هەروەها کاتێك توانای خود دەزانرێت ئەوا هەوڵبدرێت ئەو لایەنانەی کە خود لاوازی تیایدا هەیە لە میانەی پەیوەندی لەگەڵ هێزی تردا یان لە ناوخۆدا بونیاد بنرێت. دیارە هاوسەنگیی هێز لە هەمان کاتدا بە مانای بوونی ترسێکی بەردەوام دێت، ترسێك نەك چۆکی کورد بشکێنێت بەڵکو بە پێچەوانەوە هاندەربێت بۆ بەرگریکردن. وەك نموونەی ئیسرائیل بە باشی پێمان دەڵێت کە هێز بنەمای زانستی، ڕێکخراوەیی، دەزگایی، باوەڕیی و، سیاسی هەیە، لە هەمان کاتدا نموونەی ئیسرائیل وانەی ئەوەمان پێدەڵێت کە دیموکراسی هەمیشە براوەیە لە بەرامبەر دیکتاتۆریەتدا. ئەم نووسینە بانگەشە نییە بۆ بە ئیسرائیلبوون بەڵام بۆ وانەوەرگرتن. لە میانەی هاوسەنگیی هێزدا کورد دەبێت هەموو ئامرازەکانی بەکار بهێنێت وەك هێزێك لە بەرامبەر بەغدادا. لە مێژووی تراژیدیی ئێمەدا هێندە تراژیدیا هەیە کە بکرێنە بنەمایەکی ئەخلاقی بۆ ڕاکێشانی پاڵپشتێکی دەرەکی، ئەنفال و هەڵەبجە. کورد خاوەنی هێندە سامانی سروشتییە کە بتوانێت لە ئاستی دەوڵەتی، ناوچەیی، بازرگانی هێندەی سوود لێ ببینێت کە پێگەی قایمتر بکات.

**١٦: کورد و شیعە:**

لەم بەشەدا بە بەرچاوخستنی مێژووی باڵ و لایەنەکانی ناو شیعە ئەوە پیشان دەدەین کە شیعە بە پێی دۆخەکە دیدیان گۆڕاوە لە نێوان ئایین و ناسیونالیزمدا، هەروەها دوانەی ئەخلاق و سیاسەت تیایدا لە هەڵبەزودابەزدایە. لەم ڕوانگەیەوە دەگەینە ئەو ئامانجە کە پەیوەندیی کورد و شیعە بەرەو

پەیوەندییەکی سیاسیی ڕووت دەڕوات، سەرباری هەبوونی مێژوویەکی جودا بەبەراورد بە کورد و سوننە. فاکتەری گەورەی ئەم گۆڕانکارییەیش ئەوەیە کە پەیوەندییەکە لە دوور لە دەسەڵاتەوە دەڕوات بۆ دەسەڵات. پەیوەندیی دوور لە دەسەڵات زیاتر پەیوەندیی بەها و ئەخلاق و مرۆڤانەیە و لە سەرووی هەموویەوە هاوسەنگە، بەڵام پەیوەندیی دەسەڵاتی پەیوەندی سەپاندن و بەرژەوەندی و لاسەنگە. گەر لە عێراقی ئەمڕۆدا شیعە حاکمە ئەوا ناسینی شیعە وەك پێکهاتە، وەك دیدی، وەك ئایدیۆلۆژیا، وەك خەونی دەسەڵات گەلێك پێویستە. شیعە یەك پێکهاتە نین، نە لە ڕووی کۆمەڵایەتی، نە سیاسی، نە باوەڕ. ئەم فرەیییە پێویست دەکات کە بپرسین ئایا سەرباری ئەم فرەیییە، پێکهاتەیەك هەیە کە هەموو شیعە کۆ بکاتەوە، بەڵام با سەرەتا لە فرەییيەوە دەست پیٚ بکەین، شیعە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دابەشبوون بە هەژاران و چینی ناوەندی شار و دەوڵەمەندان، وەك دیدی سیاسی لە نێوان هێمنگەراکان (دیدی سیستانی) و شۆڕشگێڕان (دیدی سەدر). لە ڕووی سیاسییەوە شیعە کۆمەڵێك پارتی سیاسیی جیاوازییان هەیە، حیزبی دەعوەی ئیسلامی کۆنترینە و پاشان سەردییەکان دێن نەك وەك پارتێکی سیاسی بەڵکو وەك جیهانبینییەك زیاتر کە بنەمای ڕەوتی سەدری ئەمڕۆ دادەڕێژن. شایانی باسە سەدر زیاتر لە دیدی خومەینییەوە نزیکە، کە لە هەمان کاتدا کاریگەرە بە بزووتنەوەی ئیخوان. دەکرێت ئەوە بڵێین کە هەموو بزووتنەوە ئایینییەکانی شیعە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئیخوان، چونکە بە سیاسەتکردنی دین پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، ئیخوان ڕۆڵی پێشەوا دەبینێت لەو پرۆسەیەدا.

ئەوەی پەیوەستە بە ئەمڕۆوە کە ڕۆڵی سیاسەتە لە ناو شیعەدا بە تایبەت پەیوەندیی بە کوردەوە بۆ ئەم مەبەستە زیاتر قسە لە سەر سیٚ لایەن دەکەین (سیستانی، سەدر و دەعوە) وەك پاشخانێك بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی شیعە.

دیاره مەجلیسی ئەعلا و فەزیلە و بزووتنەوەی تریش بوونی هەیە، بەڵام ڕۆڵیان لاوەکی و تا ئاستێك بێ کاریگەرە.

دەعوە کە کۆنترین بزووتنەوەی شیعەگەرایە، سەرەتا بزووتنەوەیەکی چاکخوازی کۆمەڵایەتی بوو، بە بێ ئامانجی سیاسی. ئەمە سروشتێکی گشتیی پارتە ئیسلامییەکانە، دەکرێت بە گشتی بە قۆناغی سەرەتا یان قۆناغی مەککەیی ناوببرێت، دیارە لێرەدا مەبەست لە بەکاربردنی مەجازی وشەکەیە نەك مانای دەقاودەق. دەعوە لە ساڵی (١٩٥٧) دامەزراوە، بەپێ لێکۆڵەرەوان بە گشتی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە.

قۆناغی یەکەم: قۆناغی ڕیفۆرمخوازی و دوور لە سیاسەت. قۆناغی دووەم: قۆناغی پارتی سیاسی و پاشان قۆناغی ناسیونالیزم. ئەم وەرچەرخانە بۆ بوون بە ناسیونالیزمی عێراقی پاش قۆناغی دایاسپۆرا دێت. دایاسپۆرا بە مانای دوورە وڵاتی، کاتێك دەعوە ناچار بوو بچێتە ئێران و، بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، پاشان لە کۆتاییی هەشتاکان هەوڵی خۆ بەدووگرتن بدات لە ئێران. وەك دەرئەنجامێکی ئەم قۆناغی دوورە وڵاتییە دەعوە زیاتر و زیاتر جەختی لە سەر عێراقیبوونی خۆی دەکردەوە، دیارە دەکرێت لە هەمان کاتدا وەك قەرەبوویەك بۆ لاوازیی خۆی لێك بدرێتەوە. ئەم دۆخە وەهای کرد کە ناسیونالیزمی عێراقی ببێتە بەشێك لە دیدی باڵای سیاسەتی حیزبی دەعوە.[1]

بە ناسونالیزمبوونی شیعە لە پێش دەسەڵات بنەمای بەرەو ناسیونالیزمی زیاتر دادەڕێژێ لە قۆناغی دەسەڵاتدا، چونکە قۆناغی دەسەڵاتداری لە وڵاتێکی وەك عێراقدا قۆناغی هەڵپەکردنە بۆ سەپاندنی دەسەڵات و هەمیشە ئەم سەپاندنە

---

[1]. بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بنوارە، یاماو دای

Yamao Dai 2008 Transformation of the Islamic Da'wa Party in Iraq: From the Revolutionary Period to the Diaspora Era ،Asian and African Area Studies, 7 (2): 238-267.

پێویستی بە حیاکایەتێك هەیە، لێرەدا ئیسلام هێندە کاریگەر نابێت، چونکە ئیسلام مۆرکێکی شیعەییانەی هەیە، بە لای برێکی زۆری خەڵکی عێراقەوە مایەی نەفرەتە. بەپشتبەستن بەم دیدە دەتوانین بڵێین کە هەوڵی مالیکی وەك دەعوەیەك بۆ خۆدەرخستن وەك ناسیونالیستێك دژایەتی ناکات لەگەڵ دیدی دەعوەدا، وەك پارتێکی سیاسی.

کەسێك کە ڕەنگە ڕۆڵێکی کاریگەر ببینێت لە سەر ڕەوتی دەعوە و بەشێك نەبێت لە دەعوە بە ڕاستەوخۆیی سیستانییە. لە خانوە دوو نهۆمییە خاکی و ساکارەکەیدا سیستانی یەکێکە لە هەر کاریگەترین کەسایەتییە ئایینیەکانی ئایینی شیعە. سیستانی هەتا ئێستایش ئێرانییە، کە بەڵگەیەکە بۆ گرینگیی نەبوونی سنوور لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا. نموونەی زۆری تر هەن کە خەڵکی عێراق بە بێ ناسنامەی ئێرانی پۆستی باڵایان هەبووە لە ئێران و هەروەها بە پێچەوانەوە. سالار بەگی جاف کاتێك لە لایەن شای ئێرانەوە کرا بە ئەندام پەرلەمانی ئێران خاوەنی ڕەگەزنامەی ئێرانی نەبوو، وەك دیپلۆماتێکی سەردەمی شا پێی وتم.

سیستانیکە لە ساڵی(١٩٣٠)دا لە شاریمەشهەدیئێران لە خێزانێکی ناسراوی ئایینی لەدایك بوە، باوکی لە سەدەی نۆزدە لە نەجەف و سامەڕا خوێندویەتی و پاشان گەڕاوەتەوە مەشهەد لە سەردەمی شۆڕشی مەشروتەدا لایەنگری دیموکراتخوازان بووە. سیستانی لە ساڵی(١٩٥٢) بە مەبەستیتەواوکردنیخوێندنیئایینی لە شارینەجەف ڕووی کردۆتە عێراق. سیستانی دەخوازێت ڕۆڵی لە سەرەوەی سیاسەت بێت بۆئەوەی بتوانێت دەستی بە سەر سەرجەم لایەنە سیاسییەکاندا هەبێت. لە ململانێی نێوان مالیکی و هەرێمدا، زانیارییەکان وەها دەردەخەن کە، سیستانی دژ بە ڕووبەڕووبوونەوەیە لە نێوان مالیکی و کورددا. هەروەها لە لایەنی ترەوە وەك گەندەڵی تێوەگلان لە

پرۆسەی چەککرین لەگەڵ ڕوسیادا سیستانی پەیامی ناڕەزاییی خۆی گەیاندۆتە سیستانی. پێگەی سیستانی ئاسان نییە لەنێو پرۆسەی سیاسەتی مۆدرێندا دیاری بکرێت. لەبەر تایبەتمەندیی شیعە، وەك ئایینێکی دامەزراوەیی، پێگەی سیستانی زیاتر لە ڕۆڵی کلێسا دەچێت لە سەدەکانی پێشووی ئەوروپا و لە زۆر شوێن ئێستایش. دەکرێت بڵێین سیستانی وەهای دەنوێنێ کە دەنگ و هێزی ڕەوشت و ئەخلاق و باڵایەتی لە بەرامبەر سیاسەتدا کە هێزێکی ڕۆژانەی دوور لە ڕەوشتی پڕ لە فێڵ و تەڵەکەیە. ئەم دوانەی هێز و بەها لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەمیشە پەیوەندییەکی ئاڵۆزیان هەبووە.

ئەگەر سیستانی دەنگی باڵایی ئایینییە ئەوا سەدر ئەو هێزە هەرزەکارە توندڕەوە جودایە کە دیدێکی جودایە لە زۆر ڕووەوە لە هەر دوو دەعوە و سیستانی. سەدر زیاتر لە ڕەوتی خومەینییەو نزیکە، بەڵام ڕەدووکەوتووی دیدەکانی باوکیەتی کە خاوەن تێزی خۆیەتی لە بواری فەلسەفە و ئابووریدا. سەدر لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە بڕوای بە دادپەرەوەریی ئایینی هەیە کە سەپاندنی دەسەڵاتی خودایە بەو شێوەیەی کە باوکی لێی تێگەیشتوە. سەدر ڕەوتێکە دژ بە هێمنگەرایی، دەتوانرێت بە شۆڕشگێرانە ناوببرێت، هەروەها بۆ خۆسەپاندن بە سەر سەرتاپا عێراقدا بۆیە هەمیشە ئایین تێکەڵ بە ناسیونالیزمی عێراقی دەکات.

هەرچی پەیوەندی بە کوردەوە هەیە سەدر هێزێکە ئەگەر لەگەڵ کوردیشدا پەیوەندی هەبێت، ئەوا پەیوەندییەکی ستراتیژی نابێت، بەڵکو زیاتر تەکتیکی دەبێت، چونکە نە لە باوەڕ و نە لە دیدی سیاسی و نە لە شێوازی هەڵسوکەوتی سەدردایە کە دان بە مافی کورددا بنێت. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە بە گشتی شیعە سێ ڕەوتی سەرەکییە، ڕەوتی ناسیونالیزمی عێراقی ئایینی، کە دەعوەیە، ڕەوتی شۆڕشگێڕی شیعەگەرایی کە سەدرە و ڕەوتی هێمنگەرایی کە سیستانییە.

ئەم سێیینەیە لەگەڵ کۆمەڵێك هێزی تردا پاشخانی ئاڵۆزی سیاسیی شیعە پێك دەهێنن.

هەریەك لەم هێزانە چاوەڕوان دەکرێت هەڵوێستی جیاوازیان هەبێت، بەڵام بە توانا یان مەبەستی جیاوازەوە. هەرگیز چاوەڕوان ناکرێت کە سیستانی بانگەشەی شەڕ بکات، چونکە ئەو کاتە جەنگەکە دەچێتە قۆناغێکی ترەوە زیاتر بۆیاخێکی تایفی وەردەگرێت.

ئایا کورد چۆن دەتوانێت لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ هێزێکی هێندە ئاڵۆزی وەك شیعە؟ دیارە چەند هێڵێکی هاوبەش هەیە وەك هێڵی بێبەری بوون لە حوکمی عێراق، هێڵی چەوساوە، هێڵی ڕێگرتن لە هاتنەوەی دەسەڵاتی سوننە. وەك دەبینین ئەو بانگەشەیەی کە ئێستا هەیە بۆئەوەی حەوزە هەمان هەڵوێستی ساڵانی شەستەکان وەربگرێت بەوەی فەتوایەك بدات کە شەڕی کورد و شیعە حەرامە، وەك موحسن حەکیم دای لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، پاش داوایەك لە لایەن حکومەتی عێراقی ئەو کاتەوە بۆ ئەوەی فەتوایەك بدات بۆ پشتگیریکردن لە شەڕ دژ بە کورد. حەوزە لێرەدا دەکرێتە ئەو چاودێرە پڕ لە ئەخلاقە بۆ ڕێکخستن و ڕاستکردنەوەی دەسەڵات کە دوورە لە ئەخلاق. ئەم دوالیزمەی ئەخلاق و دەسەڵات، حەوزە و حکومەت، ڕێك دوالیزمی کڵێسا و دەوڵەتە لە مێژووی ئەورووپا.

هەموو ئەمانە دەکەونە ژێر فشاری گەورەوە کاتێك شیعە دەگاتە سەر دەسەڵات لە وڵاتدا. وەك دەبینین دوو هێڵی گشتی هەیە لە دیدی شیعەدا هێڵی ئەخلاقی و هێڵی سیاسی، هێڵی ئەخلاقی کە سیستانییە ڕۆڵی هەتا بێت لاوازدەبێت و هەوڵەکانی ئێران بۆ جێگرتنەوەی لە لایەن کەسێکی سەر بە ولایەتی فەقیە کۆتایی بەو ڕۆڵە ئەخلاقییەیش دێنێت و، تێکەڵبوونێکی چڕ دروست دەکات لە نێوان سیاسەت و مەرجەعدا. لە هەمان کاتدا گەشەی ڕۆڵی

موقتەدا لاوازکەرێکی تری ڕۆڵی ئەخلاقی نەجەفە. بەم پێیە دەتوانین بڵێین، گەشتنە دەسەلات، دەبێتە هۆی برەودانی زیاتر و زیاتر بە ناسیونالیزمی عێراقی، لە لایەك و لە لایەکی ترەوە دەبێتە هۆی لاوازبوونی ڕۆڵی ئەخلاقی حەوزە، یان ڕاستتر بڵێین پەراوێزبوونی حەوزە. بە باڵابوونی سیاسەت ئیتر قسە لە سەر ڕابردووی هاوبەش و هاوسۆزی و پەراوێزی و ئەخلاق ڕۆڵی نامێنێت. سیاسەت هونەری یاریکردنە بەوەی لە دەستدایە، بەو مانایە ئەو تواناو ئامراز و شێواز و ڕێگایانە کە لە واقیعدا هەن یان دەتوانرێت بهێنرێنە ئاراوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین، پەیوەندیی کورد و شیعە هەتا پێش هاتنی شیعە بۆ دەسەلات پەیوەندییەك بوو لە سەر بنەمای بێ دەسەلاتی هاتبووە ئاراوە. زیاتر هاوبەشییەکانی وەك پەراوێزبوون، چەوساوە خەسڵەتەکانی دیاری دەکرد. ئەمڕۆ پاش هاتنی دەسەلات بۆ ناو ئەم پەیوەندییە دەبینین دارِن دەبێت لە ڕەهەندە ئەخلاقییەکانی، بەرە و ئەوە دەڕوات کە ببێتە پەیوەندییەکی سیاسیی ڕووت. لە لایەکی ترەوە شیعە لە بزووتنەوەیەکی ئایینییەوە بەرەو ناسیونالیزمی عێراقی دەچێت، چونکە خواستیان وەهایە کە حاکمی هەموو عێراق بن. لەم وەرچەرخانەدا ئایین دەبێتە ئامرازێك. لە هەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامیدا ئایین لە قۆناغەکاندا ڕۆڵی جیاوازی هەیە، کاتێك بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە دەرەوەی دەسەلاتن ئایین سەرخانی سیاسەتە، کاتێك دێنە سەر دەسەلات ئایین دەکەوێتە ژێرەوە. هاتنی ئایین بۆ ململانێی نێوان کورد و بەغدا ڕەهەندێکی ترسناکە، چونکە هەمیشە خەڵکێکی زۆر هەن ئامادەن خۆیان بۆ ئایین فیدا بکەن.

### ١٧: کردنی بەغدا بە بابەتی بونیادی خود:

لە هەموو پرۆسەیەکی بونیادی کۆمەڵایەتیدا هەبوونی نەیارێك، ئەگەر خەیاڵیش بێت پێویستە بۆئەوەی خود لە سەر ئەو نەیارە یان بەرامبەری، پرۆسەی بونیادنانی خودی خۆی بونیادنێت. ئەم ئەوی ترە لە بیری ڕۆژئاوادا

هەمیشە بوونی هەبووە، بەڵام دانپیانان بە پێداویستی بوونی، دیاردەیەکی نوێیە. دیارە ئەم ئەوی ترە بە شێوەی جیاواز ناونراوە و بەشێوازی جیاواز بینراوە لە لایەن بیریارانی سیاسییەوە. لای کارل شمت دوژمنە.[١]

ئێمە لێرەدا تەنها مەبەستمان ئاستە دەرەکییەکەیەتی، چونکە بەکاربردنی لە ناوخۆشدا بەشێوازی جیاواز هەیە، پاشان دێینە سەری. لای سیگمۆند باومان ئەم ئەوی ترە نامۆیە، غەریبە،[٢] لای جێرارد سکەیپگۆتە، بە کوردی بزنی قوربانی،[٣] لای میشێل فۆکۆ مۆنستەرە یان درندە، جۆرێکی تایبەت لە درندە.[٤]

ناوی هەرچییەك دەنێیت پەیوەندیی نێوان کورد عەرەب پەیوەندییەکی دۆستانە نییە، ئەگەر هاتوو دۆستانەیش بوو ئەوا مەرج نییە ئێمە بێ هیچ دوودڵی و ڕاڕاییەك بڕوا بهێنین کە سەرجەم کێشەکانمان کۆتایی هاتووە، چونکە باشترین پەیوەندیمان لەگەڵیاندا پەیوەندییەکی سیاسی دەبێت. لە هەمان کاتدا چونکە پەیوەندییە و، هەر بە پەیوەندی دەمێنێتەوە، مەگەر ئێمە ببین بە عەرەب یان عەرەب بین بە کورد، کە ئەگەری ڕوودانی هەر کامیان مەحاڵە، کەواتە چونکە پەیوەندییە ئەوا هەمیشە دەسەڵات بەرهەم دەهێنێت، چونکە دەسەڵات لە پەیوەندیدا دێتە ئاراوە، بە پێی فۆکۆ، کەواتە هەموو پەیوەندییەك دەسەڵات بەرهەم دەهێنێت. جۆری ئەم دەسەڵاتە پەیوەستە بە جۆری سیاسەتکردنەوە.

---

[1]. بۆ چەمکی دوژمن لای شمت و ڕەخنەکردنی بگەڕێوە بۆ:
Mika Ojakangas (2003): Carl Schmitt's Real Enemy: The Citizen of the Nonexclusive Democratic Community?, The European Legacy: Toward New Paradigms, 8:4, 411-424.

[2]. Marotta Vince 2002 Zygmunt Bauman: Order, Strangerhood and Freedom Thesis Eleven August vol. 70 no. 1 36-54.

[3]. René Girard's 2001 I See Satan Fall Like Lightning [Maryknoll, NY: Orbis http://girardianlectionary.net/res/iss_12-scapegoat.htm

[4]. Andrew Sharpe 2010Foucaults Monsters and the Challenge of Law, Abingdon: Routledge.

له لایەکی ترەوە تەماشای بکەین عەرەب هەمیشە ئێمەی بەکار هێناوە بۆ بونیادنانی خۆی، بۆ بەهانەهێنانەوە بۆ توندوتیژی، بۆ باڵادەستی، بۆ دەسەڵاتی نادیموکراسیی سەرانسەری، بەڵام ئێمە نەمانتوانیوە ئەم سوودە لە ئەوی تربوونی عەرەب وەربگرین، چونکە توانای بونیادنانمان نەبووە. لە بیست ساڵی ڕابردوودا کە توانای بونیادنانی ڕابردوومان هەیە، لەبری بونیادنانی خود لە بەرامبەر ئەوی تری عەرەبدا خۆمان کردۆتە ئامرازی بونیادنانەوەی عەرەب. وەك لە لێدوانی سەرۆکی هەرێمدا ڕوون دەبێتەوە کاتی دانی پیادانا کە ئەوان چالاکانە پێشەواییی دامەزراندنەوەی سوپای عێراقیان کردووە، کاتێك ئەوانی تر نەیان دەوێرا کاری وەها بکەن.

ئێستا عەرەب خۆی بوو بە ئەوی تر، بە ئەو ئەژدیهایەی کە ڕەدووی بوونمان دەنێت. ئەگەر لە ڕابردوودا پێویست بوو وەك مەجاز وەك میتافۆر وەك وێنایەکی خەیاڵی بیر لە ئەوی تری عەرەب بکەینە وەك نەیار بۆ بونیادنانی خود ئەوا ئێستا بە دڵنیاییەوە وەك نەیارێکی واقیعی بوونی هەیە، وەك مەترسییەکی ترسناك، بەڵام سەرباری هەموو ئەمە ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە سوود لە ئەوی تری عەرەب وەك نەیارێك وەربگرین بۆ بونیادنانی خود، بە ئێستایشەوە، چونکە ئێمە هەتا ئێستا تێگەیشتنمان بۆ بونیادنانی خۆمان لە ئاستی خێڵ و بنەماڵەو حیزبدا تێپەڕی نەکردووە، هەتا بتوانین بیر لە ئامرازەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفی بکەینەوە. ئەم ئەوی ترە بنەمای دروستکردنی سنوورێکی ڕۆحیە. سنوورێك کە ئێمە لە هەموو ساتێك زیاتر پێویستمانە، چونکە تەنها لە بوونی سنوورێکی جیاکەرەوەدا ئێمە دەتوانین بوونی جودای خۆمیان لە ئەوی تری نەیاری بوونی ئێمە جودا بکەینەوە. دیارە سنوور مۆدێکە بۆ جیاکردنەوە، کە جودایە لە دابڕان. سنوور بە مانای دابڕان نایەت، بەڵکو شێوازێکی تایبەتیی سیاسییە لە پێکەوەبوون.

لـه ڕووی فەلـسەفییەوە گرینگیـی ئـەم جـۆرە لـە پەیوەندی لـە چـەمکی پوتێنشالدایە یان پەنهان. پێویست ناکات کاتێك ئەوی تر وێنا دەکەیت وەك نەیار هەوڵی ئەوە بدەین کە شەڕی لەگەڵدا بکەیت، بەڵکو چۆن لـە بەرامبەریـدا خـۆت قایم بکەیت، چونکە ئەگەری شەڕ لە ئارادایە. بۆ نموونە ئـەم مەترسـییە پەنهانـە دەبوو ببوایەتە بنەمای بونیادنانی سوپا لای ئێمە. سـوپا بـە مانـا مۆدێرنەکـەی. سـوپا لـە شـێوازی مۆدرێنیـدا بریتییـە لـە هێزێـك کـە ڕێکخـراوە بەشـێوازێکی سـەردەمییانە، ڕێکخـراوە لـە نـاوی خۆیـدا و ڕێکخـراوە لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ دەسەڵات و کۆمەڵگادا. دیارە شێوازی پەیوەندیی نێـوان سـوپا و دەوڵـەت زۆرە. سوپا لە شێوازی پێشمەرگەدا کە ئێستا لـە کوردسـتان بـوونی هەیـە شـێوازێکی نادەوڵەتییە بۆ بوونی سوپا. زیاتر شێوازی گەریلا و شۆڕشگێڕییە. سوپا بریتییە لەو هێزەی کە ڕۆڵی ناوخۆی بۆ ئەوەیە کـە هـەموو هێزەکـانی تـر کـپ بکاتـەوە، چـونکە ئـەو بەهێزترین هێـزە بـەم پێیـە ئـەو هێزەیـە کـە هـەرگیز لـە نـاوخۆدا بەکارنایەت، بەڵام تەنها بوونی یان ئامادەبوونی ڕێگـرە لـە هـەر هێزێکـی تـر کـە خواستی هاتنە ئارای هەبێت. پێشمەرگە ئەم ڕۆڵە ناگێڕێـت لـە نـاوخۆدا، چـونکە پێشمەرگە سەر بـە حیزبـە، ئـەوا بـێ توانایـە لـەوەی ڕێگربێـت لـە هێـزی تـر لـە ناوخۆی کوردستاندا، کە توندوتیژی بەکار بهێنێت.

لایەکی تر دەزگایـە، بـە هاتنـەئارای دەزگـا، بـە بیرکردنـەوە لـەوەی چـۆن هەموومان هەموو تواناکانمان کۆ بکەینەوە، چۆن بونیادی ئـابووری و ژێرخانمـان بەهێز بکەین. لە ڕوویەکی ترەوە بۆی بنواڕین دەبوو ئەم مەترسییە ببوایەتە ئەو پاڵنەرەی کە لە مێژووی بیری فەلسەفی ڕۆژئاوادا بە کۆناتۆس ناسراوە. کۆنـاتۆس یانی پاڵنەری ژیان. چییە ئەوەی وەهات لێ دەکات کە پاڵت پێـوە بنێـت بـژیت؟ بەڵام لەم دۆخەدا مەترسییەکانی ئەوی تری نەیار دەبوو ببوایەتە بنەمای پاڵنەری هێز لە لای ئێمە، پاڵنەری ژیان، بـە تایبـەت ئـەم ئـەوی تـرەی کـە لـە ڕابـردوودا

هەوڵی دابوو ژیان لە ئێمە حەرام بکات. ژیان لە ئێمە بسێنێتەوە لە شێوازی قڕکردندا، ئەنفال و هەڵەبجە.[1] بۆ زانیارییەکی گشتی دەرباری چەمکی کۆناتۆس بنوارە:

### ١٨: یەکڕیزی یان مەرگی سیاسەت:

دیارە بێگومان دەبێت کورد یەك ڕیزبێت لە بەرامبەر نەیارە دەرەکییەکانیدا، بەڵام ئەمەی ئەمڕۆ لە کوردستان پێی دەڵێن یەکڕیزی، بە هیچ شێوەیەك یەکڕیزی نییە. ڕەخنەی ئێمە لەم یەکڕیزییە لە دوو لاوەیە، یەکەم: بەحیزبیکردنی هەموو کورد. دووەم: لەمیانەی یەکڕیزیدا میکانیزمێك نییە کە جیاوازەکان بکاتە بنەمای دەوڵەمەند، سەرباری ئەمە یەکڕیزی بەم شێوازەی کوردی کۆبوونەوەیەکی کاتییە لە پەرامبەر ڕووداوێك یان دۆخێکدا، بۆیە ڕەهەندی داهاتووی و کارکردن لاوازە.

سەرەتا ئەوەی ڕوونە کە کۆبوونەوەی کۆمەڵێك سەرۆك حیزب نابێتە هۆی هاتنە ئارای یەکڕیزیی نەتەوەیەك. یەکڕیزی پێویستی بە مۆدێلێکی تایبەتە لە کارکردنی دەزگایی. لە خوارەوە نموونەی ئەم مۆدێلە واڵا دەکەین، بەڵام سەرەتا با قسە لە سەر فشۆڵیی ئەم شێوازە یەکڕیزییە بکەین و لایەنە نەرێیەکانی ڕوون بکەینەوە.

لە لایەکی ترەوە ئەم یەکڕیزییە، تەنها یەکڕیزییە بەرامبەر ئەوی تری بەغداو، لە هەناویدا هیچ هەنگاوێك نییە بۆ بە دەزگاییکردنی. ئەوەی مایەی کۆمیدیایە لەم یەکڕیزییەدا ئەوەیە کە وەها دادەنرێت کە ئەم دۆخە کاتییە و تێدەپەڕێت بۆیە دەبێت هەموومان یەکگرتوویی پیشان بدەین. لەبری ئەمە دەبوو ئەم دۆخە ئەو ئاگاییە بهێنێتە ئاراوە کە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوی تر دۆخێکی

---

[1]. Jason Waller 2012 Spinoza on Conatus and Persistence through Time Journal of Philosophical Research Volume 37.

هەمیشەییە، بەڵگەیش بۆ ئەمە مێژوو و ڕووداوە تراژیدییەکانیەتی. یەکڕیزی لە شێوازی ئێستایدا نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا کۆمەڵگای کوردی لە کۆمەڵێك مێزی بەناو حیزب پێکهاتووە. هەر یەك لەم سەرۆك حیزبانە ئەجینداى تایبەتیی خۆی هەیە، لە هاتن یان نەهاتن بۆ ناو کۆبوونەوە. کەواتە بەم پێیە ئەوەی پێی دەوترێت بەرژەوەندیی نیشتیمانی، بەرژەوەندیی نەتەوەیی ونە یان پەرتپەرت کراوە بۆ هێندە بەش کە بوونی نەماوە. ئەم دۆخە لە دۆخی ئەورووپای پێش سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوە دەچێت، یان لەڕاستیدا لە دۆخی سۆماڵ دەچێت. کۆمەڵگا و نەتەوە و دەوڵەت و نیشتیمان کۆکراوەتەوە لە جەستەی کۆمەڵێك کەسدا. مێژوو پێمان دەڵێت کە ڕۆڵی حیزب و ئەم کەسایەتییانە چییە و چۆن کاتێك دێتە سەر بەرژەوەندیی باڵاتر لە حیزبەکەیان، بەڵام با ئەوە لێ گەڕێین، ئایا کۆمەڵگای کوردی پێکهاتووە لە کۆمەڵێك حیزب؟ کەواتە بەم پێیە کۆمەڵگایەکی تا سەر ئێسقان دابەشبووە بە سەر بڕێك حیزبدا، وەك خۆی، وەك کۆمەڵگا کە بەرژەوەندیی باڵاتری هەبێت لە بەرژەوەندیی حیزب بوونی نییە. دیارە بێگومان کۆمەڵگای کوردی وەها پێکراوە، بەڵام لەم ساتەوەختی قەیراندا دەبینین کە نیشتیمان و کۆمەڵگا و دەوڵەت و خاك و خەڵك گەورەتر و فراوانتر و ئاڵۆزترە لەوەی لە حیزبدا کورت بکرێتەوە.

یەکڕیزی دەبێت لە توێی کۆمەڵێك دەزگادا بێت. ئەگەر سوپایەکی نیشتیمانی هەبێت کە ئامانجی داکۆکیی نیشتیمان بێت، ئەوا کۆبوونەوەی حیزب پێویست نییە. تەنها جێگایەك کە حیزب دەتوانێت لێوەی دەستوەرداتە سیاسەتی حکومەت پەرلەمانە. دەبێ لە پەرلەماندا هەر حیزبە و پڕۆسەی و دیدی خۆی بخاتە پێش چاو. گەر بڵێین کە سیاسەتی کوردی هێشتا نەگەشتۆتە ئەم دۆخە ئەوا، لە لایەك دەبێت دان بەو شکستەدا بنێین، بۆچی نەگەشتۆتە ئەم

دۆخە، چۆن ڕووداوێکی وەها بکرێتە هاندەر بۆئەوەی تـەکانێك بـدات بـەرەو ئـەو دۆخە.

یەکڕیزی لـە ئێستادا بـە دوو دیودا بـەکار دێـت، یەکـەم: بـۆ بێـدەنگکردن، دووەم: بـۆ زاڵکردنـی ئـەجینـدای پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان. کۆبوونـەوەی کەسایەتییەکان لای سەرۆك، گەواهی ئەوەیە کە هەموو شتێك کە ناوی حکومەتە، ناوی خەڵکە، ناوی پەرلەمانە، ناوی سیستەمە کارتۆنییە. کۆبوونەوە لـە سایەی پارتی هێنانەدی خەونی مێژیینەی پارتییە کە هـەموو شـتێك دەبێـت لـە سایەی ئەودا بێت. یەکێك لە فەنتازیاکانی پارتی ئەوەیە، کە لە لایەن کەسە باڵاکانی ئەو حیزبەوە دەسەڵاتێکی خوداییانە بوونی هەیە بە سـەر کوردسـتاندا. ئەگـەر هـەر کەسێك بیەوێت هەر شتێك بکات دەبێت بـە پـرس و ڕەزامەنـدیی ی ئـەوان بێـت. دەبێت لە لایەن ئەوانەوە پیرۆز بکرێت. وەك ئەنـدامێکی پـارتی لـە گفتوگۆیـەکی هاکەزاییـدا بەسـادەیی درکانـدی هـەموو شـتێك چارەسـەردەبێت ئەگـەر بێتـو تەلـەفۆنێك بـۆ سـەرۆك بکرێـت. لێـرەوە یـەکڕیزی بریتییـە لـە موبارەکـەکردنی دەسەڵاتی سەرۆك، بە مانایەکی تر، ئەوەی لە ژێر ناوی یەکڕیزیـدا دەگووزەرێـت بریتییە لە گەیاندنی پەیامی (ئێمە هەموومان لە ساتەوەختی قەیراندا لـە سایەی سەرۆکدا کۆدەبینەوە بەرامبەر نەیاران). ئەم جۆرە یەکڕیزییە هەرگیز هیـچی لـێ بەرهەم نایەت، چونکە نـە ئەجینـداو بەرنامـەی ئەوەیـە و نـە دەخوازێـت، بـەڵکو یەکڕیزی تەنها بریتییە لە سـاتەوەختێکی مردنـی هـەموو دەنگێـك و پیرۆزکردنـی دەسەڵات.

### فەنتازیای یاسا

گەر ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە، باشووری کوردستان بە سەر دوو جوگرافیای سیاسیدا دابەشبووە، جوگرافیایەکی کوردی و جوگرافیایەکی حکومەتی ناوەنـد. پـاش ڕووخـانی سـەددام، ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ناوەنـد لـە ژێـر دەسـتی حکومەتی ناوەندا مایەوە، بە بوونی کوردیش لەوێ. دروشمی ئـەم قۆناغـە ئـەوە

بوو كە گوایە عێراقی نوێ عێراقی دەستوور و یاسایە، وەك ئەم ناوچانە لە ڕێگای دەستوور و یاساوە دەگەڕێتەوە، پاش ئەوەی برگەی ژمارەی (١٤٠) بۆ چارەسەری ئەم ناوچانە تەرخانكرا. دەكرێت زۆر دەربارەی ئەمە بوترێت، یان لەڕاستیدا زۆر وتراوە، ئەوەی لێرەدا ئێمە دەمانەوێت بیڵێین، دیدێكە كە ئەم دۆخی یاسا بەرامبەر هێزە بەراورد دەكات. كورد زۆر بەم دروشمە دڵی خۆش بوو، كە سەردەمی یاسا و دەستوور هاتۆتە ئاراوە لە عێراقدا. كێشەی ئەم گەشبینییە لەوەدا بووە تەنها پشتی بە دیدی كورد دەبەست بۆ دۆخەكە نەك دیدی ئەوانی تر.

بەم پێیە عێراقی نوێ، عێراقی یاسا و دەستوور، هیچ نەبوو جگە لە دیدێكی دۆنكیشۆتانە لە لایەن كوردەوە. دیارە ئەم دیدە قەیراناوییە بەوەی تێگەیشتنی خوازراو دەكرێت بە واقیع بە بێ ئەوەی واقیع بێت، دۆخێك دێنێتە ئاراوە كە واقیع دەپۆشرێت و هەموو شتێك لە سەر خەیاڵی خود بونیاد دەنرێت. ئێستا بەتاڵیی ئەم دۆخە دەردەكەوێت كە عێراقی نوێ، عێراقی یاسا و دەستوور وەهم بوو. ئەگەر كەسێك بچوكترین هونەری دەوڵەتداری بناسێت، ئەوا هەرگیز پشت بە یاسا نابەستێت لە كۆمەڵگایەكی وەك عێراقدا، كە هەرگیز یاسا بوونی نەبووە، ئەمە لە لایەك لە لایەكی ترەوە لە هەموو دونیادا یاسا تەنها بە پشتبەستن بە هێز دەتوانێت وەك یاسا پەیڕەو بكرێت، هەر یاسایەك هێزی لە پشت نەبێت، تەنها دەقێكی شیعرییە.

ئەگەر بڕوا وەهابێت كە گێڕانەوەی ناوچەكانی ژێردەستی حكومەتی ناوەندی چارەسەر دەكرێت بەخێرایی یان بە چەند شێوازێك یان ئامرازێك، ئەمە بڕوایەكی هەڵەیە. یەكێك لە دەردەكانی سیاسەتی كوردی لە بیست ساڵی ڕابردوودا، نەبوونی دیدێك بووە بۆ چارەسەركردنی هیچ كێشەیەك.

با ساتێك لە ناوەكان ڕابمێنین، ناوچە جێناكۆكەكان، یان ناوچە دابڕاوەكان، یان ناوچە تێكەڵەكان وەك لە پاش هاتنی هێزی دیجلە لە لایەن مالیكیـەوە نـاوی لێ نرا، ئەم ناوانە ئاماژەی ڕوونن كە هێز دیاریكـەری شووناسـی ئـەم ناوچـانەیە. كاتێك دەڵێین هێز مەبەستمان تەنها هێزی سـەربازی یـان فیزیكـی نییـە، چـونكە هێزی سەربازی یان فیزیكی گۆڕێكە لە ماوەیەكی كورتـدا، بـەڵام كێـشەی ناوچـە جێناكۆكەكان كێشەیەكی درێژخایەنە.

هێز لە نێوان هەرێم و بەغدادا، لە كاتێكدا بریتییە لە هێزی هەر یەك لەم دوو لایەنە، لە هەمان كاتدا بریتییە لە هێزی هەر یەك لەم لایەنانە لە ناوچەكەدا. هێـز بەرهەمدێت، لە دونیای ئەمڕۆدا چەندین سەرچاوەی هەیـە، كـە هـەموویان یـەكتر تەواو دەكەن، هێز ڕەوایەتی، هێزی نواندنی گونجاو بۆ حكومداری، هێـزی مـاف، هێزی خزمەتگوزاری، هێزی سەربازی، هێز نەرم، هێزی پشتگیریی نێودەوڵەتی و، لە سەرووی هەموویانەوە هێزی یەكبوون یان یەكڕیزی، بەڵام نەك بە تێگەیـشتنی یەكێتی و پارتی. لە كاتێكدا كورد دەرفەتی هەبوو كـە ببێتـە خـاوەن بڕێكـی زۆر لەم هێزانە، لە سەرتاپایاندا شكستی هێنا، چونكە بۆ فەراهـەمبوونی ئـەم هێزانـە پێویستە پلان و تەكتیك و ستراتیژ هەبێت، تاكە پلانێك كە كورد هەیەتی ئەوەیـە چۆن دژایەتیی كوردێكی تر بكات.

هۆكاری سەرەكیی ئـەم شكستە ئەوەیـە كـە ئـەم ناوچـانە وەك بەشـێك لـە كوردسـتان مامەڵـەیان لەگەڵـدا نـەكراوە، بـەڵكو لـە سـەرووی هەموویـەوە وەك پانتاییەكی حیزبی مامەڵەیان لەگەڵدا كراوە. پانتاییی حیزبی شێواز و مامەڵـە و ئامانجی تایبەتی هەیە. یـەكێك لـە خەسـڵەتەكانی ئەوەیـە كـە ناوچـەكە دەكاتـە جێگای ململانێی دوو هێز كوردی، لەبری ململانێ لە نێوان هەرێم و ناوەندا.

كەواتە گەر بپرسین چۆن ناوچە جێناكۆكەكان دەگەڕێتەوە؟

یەکەم: وەستان و هەڵوەشانەوە و هەوڵدان بۆ هەموارکردنی ئەو هەموو سیاسەتە حیزبییانە لە ناوچەکەدا. کردنەوەی بنکەی سەر بە حکومەتی هەرێم لەبری بارەگای حیزب.

دووەم: داڕشتنی سیاسەتێکی کوردستانیی درێژخایەن بۆ گەڕاندنەوەی ناوچەکە، بە بەکارهێنانی سەرجەم شێوازەکانی هێز، ڕەق و نەرم.

سێیەم: دروستکردنی دۆست و لایەنگر لە کەمینەکانی تری ناوچەکە، وەك ئاگادارم خەڵکی ناوچەکە زۆر نیگەرانن لە سیاسەتی سەقەتی هەر دوو حیزبەکە لە ناوچەکاندا.

چوارەم: سوودوەرگرتن لە دۆخی ناوچەکە، ئێستا تورکیا دژ بە باڵادەستیی کورد نییە لەو ناوچانەدا، چونکە باڵادەستیی حکومەتی ناوەند لە بەرژەوەندیی تورکیا نییە.

پەیوەندیی نێوان هەرێم و ناوەند چ پەیوەندییەك بوو؟ بەرەو چ پەیوەندییەك دەڕوات؟ فاکتەرەکانی چین؟ لە پەیوەندیی سیاسیدا دوو فاکتەری گرینگ هەن کە دروستکەر و سەقامگیرکەرن، یەکەمیان، هێز ئەوی تریان یاسا. یاسا لە کاتێکدا باڵادەستە کە هێز لە دۆخێکی هاوسەنگدا بێت، تەنها لە جێگایەکدا کۆنەبووبێتەوە. یاسا هیچ بایەخ و ڕۆڵێکی نابێت کاتێك هێز بە شێوەیەکی ناهاوسەنگ دابەش دەبێت یان دەتوانرێت بە ئاسانی کەڵەکە بکرێت.

عێراق وڵاتێکە کە هەمیشە هێز ئەو ئامرازە کاریگەرە بووە کە بەکارهێنراوە بۆ سەقامگیربوونی، چونکە عێراق هێندە ناهاوسەنگە لە ڕووی ئێتنییەوە کە ناتوانرێت بەشێوازێکی تر بە ئاسانی سەقامگیر بکرێت. لە هەمان کاتدا ئەوەی لە هەموو زیاتر قەیرانەکەی کردۆتە قەیرانێکی درێژخایەن و نەگریس، ئاگایی و کەلتووری ناوچەکەیە، کە دەڵێم کەلتوور مەبەستم ئەوەیە کە خەڵك تاکە سەپێنەر و درێژەپێدەری سیستەمەکانن، ئەم مەحاڵێتییە دەبوو ببوایاتە بنەمای

چەند بونیادێکی سیاسی بۆ کورد، یەکەم: خۆ بەهێزکردن، دووەم: هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی کوردستان لە عێراق، مەبەست سەربەخۆیی نییە. کاتێك کورد لەگەڵ بەغدادا لە جۆرە ململانێیەکدایە بۆ دژایەتیکردنی خۆی لەبری ململانێ لەگەڵ بەغدا لە ئەنجامدا ئەوەی ڕوو دەدات لە نێوان پەغدا و هەرێم من ناوی دەنێم ژەنگ-گرتن. پێگەی کورد لە بەغدا هەتا بێت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژەنگ دەیگرێت. ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بێت، ئەوا دوای ماوەیەکی تر هێندە لاوازدەبێت کە بە ئاسانی دەتوانێت وەلا بخرێت.

کرۆکی ئەم قەیرانە لەوەدایە کە کورد لە بەغداد وەك یەك یەکە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بەڵام کورد خۆی لە ناو خۆیدا چەند یەکەیەکە. بەم پێیە بەغدا جوگرافیای فشارەکانی دەگۆڕێت، چونکە هەتا بێت لە ئاستی جیاوازدا دەستکەوتی زیاتری لێ بە دەست دەهێنێت.

**١٩: ئێستا کاتی چییە؟:**

نوری مالیکی لە هێز نواندندایە. ئەم پرۆسەیە بە پێی ئاست و شێواز و شوێن سوود و قازانجی دەگۆڕێت. دەکرێت پرۆسەکە بۆ چەند ئاستێك دابەش بکەین. مالیکی لەگەڵ کورد: پارتی و یەکێتی، سوننە و لایەنەکانی تری شیعەدا ململانێی هەیە. هەموو جوڵەیەك لە لایەن هەر هێزێکەوە پەیوەندیی لەگەڵ هەموو ئەم لایەنانەدا لە بەرچاو دەگیرێت.

هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی دیجلە لەسەرەتادا تایبەت بوو بە پارێزگای کەرکوك‌و دیالە" دواتر پارێزگای سەڵاحەدینیشی خرایەسەر. گەرچی وەك ڕاپۆرتە ڕۆژنامەنووسییەکان ئاماژەی پێ دەدەن کە 'ئەنجوومەنو سەرۆکی ئەنجوومەنی هەرسێ‌پارێزگاکە لە کۆبوونەوەکانیاندا بە زۆرینەی دەنگ ئەم

ئۆپەراسیۆنەیان ڕەتکردەوە، بەڵام مالیکی هەر سووربوو لە سەر ئۆپەراسیۆنەکە[1].

بە ڕای ئەندامێکی ئەنجومەنی پارێزگای دیالە "حکومەتی ناوەندیی دەیەوێت لە ڕێگەی ئەم ئۆپەراسیۆنەوە ئەو پارێزگایانە بخاتەژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و هەموو جووڵانەوەیەکیش لە دەستی ئەواندا بێتو یەك قیادەی عەسکەری بۆ دابنێرێت. هاتنی ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییە بۆ ئەو ناوچانە بۆ سنووردارکردنو لێسەندنەوەی دەسەڵاتی پارێزگایە، چونکە بە گوێرەی یاسا" پارێزگار دەسەڵاتی پاراستنی ئاساییشو ئەنجامدانی هەموو جموجوڵێکی سەربازیی هەیە، بە وتەی ناوبراو ئەو ئۆپەراسیۆنە دەیەوێت ئەم دەسەڵاتانە لە دەستی پارێزگار وەربگرێتەوەو کۆنترۆڵی ئەو پارێزگایە بکات، ئەگەر ئەم هەوڵەی ئۆپەراسیۆنی دیجلە سەربگرێت، ئەوا ئەو ناوچانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سەربازییو مەترسیی دیکەیشی بەدوادا دێت". لە ڕاپۆرتی کارزان عوسمان لە چاوی خەڵکەوە وەرگیراوە."

وەك دەبینی پرۆسەکە مەبەست لێی وەلاخستنی دەسەڵاتە ناوچەییەکان و سەپاندنی دەسەڵاتی زیاتر و زیاتری ناوەندە. ئەم هەوڵە بۆ گەڕانەوە بۆ ناوەند، کە لە ئێستادا یانی زاڵکردنی دەسەڵاتی مالیکی، لە کرۆکدا پرۆسەیەکی دەوڵەتگەراییە. دەوڵەت لە میانەی کرداریدا هەمیشە لە پرۆسەی خۆ سەپاندندایە. وەك جەیمس سکۆت بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە دەوڵەت هەمیشە لە پلانی ئەوەدایە، شێواز و دەسەڵاتی خۆی بە سەر سەرتاپای پانتاییەکاندا بسەپێنێ و سەر لە نوێ ڕێکیان بخاتەوە، بەرهەمیان بهێنێتەوە، بیان خاتەگەڕ هەتا بە سوودی ناوەند بگوزەرێن.[1]

---

[1]. James C. Scott 2009 The Art of Not Being Governed: An Anarchist History of Upland Southeast Asia,Yale University Press.

له عێراقی ئێستادا ناوەند بەرەو ئەوە دەڕوات کە ببێتە پانتایی دەسەڵاتی کەسێك، بەڵام لەبەر فرەلایەنیی هێزەکان و، ڕێژەیی قازانج و زیان ئەوا مانۆڕکردن و نواندن جودایە لە شەڕ. شەڕ ڕەنگە بە زیانی زۆر لا تەواو بێت، لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوە لە بەرچاو بگرین کە شەڕ دۆڕاو و براوەی تیادایە، دۆڕانی مالیکی بە زیان لە سەری دەکەوێت، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر درێژخایاندنی شەڕ لە هەمان کاتدا بە قازانجی ناکەوێتەوە. سەرباری هەموو ئەمانە، هەموو هێزەکانی دەوروبەری عێراق ئێستا لە بەرژەوەندیاندا نییە کە لە ناو عێراقدا شەڕ ببێت. بەم پێیە مالیکی لە قازانجیدا نییە کە ڕووداوی دراماتیکی ڕوو بدات، کە ببێتە هۆی وروژاندنی هێزەکانی دەرەوەی عێراق: تورکیا، ئێران و ئەمریکا. دیارە هەر یەك لەم هێزانە ئامانجی جیاوازیان هەیە، بۆیە هەر یەك لە کارەکتەرەکانی عێراق پانتاییەکیان هەیە کە مانۆڕکردنیان تیایدا سنووردارە. بۆ نموونە ئەمریکا هێندە بوار بە مالیکی دەدات کە سەقامگیریی عێراق نەخاتە مەترسییەوە، مالیکیش هەتا ئەو سنوورە دەڕوات کە ئەمریکا لێی بە ئاگابێتەوە. لە هەمان کاتدا هەر دوو کورد و شیعە بونیادنەری پانتاییی دەسەڵاتی ئێرانن، لە لایەکدا کە پانتاییی دەسەڵاتی ئێران تەسك دەبێتەوە، ئێران هەوڵ دەدات شەڕ لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا دروست نەبێت.

لە هەمان کاتدا یەکێتی و پارتی ئامانجی سەرەکییان یان میتۆدی سەرەکییان لەم بارەیەوە مانەوەی پێگەی خۆیانە لە ناوەوەدا. بەم پێیە لە هەموو ئاستێکدا خاوەنی هیچ پلانێك نین بۆ ڕووبەڕووبوونەوە یان چارەسەرکردنی کێشەکە، چونکە ڕووبەڕووبوونەوە لە قازانجیان نییە، بە تایبەت چونکە هەر دوو لا مووچەخۆری مالیکین، لە هەمان کاتدا لە ڕووبەڕووبوونەوەی ساختەدا لەگەڵ مالیکیدا لەڕاستیدا ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، لە کاتێکدا کە مانەوەیان لە سەرووی مانەوەی کورد و کوردستان و کەرکووك و جێگاکانی ترە،

ئامادەنین کە سەرکێشی پێوە بکەن. لە هەمان کاتدا مالیکی ناخوازێت زیاتر و زیاتر بارزانی پاڵ پێوەنێت بۆ باوەشی تورکیا، بۆیە تەنها کاتێک فشاری زۆری دەخاتە سەر، وەك مووچەبڕین کە بێهیوابێت لە هەموو ئەگەرێکی تر. تورکیا و بەغداد ئەگەری لێك نزیکبوونەوەیان لاوازە، ئەگەر بشبێت هێندە کار ناکاتە سەر هەولێر. لەبەر کۆمەڵێك هۆکار، تورکیا ئاگادارە کە هەرگیز لەگەڵ بەغدادا ناگاتە ئاستێك لە پەیوەندی کە بتوانێت پەیوەندییەکی سەقامگیر دروست بکات، لەبەر هۆکاری تایفی، ناوچەیی و پێویست نەبوونی تورکیا بۆ بەغدا و لە هەمان کاتدا پەیوەست نەبوونی بەغدا بە تورکیاوە، چونکە ڕێگاو دەروازەی تری هەیە. لە هەمان کاتدا تورکیا لەوە ئاگادارە کە کوردستان سەرچاوەیەکی زۆری سروشتی هەیە و بە ئاسانی دەبێتە یەکەیەکی دەستەمۆ بۆ تورکیا.

مالیکی جگە لە کورد لایەنێکی تریش هەیە کە لەگەڵیدا لە ململانێدایە، ئەویش سوننەکانە. کورد لەوە بەئاگا نییە کە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مالیکیدا یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەوەیە کە سوننە لە مالیکی نزیك دەبنەوە، بە تایبەتی لە ناوچە کوردییەکانی ژێردەستی بەغدا. بەم شێوەیە لە ئەنجامدا مالیکی لەو ناوچانە بەهێزدەبێت، لە هەمان کاتدا ئەم ڕووداوانە بەکار دەبات بۆ وێناکردنی خۆی وەك پاڵەوانێکی نەتەوەیی عێراقی. مالیکی لە قسەکانیدا لە میانەی ڕووبەڕووبوونەوەکان دەخوازێت وێنایەکی نەتەوەی پێ ببەخشێت. بە مانای ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەی دوو نەتەوەیە: کورد و عەرەب. دیارە بێ ئاگایە لەو ڕەهەندەی کە لە کاتێکدا دان بە نەتەوەییبوونی کورددا دەنێت، دەبێت دان بە مافی نەتەوەییشیاندا بنێت، بەڵام ئەوەی بەلاوە گرینگە کە هەستی نەتەوەیی بجوڵێنێت لەبری هەستی تایفی، بۆئەوەی شیعەو سوننە لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. کەواتە لێرەدا کورد لە میانەی ململانێی ساختەوە هەتا بێت مالیکی

بەهێز دەکات و، ئێستایش هاوکێشەکە بەو شێوەیەیە کە هەتا مالیکی بەهێزبێت کورد لاواز دەبێت.

بۆیە بە سەربازیکردن لە قازانجی کورد نییە، مێژووی کورد ئەمەمان بە تالّی پێ دەڵێت چ لە ئەزموونی تورکیا چ لە ئەزموونی ئێران. ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیش ببێت، ئەوا دەبێت شێوازێکی جیا لە سیاسەتکردن بگیرێتە بەر نەك ئەمەی ئێستا.

لە ئێستادا دوو پێکهاتە گرینگن بۆ مانەوەی هەرێم، یەکەم: سنوور، دووەم: سوپا. هەموو ئەدەبیات و مێژوو و ئەزموونی دەوڵەتی نەتەوەیی پێمان دەڵێن کە دەوڵەت–نەتەوە سروشتی نییە، بەڵکو بە زەبری هێز دروستبووە، ئەمە لە پانتاییەکی تایبەتدا نا، بەڵکو لە سەرانسەری گۆی زەویدا. لە هەمان کاتدا ئەوەیش ڕوونە کە دەسەلاتی دەوڵەت–نەتەوە لە ناوەندەوە، سنوور نەبێت هیچ شتێکی تر ناتوانێت سنووورداری بکات. دیارە کورد ناتوانێت سنووری فەرمی بکێشێت، بەڵکو دەبێت بیر لە شێوازی تری سنوور بکاتەوە. دەکرێ سنوور لە ڕێگای کەلتوورەوە بکێشرێت، لە ڕێگای زمانەوە، لە ڕێگای مافەوە، لە ڕێگای خزمەتگوزارییەوە، لە ڕێگای دەزگاوە، لە ڕێگای هێزەوە.

بۆئەوەی ئەم سنووورە نافەرمییە بپارێزرێت دەبێت سوپایەکلە ئارادابێت. ئەم دوانە یەکتر تەواوکەرن. هەبوونی سنوور لەو شێوەیەی کە ئاماژەمان پێدا، کاتێك سوپایەك لە پشتیەوەیەتی بوونی کاریگەرتر دەبێت. لە هەمان کاتدا هەبوونی سوپایەك بە بوونی سنوورێکی لەو جۆرە کاریگەریی زیاتر دەبێت. بەڵام دەبێت سوپا بە مانای سوپا سوپا بێت، نەك بە مانای کوردی. ئەدەبیاتی سوپا زۆر و فراوانە. لێرەدا بواری ئاماژە پێدانی نییە. ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە سوپا بەرپرسێکی مەدەنی هەیە، پەیوەندیی لەگەڵ حکومەتدا لە ڕێگای یاساوە

ڕێکخراوە، سەر بە پارتێکی سیاسیی تایبەت نییە، پلان و ڕاهێنانەکانی لە ڕێگای دەزگایەکی ستراتیژیی تایبەتەوە بۆ دادەڕێژرێت.

## دەرئەنجام: بەرەو داهاتوو: لە دایکبوونی مرۆڤێکی نوێی کورد:

مرۆڤی کورد ڕەنگە دەگمەن بێت لە سەر گۆی زەوی بەوەی بە هەموو شێوەیەك ماف سەروەرێتی، خاوەندارێتی، سیاسەتکردن، بوونی ئازادو، تەنانەت مرۆڤبوونیشی لێسەندرابێتەوە. لە هەمان کاتدا ئەم مرۆڤە ڕەنگە لەوەشدا دەگمەنبێت کە خاوەنی درێژترین خەبات و کەمترین دەستکەوتە. کورد دوو مێژووی تراژیدی هەیە، یەکێکیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان ئەوی تر لەگەڵ خۆی. هاتنە ئارای ڕاپەڕین و ئەو دۆخە ئازادەی پاش لاوازبوونی حکومەتی ناوەندی، دەرفەتێك بوو بۆئەوەی کورد پێگەیەك بۆ خۆی بونیادبنێت، بەڵام لاوازبوونی دەرەوە بوو بە هۆی زەقبوونەوەی دوژمنایەتیی ناوەوە. ئیتر مێژوویەکی بیست ساڵە لە ململانێی ناشیرین لە هەموو ئاستێکدا بە هەموو ئامرازێك دەستی پێ کرد. دەرئەنجامی ئەم دۆخە ئەوەیە کە فارووق ڕەفیق ناوی دەبات: 'ئەزموونیبیست و یەك ساڵ حوکمڕانییحیزبە سیاسییەکانیکورد لە ناوەوەڕا ڕزیوە، گەندەڵ بوە، ئێمە ئێستا شاهیدیسەرەولێژبوونەوەیئەو حوکمڕانییەین. ئەم ئەزموونە لە ڕوویسیاسیو ئیداریو ئەخلاقیو ویژدانیو یاسایی و لە ڕوویمتمانەیکۆمەڵایەتییەوە بە بەدترین شێوە کەوتوە تەنانەت پرینسیپێك چییە، بەهایەکیگەورە چییە لەم ئەزموونەدا بوونینییە و ئێمە ئێستا شاهیدیمانیفێستیکەوتنە ئەخلاقییەکەیئەم بە ناو ئەزموونەین'.[1]

سەرباری ئەمە و، لەم دۆخەدا ئەمڕۆ کورد لە باشوور جارێکی تر ڕووبەڕووی زیندووبوونەوەی هێزی ناوەند دەبێتەوە. لە دەرئەنجامدا ناچارە لە شێوازی سیاسەتی لەگەڵ خۆیدا بگۆڕێت بۆئەوەی بتوانێت ڕووبەڕووی ناوەند ببێتەوە. کورد گەلێکی جینۆساید کراوە. قەیرانی جینۆساید ئەوە نییە کە دەرەوە نایناسێت بە شێوەیەکی پێویست، بەڵکو کورد هێشتا هەست بەوە ناکات کە

---

1. (لە سایتی سبەی-ەوە).

خەڵکێکە وەک گەلێک ڕووبەڕووی قاتوقڕی بۆتەوە. ئەگەر ئەم هەستە مەبوایە ئەوا دەبوو سیاسەت و پەیوەندی و ئەخلاقی تاکەکەسی کۆمەڵگایی ئەوە بێت کە چۆن کورد وەک گەلێک، نەتەوەیەک بتوانێت لە سەر خاکی خۆی بژی. ژیانکردن پرۆسەیەکی سیاسە، ژیان هیچ نییە جگە لە سیاسەت، سیاسەت بە مانای ژیان لەگەڵ ئەوانی تردا، ڕێکخستنی ئەم ژیانە، ژیان وەک خۆت لەگەڵ ئەوانی تردا. بۆ فەراهەمبوونی ئەمە بەها، ئەخلاق، کەلتوور، مێژوو، ئەزموون گرینگن.

کاتێک گەلانی دونیا بە قەیرانێکدا دەڕۆن، لێی ڕادەمێنن، بیری لێ دەکەنەوە، هەوڵ دەدەن لە بنەماکانی تێ بگەن، بۆئەوەی جارێکی تر بەسەریاندا دووبارە نەبێتەوە، چونکە دووبارەبوونەوەی مێژوو تراژیدیانەیە. لە (٢٠٠٣) ەوە کورد لە دۆخێکی دووفاقی سەیردا دەژی. لە کاتێکدا چالاکانە لە بونیادنانەوەی بەغدادا بوو بە هیچ شێوەیەک خۆی بونیادنەناوە. ئەمە بە هەڵە تێگەیشتن بوو لە فیدراڵیزم. فیدراڵیزم یانی بوون بە جودایی لە ناو دەوڵەتێکدا. دیارە کار و شێوازی ئەم بوونە دەگۆڕێت. لە دونیادا دوو فیدراڵ نییە لە یەک بچن. بەم پێیە فیدراڵی کوردی دەبێت تایبەت بێت. دەبوو کرۆکی فیدراڵی کوردی خۆ پاراستن بوایە لە ناوەند، لە سەر بنەمای گومان و ترس لە ناوەند بونیادبنرایە. ترس نەک بۆ لە پەلوپۆخستن بەڵکو بۆ خۆ بونیادنان، خۆ بونیادنان لە هەموو ئاستێکدا. گەل کاتێک تەنها لە ڕوویەکەوە بەهێزبێت ئەوا هەرگیز بەهێز نییە، ئەمڕۆ ململانێ لە هەموو ئاستێکدا ڕوو دەدات. دیارە ئەگەر بێتو ململانێش ڕوو نەدات، ئەوا پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەغدا پەیوەندییەکی سیاسی دەبێت. کەواتە ململانێ و بەرژەوەندی کرۆکی پەیوەندییەکەیە. لە بیست ساڵی ڕابردوودا مرۆڤی کورد ناوچەی کراوە، بێ هیواکراوە، ترۆ کراوە، بەگژیەکتردا دراوەتەوە، پەراوێزخراوە، سووکایەتی پێ کراوە، گوێی لێ نەگیراوە. هەموو ئەمانە چوونەتە پاڵ ئەو دۆخە ئاڵۆزەی کە وەک مرۆڤێکی کۆلۆنیاڵ لە بنەڕەتدا دە هێندەی تر

ئالۆزیی قەیران و کێشەیان بۆ دروستکردووە. ئەوەی گۆڕانکاریی گەورەی لەم بوارەدا هێنایە ئاراوە پارە بوو. لەڕاستیدا بە هاتنی پارە بۆ هەرێم لە بەغداوە، دەسەلأت لە هەرێم پشتی بە پارە بەست بۆ مانەوە، نەك حکومڕانی و گەشە و بونیادنانی دەزگا و هێز و ڕێکخستنی کۆمەڵگا. ئەمە لە ئەنجامدا بووبە هۆی هاتنە ئارای دەسەلأتێکی کلۆر، قەبە بەڵام ناوەرۆك بەتاڵ. لە پاش (۲۰۰۳)ەوە کۆمەڵگای کوردی بە تێپەڕینی کات، شپرزە و لاواز و بێ باوەڕ دەبوو. لە بەرامبەر ئەمەدا بەغدا بەهێز دەبوو هەتا لەم یەك دوو ساڵی ڕابردوودا دۆخەکە هێندە گۆڕا، کورد لە بونیادنانی بەغداوە بوو بەو هێزەی کە دەپاڕێتەوە لە بەغدا. ئەمڕۆ هەرچەندە ئامانجی ڕووداوەکان هەمیشە بە تەواوی ڕوون نییە، ئەوەی ڕوونە کە پارە، خاك و نیشتیمان و بەها و باوەڕی کوردایەتی هێندە لاوازکردووە، کورد تەنها دەتوانێت لە میدیادا شەڕ بکات. ئەگەر بێتو ڕووبەڕووی بێ مووچەیی و گرانی و ئابلۆقە و جەنگ بێتەوە لەبری بەرگری ڕەنگە شێوازی تر هەڵبـژێرێت کە لە مێـژوودا پێی ئاشنایە. ساتی ئەوەیە کە فێربین لە ئەزموونەکانەوە، کە خۆمان نوێکەینەوە بۆئەوەی لە دونیادا وەك دەیانسۆرمان لێ نەیەت، کە لە ململانێی کەسایەتی و حیزبایەتی پووچ خۆمان بە دوور بگرین.

کورد دەبێت واقیعی بێت، هەندێك کەس باس لە ڕاگەیاندنی دەوڵەت دەکەن، دەوڵەت وەك هەموو شتێکی تر کراوەتە بابەتی میدیا. کورد کە بیست ساڵە دژ بە هەموو بنەمایەکی دەوڵەت چالاکانە کار دەکات، ئەگەر ئەلف و بێی دەوڵەتی بزانیایە هەرگیز باسی شتی وەهای نەدەکرد. دەوڵەت دەزگایەکە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خود، کە تۆ نەتتوانی بۆ ئەو مەبەستە بیهێنیتە ئاراوە، ئەوا دەوڵەت نایەتە ئاراوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوی تر. زۆر لە مێژوودا دۆڕاوین. هۆکاری سەرەکی هەمیشە خۆمان بووین، چونکە وەفامان بۆ گەل و نیشتیمان و خۆمان نییە، بەڵکو بۆ چەند تاکەکەسێکە. دەبێ مرۆڤی کورد بگۆڕێت، دیدی بۆ

دونیا و سیاسەت و پەیوەندییەکان بگۆڕێت. دەبێت ئەخلاقێکی نوێ لە دایک بێت، ئەخلاقی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی و سروشتی و مرۆڤانە. دەبێت مرۆڤێکی نوێی کورد لە دایك بێت کە خوازیاری ژیان و ئازادی و یەکسانییە لە دۆخێکی مرۆڤانەدا، لە ژینگەیەکی مرۆڤدۆستانەدا. کرۆکی ئەمە سیاسەتە، گەر سیاسەت بەم سەقەتییە بمێنێتەوە، گەر سیاسەت ئامانجی سەرەکی خزمەتکردنی کۆمەڵێك کەس بێت دژ بە کۆمەڵگا، ئەوا دەرئەنجامەکەی لاوازی و پشێوی و هەڵەشەیی میدیایە.

## دەقی گرینگ لە بارەی عێراقەوە بۆ کەسانێک

## کە عێراقناسییان بە لاوە مەبەستە:


– Toby Dodge (2012): Iraq's Road Back to Dictatorship, Survival: Global Politics and Strategy, 54:3, 147-168.

– F. S. Naiden2007 Lines in the Sand The Wilson Quarterly (1976-) Vol. 31, No. 1 (Winter,), pp. 52-63.

– Wiley, J. 1992. The Islamic Movement of Iraqi Shia. Boulder: Lynne Rienner Publishers. ERIC DAVIS Memories of the State: Politics, History, and Collective Identity in Modern Iraq. Berkeley: University of California Press, 2005.

– DODGE TOBY 2003Inventing Iraq, The Failure of Nation Building and a History Denied, New York: Columbia University Press.

– MARION-FAROUK SLUGLETT and PETER SLUGLETT 2001 Iraq Since 1958: From Revolution to Dictatorship, London: I.B. Tauris.

– FALEH A. JABAR 2003The Shi'ite Movement in Iraq, London: Saqi Press.

– FALEH ABDUL-JABAR and HOSHAM DAWOD. London: Saqi Press, 2003.

– MAJID KHADDURI1951 INDEPENDENT IRAQA Study in Iraqi Politics since 1932 OXFORD UNIVERSITY PRESS.

– Abdulghani, Jasim M., Iraq and Iran: The Years of Crisis, Baltimore, MD, Johns Hopkins University Press, 1984.

– Abu Jaber, Kemal, The Arab Baath Socialist Party, Syracuse, Syracuse University Press, 1966.

– Aburish, Said K., Saddam Hussein: The Politics of Revenge, London, Bloomsbury Pr, 2001.

– Adams, Doris Goodrich, Iraq's People and Resources (University of California Publications in Economics), XVIII, Berkeley, CA, University of California Press, 1958.

– Ahmad, Kamal Madhar, Kurdistan During the First World War, London, Saqi Books, 1994.

– Ali, Othman, British policy and the Kurdish question in 'Iraq 1918-1932, Ottawa, National Library of Canada, 1995.

– Alnasrawi, Abbas, Financing Economic Development in Iraq: The Role of Oil in a Middle Eastern Economy, Westport, CT, Praeger, 1967

– Arfa, Hassan, The Kurds: An Historical and Political Study, London, Oxford University Press, 1966.

– Axelgard, Frederick W. (ed.), Iraq In Transition: A Political, Economic, and Strategic Perspective, Boulder, CO, Westview Press, 1986.

– Barth, Fredrik, Principles of Social Organization in Southern Kurdistan (University Ethnographic Museum Bulletin, No. 7, Oslo, Brodrene Jordensen, 1953.

– Batatu, Hanna, The Old Social Classes and the Revolutionary Movements of Iraq: A Study of Iraq's Old Landed and Commercial Classes, and of Its Communists, Baathists, and Free Officers, Princeton, NJ, Princeton University Press, 1978.

– Braude, Joseph, The New Iraq: Rebuilding the Country for Its People, the Middle East and the World, NYC, Basic Books, 2003.

– Bruinessen, Martin van, Kurds and Identity Politics, London, I.B. Tauris, 2001.

– Bulloch, John and Harvey Morris, No Friends But the Mountains: The Tragic History of the Kurds, Oxford, Oxford University Press, 1992.

– Darwish, Adel and Gregory Alexander, Unholy Babylon: The Secret History of Saddam's War, London, Diane, 1991.

– Hamza, Khidir, Saddam's Bombmaker: The Daring Escape of the Man Who Built Iraq's Secret Weapon, NYC, Touchstone Books, 2001.

– Kristol, William and Lawrence F. Kaplan, The War over Iraq: Saddam's Tyranny and America's Mission, NYC, Encounter Books, 2003.

– Tripp, Charles, History of Iraq, London, Cambridge Univ. Press, 2002.

– Clawson, Patrick (ed.), How to Build a New Iraq After Saddam, Washington, DC, The Washington Institute for Near East Policy, 2002.

– Cockburn, Andrew and , Patrick Cockburn, Out of the Ashes: The Resurrection of Saddam Hussein, NYC, Harper, 2000.

– Devlin, John, The Baath Party: A History from Its Origins to 1966, Stanford, Hoover Institution Press, 1976.

– El-Azhary, M.S, The Iran-Iraq War: An Historical, Economic, and Political Analysis, NYC, St. Martin's Press, 1984.

– Elliot, Matthew, Independent Iraq: The Monarchy and British Influence 1941-58, London, I.B. Tauris.

– Entessar, Nader, Kurdish Ethnonationalism, Boulder, CO, Lynne Rienner Publishers, 1992.

– Feldman, Shai (ed.), After the War in Iraq: Defining the New Strategic Balance, Brighton, Sussex, 2003.

– Fernea, Elizabeth Warnock, Guests of the Sheik: An Ethnography of an Iraqi Village, Anchor, 1969.

– Fernea, Robert Alan, Shaykh and Effendi; changing patterns of authority among the El Shabana of southern Iraq, Cambridge, Mass, Harvard University Press, 1970.

– Fuad, Jamal, The Kurdish question: Missed opportunities and future challenges, Tallahassee, FL, Badlisy Center for Kurdish Studies, 1993.

– Gabbay, Rony, Communism and Agrarian Reform in Iraq, London, Croom Helm, 1978.

– Gallman, Waldemar, Iraq Under General Nuri, Baltimore, MD, Johns Hopkins University Press, 1964.

– Ghareeb, Edmund, The Kurdish Question in Iraq, Syracuse, NY, Syracuse University Press, 1981.

– Goodman,Martin, State and Society in Roman GalileeAD 132-212, Rowman and Allanheld, 1983.

– Gordon, Michael and Bernard Trainor, The Generals' War, NYC, Little, Brown and Co, 1996.

- Grummond, Stephen, The Iran-Iraq War: Islam Embattled, Westport, CT, Praeger, 1982.

- Gunter, Michael M., The Kurds of Iraq: Tragedy and Hope, NYC, St. Martin's Press, 1993.

- Haj, Samira, The Making of Iraq 1900-1963: Capital, Power, and Ideology, NYC, State Univ of New York Pr, 1997.

- Hamza, Khidir, Saddam's Bombmaker: The Daring Escape of the Man Who Built Iraq's Secret Weapon, NYC, Touchstone Books.

- Hassanpour, Amir, Nationalism and Language in Kurdistan, San Francisco, Mellen Research University Press, 1992.

- Hazelton, Fran (ed.), Iraq since the Gulf War: prospects for democracy, London, Zed Books, 1994.

- Helms, Christine Moss, Iraq, Eastern Flank of the Arab World, DC, Brookings Institution, 1984.

- Hiro, Dilip, The Longest War: The Iran-Iraq Military Conflict, NYC, Routledge, 1991.

- Holt, P. M., Egypt and the Fertile Crescent, 1516-1922, A Political History, Ithaca: Cornell University Press, 1966.

- Hussein, Fuad Mohammad, The legal concept of self-determination and the Kurdish question, Amsterdam, Luna, 1985.

- Ireland, Philip, Iraq: A Study in Political Development, NYC, Macmillan, 1938.

- Izady Mehrdad R., The Kurds, Washington, DC, Taylor&Francis, 1992.

- Jalal, Ferhang, The Role of Government in the Industrialization of Iraq 1950-65, London, Frank Cass, 1972.

- Jawad, Saad, Iraq and the Kurdish Question 1958-1970, London, Ithaca Press, 1981.

- Karsh, Efraim and Inari Rautsi, Saddam Hussein: A Political Biography, NYC, Grove, 2003.

– Kasaba, Resat and Sibel Bozdogan (ed.), Rethinking Modernity and National Identity in Turkey, Seattle, University of Washington Press, 1997.

– Kelidar, Abbas, The Integration of Modern Iraq, NYC, St. Martin's Press, 1979.

– Kemp, Percy, Territoires d'Islam: Le monde vu de Mossoul au xvii siecle, Paris, Sindbad, 1982.

– Khadduri, Majid, Independent Iraq 1932-1958, London, Oxford University Press, 1970.

– Khadduri, Majid, Republican Iraq, London, Oxford University Press, 1969.

– Khadduri, Majid, Socialist Iraq: A Study in Iraqi Politics since 1968, DC, Middle East Institute, 1978.

– Khadduri, Majid, The Gulf War: The Origins and Implications of the Iraq-Iran Conflict, NYC, Oxford, 1988.

– Khadduri, Majid and Edmund Ghareeb, War in the Gulf 1990-1991, NYC, Oxford University Press, 1997.

– Kirisci, K. and Winrow, G.W, The Kurdish Question and Turkey: An Example of a Trans-State Ethnic Conflict, London, Frank Cass, 1997.

– Kramer, Samuel Noah, Cradle of Civilization, NYC, Little Brown & Company, 1969.

– Kreyenbroek, Philip G. and Allison C., Kurdish Culture and Identity, London, Zed Books, 1996.

– Kreyenbroek, Philip G. and Sperl Stefan (ed.), The Kurds: A Contemporary Overview, London/New York, Routledge, 1992.

– Kristol, William and Lawrence F. Kaplan, The War over Iraq: Saddam's Tyranny and America's Mission, NYC, Encounter Books, 2003.

– Laizer, Sheri, Martyrs, Traitors and Patriots, London, Zed Books, 1996.

– Lamsa, George M. and William Chauncey Emhardt, The Oldest Christian People, NYC, AMS, 1970.

– Langley, Kathleen M., The Industrialization of Iraq (Harvard Middle Eastern Monograph Series, V, Cambridge, MA, Harvard University Press, 1967.

– Layard, Henry Austin, Ninveh And Its Remains, Westport, CT, Praeger, 1970.

– Longrigg, Stephen, Iraq 1900 to 1950, London, Oxford University Press, 1953.

– Longrigg, Stephen Hemsley, Four Centuries of Modern Iraq, London, Oxford University Press, 1925.

– Longrigg, Stephen Hemsley, and Frank Stoakes, Iraq, London, Ernest Benn, 1958.

– Lytle, Elizabeth Edith, A bibliography of the Kurds, Kurdistan, and the Kurdish question, Monticello, Ill, Council of Planning Librarians, 1977.

– Mackey, Sandra, The Reckoning: Iraq and the Legacy of Saddam Hussein, NYC, W.W. Norton and Co, 2002.

– Makiya, Kanan, Republic of Fear, The Politics of Modern Iraq, Berkeley, CA, University of California Press.

– Malek, Yusuf, The British Betrayal of the Assyrians, Chicago, Assyrian National Federation and Assyrian National League of America, 1935.

– Marr, Phebe, The Modern History of Iraq, Boulder, CO, Westview Press, 1985.

– McDowall, D., A Modern History of the Kurds, London and New York, I.B. Tauris, 1996.

– McDowall, David, The Kurds, London, Minority Rights Report, 1991.

– Miller, Judith and Laurie Mylroie, Saddam Hussein and the Crisis in the Gulf, NYC, Times Books, 1990.

– Mojab, Shahrzad, Women of a non-state nation: The Kurds, Costa Mesa, Calif, Mazda Publishers, 2001.

– Morony, M.G., Iraq after the Muslim Conquest, Princeton, NJ, Princeton University Press, 1984.

– Nakidmon, Shlomo, First Strike: The Exclusive Story of How Israel Foiled Iraq's Attempt To Get The Bomb, NYC, Summit, 1990.

– Niblock, Tim, Iraq: The Contemporary State, NYC, St. Martin's Press, 1982.

– Nonneman, Gerd, Iraq, the Gulf States, and the War: A Changing Relationship 1980-1986 and Beyond, London, Ithaca Press, 1986.

– O'Ballance, Edgar, The Kurdish Revolt, 1961-1970, Hamden, Connecticut, Archon Books, 1973.

– Ocalan Abdullah, Declaration on the democratic solution of the Kurdish question, London, Mesopotamian Publishers, 1999.

– Olson Robert, The Emergence of Kurdish Nationalism and the Sheik Said Rebellion, 1880-1925, Austin, The University of Texas Press, 1989.

– Olson, Robert (ed.), The Kurdish Nationalist Movement in the 1990's: It's Impact on Turkey and the Middle East, Lexington, The University Press of Kentucky, 1996.

– Owe, Roger and William Roger Lewis (ed.), A Revolutionary Year: The Middle East in 1958, London, I.B. Tauris, 2001.

– Pelletiere, Stephen C., The Kurds: An Unstable Element in the Gulf, Boulder, CO, Westview Press, 1984.

– Penrose, Edith and E.F. Penrose, Iraq: International Relations and National Development, Boulder, CO, Westview Press, 1978.

– Piscatori, James (ed.), Islamic Fundamentalisms and the Gulf Crisis, Cambridge, American Academy of Arts and Sciences, 1991.

– Pitt, William Rivers and Scott Ritter, War on Iraq: What Team Bush Doesn't Want You to Know, NYC, Context Books, 2003.

Pollack, Kenneth M., The Threatening Storm: The Case for Invading Iraq, NYC, NYC, Random House, 2002.

– Randal, Jonathan C., After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters With Kurdistan, Denver, Westview Pr, 1999.

– Ritter, Scott, Endgame: Solving the Iraq Crisis, NYC, Simon and Schuster, 2002.

– Rogers, Will and Sharon Rogers, Storm Center: The USS Vincennes and Iran Air Flight 655, Annapolis,MD, Naval Institute Press, 1992.

Roux, George, Ancient Iraq, Cleveland, World Publishing, 1965.

Sabar, Yona, The Folk Literature of the Kurdistani Jews: An Anthology, New Haven, Yale University Press, 1982.

SAJAWAD, Iraq and the Kurdish Question 1958-1970, London: Ithaca Press, 1981 .

Shurdom, Jamal A., The Price of Victory: The Gulf War, MECRA, 2000.

Shwadran, Benjamin, The Power Struggle in Iraq, NYC, Council for Middle Eastern Affairs Press, 1960.

Sifry Micah L. and Christopher Cerf, The Iraq War Reader, NYC, Touchstone Books, 2003.

– Silverfarb, Daniel, Britain's Informal Empire in the Middle East: A Case Study of Iraq 1929-1941, London, Oxford, 1997.

– Simon, Reeva, Iraq Between the Two World Wars, NYC, Columbia University Press, 1986.

– Simons, Geoff, The Scourging of Iraq Sanctions, Law and Natural Justice, London, Palgrave Macmillan, 1996.

– Sluglett, Peter, Britain in Iraq 1914-1932, London, Ithaca Press, 1976.

– Solomon, Norman et. al, Target Iraq: What the News Media Didn't Tell You, NYC, Context Books, 2003.

– Stafford, R.S, The Tragedy of the Assyrians, London, Allen and Unwin, 1935.

– Summers, Harry, On Strategy II: A Critical Analysis of The Gulf War, NYC, Dell, 1992.

– Tahir-Kheli, Shirin and Shaheen Ayubi (ed.), The Iran-Iraq War: New Weapons, Old Conflicts, Westport, CT, Praeger, 1983.

– Tarbush, Mohammad A., The Role of the Military in Politics: A Case Study of Iraq to 1941, London, Kegan Paul International, 1982.

– Thesiger, Wilfred, The Marsh Arabs, NYC, Dutton, 1964.

– Timmerman, Kenneth, The Death Lobby: How The West Armed Iraq, NYC, Houghton Miflin, 1991.

– Tripp, Charles, A History of Iraq, Cambridge, Eng, Cambridge Univ Pr, 2002.

– Wallach, Janet, Desert Queen: The Extraordinary Life of Gertrude Bell: Adventurer, Adviser to Kings, Ally of Lawrence of Arabia, NYC, Anchor/Doubleday, 1996.

– Warriner, Doreen, Land Reform and Development in the Middle East: A Study of Egypt, Syria, and Iraq, London, Oxford University Press, 1962.

– Wiet, Gaston, Baghdad: Metropolis of the Abbasid Caliphate, Tulsa, Univ of Oklahoma Pr, 1971.

– Young, Gavin, Return to the Marshes: Life With the Marsh Arabs of Iraq, London, Collins, 1977.

# خاکی نیشتیمان لە چارەسەری دەستوورییەوە
# بۆ ململانێی سەربازی

د. دەریاز محەمەد

پاش ڕزگارکردنی عێراق لە دەسەلاتی ڕژێمی بەعس لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٣ دا، هەموو خاکی هەرێمی کوردستان بە کردەوە لە دەستی ئەو ڕژێمە ڕزگاری بوو، بەڵام تاوەکو ئێستا ئەو بەشە گەورە و گرینگ و ستراتیجییەی خاکی کوردستان، نەگەڕاوەتەوە ژێر دەسەلاتی حکومەتی هەرێم، بەڵکو لە ساڵی ٢٠٠٤ ەوە، چارەنووسی ئەم ناوچانە بەسترایەوە بە جێبەجێکردنی کۆمەڵێك ڕێوشوێنی یاسایی و دەستووری، لە خاکی نیشتیمانیی کوردستانەوە، کرا بە ناوچەی جێناکۆك، بەڵام تاوەکو ئێستا هیچ کام لەو بنەما یاساییانە جێبەجێ نەکراون و ئاسۆی جێبەجێکردنیشیان ڕوون نییە.

لەم توێژینەوەیەدا، چەند لایەنێکی گرینگیی ئەم کێشەیە شی دەکەینەوە، بە تایبەت سەبارەت بە جوگرافیای ناوچە جێناکۆکەکان لە هەرێمی کوردستان و لە پارێزگاکانی دیکەی عێراق و کێشە هونەرییەکانی مادەی ١٤٠ ی دەستوور و مامەڵەی سەرکردایەتیی هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا.

## ١. ناوچەی جێناکۆك چییە؟

ناوچەی جێناکۆك بریتییە لە ڕووبەرێك لە زەوی، کە ناکۆکی لە سەر خاوەندارێتیی هەیە، لە نێوان دوو لایەندا. بە زۆری ناکۆکییەکان لە نێوان وڵاتاندا دروست دەبێت، نموونەی ناکۆکیی نێوان ئیسرائیل و سوریا لە سەر بەرزاییەکانی جۆلان، دوورگەکانی (طنب الکبری و طنب الصغری و ابوو موسی)، لە نێوان ئیمارات و ئێران، لە گەڵ چەندین نموونەی جیهانیی دیکە.

لە ناوخۆی وڵاتاندا، زیاتر لەو وڵاتانەدا ناوچەی جێناکۆك هەیە، کە جیاوازیی نەتەوەیی، یان ئایینی، یان مەزهەبی، لە نێوان دانیشتوانەکەی دا بوونی هەیە و،

لە ڕێگەی سیستمێکی دیموکراسییەوە بەڕێوە نابرێن، بەڵکو لە سەر بنەمای ئینتیمای ئیتنی و، زاڵبوونی پێکهاتەیەك بە سەر پێکهاتەیەکی تردا، یان بە سەر پێکهاتەکانی تردا، ناوچە جیاجیاکان بەڕێوە دەبرێن.

باشترین نموونەی ناوچەی جێناکۆك لە ناوخۆی وڵاتاندا (ویلایەتی دارفور)ە لە وڵاتی سوودان، کە بە هۆی جیاوازیی ئایینی و نەتەوەییەوە، جیاکاری دژی ڕەگەزە ئەفریقاییەکان دەکرێت لە لایەن دەوڵەتەوە و، لە ڕێگەی میلیشیای تایبەتەوە، خێڵەکییەکانی دارفور تا ڕادەی کوشتن و بەکۆیلەکردن و دەرکردن، دەچەوسێنرێنەوە. نموونەیەکی تر بریتییە لە بیابانی گەورە، کە لە نێوان دەوڵەتی مەغریب و بەرەی پۆلیساریۆ ناکۆکیی لە سەرە.

## ١-١ ئیدارەی ناوچە جێناکۆکەکان لە ڕووی یاسای نێودەوڵەتییەوە:

لە بنەمادا یاسای نێودەوڵەتی ئەو کێشانە ڕێك دەخات، یاخود چارەسەر دەکات، کە لە نێوان دەوڵەتاندا ڕوو دەدەن، بۆیە گرینگی بە کێشە ناوخۆییەکان نادات، تەنها لە چەند حاڵەتیکی دیاریکراودا نەبێت، کە بە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەستتێوەردانیان تێدا دەکات.

کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە و، ناتوانرێت بە یاسای نێودەوڵەتی چارەسەر بکرێت، تەنها لەم دۆخانەدا نەبێت:

١. ئەگەر هاتوو حکومەتی ناوەندیی عێراق، داوای ناوبژیوانی، یان لێکۆڵینەوە، یان نێوەندگیری، لە یەکێك لەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و هەرێمییانە کرد، کە عێراق ئەندامە تێیان دا، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان، بە پشت بەستن بە مادەی ٥٨ لە یاسای کاتیی ئیدارەی دەوڵەت، کە گواستراوەتەوە بۆ مادەی ١٤٠ ی دەستووری هەمیشەیی. ئەوکات ئەو ڕێکخراوە، لە ڕێگەی نوێنەر و لیژنە و ئالیەتەکانی خۆیەوە، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکە دەدات، بەڵام لە ڕووی یاساییەوە حکومەتی هەرێم

ناتوانیت ئەو کێشەیە ڕەوانەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بکات، چونکە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، وەکو دەوڵەتی سەربەخۆ دانپێدانراو نییە، بەڵکو هەرێمی فیدراڵە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا.

٢. ئەگەر هاتوو کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان بوو بە سەرچاوەی هەڕەشە و تێکدانی سەقامگیریی ناوچەکە و ڕەنگدانەوەی جیهانیی هەبوو، ئەو کات دەوڵەتێك، کە ناکۆکییەکە کاریگەریی لە سەر هەبوو، دەتوانێت داوا لە ئەنجومەنی ئاسایش بکات، کێشەکە چارەسەر بکات. وەك داواکاریی تورکیا لە ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دروستکردنی ناوچەی دژەفڕین لە باکوور و باشووری عێراق لە ساڵی ١٩٩١.

٣. حکومەتی هەرێم دەتوانێت، لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییە سیاسییانەی لەگەڵ دەوڵەتانی جیهاندا هەیەتی، داوا لە یەکێك لەو دەوڵەتانە بکات، کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان بخەنە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان، یان هەر ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی یان هەرێمیی تر.

ئەگەر کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان خرایە بەردەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەو کات یان لیژنەیەکی بێ لایەنی بۆ دروست دەکرێت، بۆ لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی، یان دەخرێتە بەردەم دادگایەکی نێودەوڵەتی.

### ١-٢ ڕاپۆرتەکەی دیمستۆرا:

لە مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٧، تیمی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یارمەتیی عێراق (یونامی) لە ڕێگەی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە (١٧٧٠) ڕاسپێردرا بۆ پێشکەشکردنی (ڕاوێژ و پشتگیری و یارمەتی) بە حکومەتی عێراق و ئەنجومەنی نوێنەران، لە پێناو دانانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە

جێناکۆکەکان، بەڵام ئەم دەستتێوەردانەی نەتەوە یەکگرتووەکان تەنها بۆ ڕونکردنەوە و کۆکردنەوەی ڕای لایەنە ناکۆکەکانی کێشەکە بوو.

ڕاپۆرتەکەی (دیمستۆرا) کە لە دوو بەرگدا نووسراوە و، سەرجەم قەزاکانی ناوچە جێناکۆکەکانی باس کردووە، زیاتر لە ڕوونکردنەوەیەکی بارودۆخی مێژووی و جوگرافی و ئیداریی یەکە کارگێڕییەکان دەچێت، ڕای لایەنە جیاوازەکانی (کورد، تورکمان، عەرەب و مەسیحییەکان)ی لە سەر یەکە یەکەی ناحیە و قەزاکان کۆکردووەتەوە و، هیچ کام لە لایەنەکانی ململانێکە دەرنجامەکانی ئەم ڕاپۆرتەیان بە هەند وەرنەگرت.

## ٢. جوگرافیای ناوچە جێناکۆکەکان:

ناوچە جێناکۆکەکان دابەش دەبێت بۆ دوو ناوچەی جوگرافیی جیاواز، یەکەمیان ناوچە جێناکۆکەکان لە نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراق، دووەمیان ناوچە جێناکۆکەکان لە نێوان پارێزگاکانی تری عێراق.

### ٢-١-١ ناوچە جێناکۆکەکانی هەرێمی کوردستان:

بە پێی مادەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق (٢٠٠٤) کەرکوک تایبەتمەندیی پێ دراوە و بە تەنها ناوی هێنراوە وەك بەشێك لە ناوچە جێناکۆکەکان، ناوی ناوچەکانی دیکە نەهاتووە، بەڵام بە پێی نووسراوەکانی لیژنەی مادەی ١٤٠ ناوچە جێناکۆکەکانی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراق بریتین لە:

١. هەموو پارێزگای کەرکوك بە سنووری کارگێڕیی ئێستایەوە (قەزای ناوەندی کەرکووك، قەزای دوبز، قەزای داقوق، قەزای حەویجە).

٢. قەزای خانەقین، لە پارێزگای دیالە، کە پێك دێت لە ناحیەکانی (ناوەندی خانەقین، مەیدان، قۆرەتوو، جەلەولا و سەعدیە).

٣. قەزای بەلەدروز ـ بەناحیەی مەندەلییەوە، لە پارێزگای دیالە.

٤. قەزای بەدرە لە پارێزگای واست، لەگەڵ ناحیەی جەسان لە هەمان پارێزگا. بەڵام ئەم دوو یەکە کارگێڕییە، لە ڕاپۆرتەکەی دیمستۆرادا، وەکو ناوچەی جێناکۆک لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکراوە.

٥. قەزای دوزخورماتوو، کە پێکدێت لە ناحیەکانی (ناوەندی دوز، سلێمان بەگ، ئامرلی، قادرکەرەم و نەوجول) کە لە ساڵی ١٩٧٦ لە پارێزگای کەرکووکەوە خراوەتە سەر پارێزگای سەلاحەدین.

٦. قەزای مەخمور لە پارێزگای هەولێر، پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەندی مەخمور، گوێر، دیبەگە و قەراج) کە لە ساڵی ١٩٩١ خراوەتە سەر پارێزگای نەینەوا.

٧. قەزای شەنگار: کە پێکدێت لە ناحیەکانی (ناوەندی شەنگار، شمال ـ سنونێ ـ، قەیرەوان).

٨. قەزای تەلەعفەر: کە پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەندی تەلەعفەر، زومار، ڕەبیعە و عیازیە).

٩. قەزای تەلکێف: کە پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەندی تەلکێف، ئەلقۆش، وانە، فایدە).

١٠. قەزای شیخان: کە پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەندی شێخان، مزوری، مریبا و زیلکان).

١١. قەزای حەمدانیە: پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەندی حەمدانیە، نەمرود و بەرتلە).

١٢. ناحیەی قەحتانیە، لە ساڵی ١٩٧٧ لە قەزای شەنگارەوە خراوەتە سەر قەزای بەعاج.

**٢-١-٢ ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی حکومـەتی هەرێمـدان و بـە ناوچـەی جێناکۆك ناویان هاتووە:**

چەند یەکەیەکی کارگێڕی لە ساڵی (١٩٩١) ەوە، لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هـەرێم دان و، بـە پێـی مـادەی (٥٣)ی یاسـای ئیـدارەی دەوڵـەت بـۆ قۆنـاغی گواستنەوە (٢٠٠٤) دانی پێدا نراوە، کە بەشێکە لە هەرێمی کوردستان، هەر ئـەم مادەیەیش گواستراوەتەوە بۆ مادەی (١٤٣) لە دەستووری هەمیشەییی (٢٠٠٥)، بەڵام هەنـدێ لـەم یەکـە کارگێڕییانـە، بـە پێـی نووسـراوە فـەرمییـەکانی لیژنـەی مادەی (١٤٠)ی تایبەت بە ناوچە جێناکۆکەکان، دەکەونە ناوچەی جێناکۆکـەوە، ئەوانیش:

١. قـەزای کفـری لـە پارێزگـای دیالـە، کـە پـێش سـاڵی (١٩٧٦) سـەر بـە پارێزگـای کـەرکووك بـووە و ئێـستا داوا دەکرێـت بخرێتـەوە سـەر پارێزگـای کەرکووك، پێش ئەنجامدانی ڕاپرسی.

٢. قەزاکانی کەلار و چەمچەماڵ لە پارێزگای سلێمانی، کە تا ساڵی (١٩٧٦) سـەر بـە پارێزگـای کـەرکووك بـوون، داوا دەکرێـت بخرێنـەوە سـەر پارێزگـای کەرکووك، پێش ئەنجامدانی ڕاپرسی لە سەر چارەنووسی پارێزگای کەرکووك.

٣. قەزای ئاکرێ، کە لە ساڵی (١٩٩١)ەوە سەر بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانە، بەڵام پێشتر سەر بە پارێزگای نەینەوا بووە.

٤. هەروەها بە درێژاییی هێڵی سنووری نێوان هەرێم و ناوەند، لـە سـنووری چەند قەزایەکدا تێکەڵییەك دروستبووە، بەوەی بەشێك لە ڕووبەری ئـەو قەزایانـە لە ژێـر دەسـەڵاتی حکومـەتی هـەرێمن و بەشـەکەی دیکـەیان لـە ژێـر دەسـەڵاتی حکومەتی ناوەنددان، نموونەی:

✓ قـەزای خانـەقین، کـە هـەر دوو ناحیـەی (مەیدان و قۆرەتـوو) سـەر بـە دەسـەڵاتی هـەرێمن و، بەشێکیـشی (ناوەنـدی قـەزای خانـەقین و، ناحیـەکانی سەعدیە و جەلەولا) سەر بە دەسەڵاتی ناوەندن.

✓ قەزای کفری، کە هەر دوو ناحیەی (ناوەندی کفری و سەرقەڵا) سـەر بـە دەسەڵاتی هەرێمن و، ناحیەکانی (کۆکس، قەرەتەپە و جەبارە) لە ژێر دەسەڵاتی ناوەندن.

بەڵام لە هەندێك شوێنی دیکەدا ڕووبەری ناحیەکان دابەش بوون بە سەر هەر دوو دەسـەڵاتەکەدا، وەك ناحیـەی شـوان، کـە بەشـێك لـە گونـدەکانی لـە سـاڵی (١٩٩١)ەوە لە ژێر دەسـەڵاتی هـەرێم دان و، بەشـەکەی تـری لـە ژێـر دەسـەڵاتی ناوەند دان.

کەواتە ئەگەر ڕووبەری ئەو قـەزا و ناحیانـەی ناوچـەی جێنـاکۆکن لـە نێـوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەند، کۆ بکەینـەوە، نزیکـەی (٥١) هـەزار کـم٢ دەبێت، کە زیاتر لـە ٦٣٪ ی کـۆی ڕووبـەری هـەرێمی کوردسـتان پێکـدەهێنێت. بەڵام ئەگەر ڕووبەری ئەو ناوچانەی لێ دەربیهێـنین، کـە لـە ئێـستادا بەشـێکن لـە ناوچەکانی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، ئەوا نزیکەی (٤١) هەزار کم٢ بە تەواوی ناوچەی دابڕاون لـە هـەرێمی کوردسـتان، کـە دەکاتـە نزیکـەی ٥١٪ ی ڕووبـەری هەرێمی کوردستان، ئەگەر کۆی ڕووبەری هەرێم بە (٨٠) هەزار کم٢ بخەمڵێنین[١].

---

1) لە بارەی ڕووبەری هەرێمی کوردستانەوە ڕای جیاواز هەیە، هەندێك بە نزیکەی ٧٥ هـەزار کـم٢ و هەنـدێکی تر دەیگەیەننە نزیکەی ٨٥ کم٢، لێرەدا ناوەندی ئەو ژمارەیە وەرگیراوە کە ٨٠ هەزار کم٢.

# نەخشەی (١) ناوچە دابڕاوەکان بەپێی سنووری پارێزگاکان




سەرچاوە: ئەحمەد ڕەفیق کەریم، ناوچە دابڕاوەکانی هەرێمی کوردستان، نامەیەکی ماستەرە پێشکەشی بەشی

**٢-٢ ناوچە جێناکۆکەکان لە نێوان پارێزگاکانی تری عێراق:**

لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعسدا چەند گۆڕانکارییەك لە یەکە کارگێڕییـەکانی ناوەڕاستی عێراقـدا ئـەنجام دراوە. شـیعەکان ئـەم گۆڕانکارییانـە بـە بەشـێك لـە سیاسەتی حکومەتی ئەوکاتی عێراق دژ بە دانیشتوانی عەرەبی شـیعە لـە قەڵـەم دەدەن، ئێـستا لـــە چوارچـــێوەی جێبـــەجێکردنی مـــادەی (١٤٠) دا، داوای چاککردنەوەی ئەو دەستکارییە کارگێڕییانە دەکەن، کە بریتین لە:

**١-٢-٢ لە پارێزگای بەغدا:**

قەزای بەلەد بە ناحیەکانی (دوجێل، زلوعیە و ناوەندی بەلەد)، کە لە ساڵی (١٩٧٦) خراونەتە سەر سەلاحەدینی تازە پێکهێنـراو (دروسـتکراو)، داوا دەکـەن بگەڕێنەوە سەر پارێزگای بەغدا.

هـەروەها لـە سـاڵی (١٩٩١) دوو موقاتەعـەی (موقاتەعـە بریتییـە لـە چـەند گوندێك) سەر بە قـەزای ئـەبوغرێب لـە پارێزگـای بەغـدا، خراونەتـە سـەر قـەزای فەلوجەی سەر بە پارێزگـای ئـەنبار. داوا دەکـەن بگەڕێنـەوە سـەر قـەزای ئـەبوو غرێب.

**٢-٢-٢ لە پارێزگای کەربەلا:**

هەر دوو ناحیەی ئەلرحالیە و نخێب، لە سـاڵی ١٩٧٨ و١٩٧٩، لـە پارێزگـای کەربەلاوە خراونەتە سەر پارێزگـای ئـەنبار، داوا دەکـەن بگەڕێنرێنـەوە بـۆ سـەر پارێزگای کەربەلا.

بیانووی هەڵوەشاندنەوەی ئـەم دەسـتکارییە کارگێڕییانـە ئەوەیـە، کـە ئـەم ناوچانە زۆرینەی دانیشتوانەکەی شیعەن، بـەڵام خراونەتـە سـەر پارێزگایـەك کـە زۆرینەی دانیشتوانەکەی سوننەن.

جیاوازیی کێشەی ئەم ناوچانە لەگەڵ ناوچەکانی هەرێمی کوردستان ئەوەیە، کە بە دەرکردنی فەرمانی چاککردنی بارودۆخی کارگێڕی، یەکسەر کێشەکەیان چارەسەر دەبێت و پێویست بە ڕاپرسی ناکات، چونکە لە چوارچێوەی سنووری حکومەتی عێراق دان، نەك نێوان حکومەتی هەرێمێکی فیدڕاڵ و حکومەتی ناوەند.

### ٣. کێشە هونەرییەکانی جێبەجێکردنی مادەکەی ١٤٠:

چەند گرفتێکی هونەری دەێتە ڕێی جێبەجێکردنی مادەی (٥٨)ی یاسای کاتیی ئیدارەی دەوڵەت و مادەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی، چەند لە کاتی جێبەجێکردندا:

١. تایبەت بە پارێزگای کەرکوك، ئاماژە بەوە نەکراوە کە پرسیاری ڕاپرسییەکە چۆن دەبێت، ئایا تەنها دەنووسرێت: دەتەوێت پارێزگای کەرکوك بچێتە سەر هەرێمی کوردستان، یان لە سەر حکومەتی ناوەند بمێنێتەوە، یان ئەو پرسیارەی بۆ زیاد دەرێت کە ببێت بە هەرێمێکی فیدڕاڵ.

٢. سەبارەت بە هەموو ناوچەکان، ئاماژە بەوە نەکراوە، لە سەر چ ئاستێکی کارگێڕی ڕاپرسی ئەنجام دەدرێت (گوند، یان کەرت ـ موقاتەعە (کە بریتییە لە چەند گوندێك)، یان ناحیە، یان قەزا. بێگومان پیادەکردنی هەر ئاستێك دەرەنجامی جیاوازی دەبێت لە پرۆسەی ڕاپرسیدا.

٣. هەندێك قەزا بەشێك لە ناحیەکانی دەکەوێتە سنووری ئیداریی هەرێمی کوردستانەوە، واتە پێش ٢٠٠٣/٣/١٩ لە ژێر دەسەڵاتی هەرێمدا بووە، بەڵام بەشەکەی تری لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندە و دەکەوێتە ناوچە جێناکۆکەکانەوە، تا ئێستا ئەوە یەکلایی نەبوەتەوە، ئایا سنووری ئەو یەکە کارگێڕییانە یەك دەخرێنەوە، ئەمجار ڕاپرسی دەکرێت، یان دەستکاریی ئەو

سنووره ناكرێت؟ بۆ نموونه دوو ناحیەی قەزای خانەقین لە ساڵی (١٩٩١) ەوە لە ژێر دەسـەڵاتی حكومـەتی هـەرێم دان، ئایا ئـەو دوو ناحیەیـە دەخرێتـەوە سـەر قـەزای خانـەقین و ئـەمجار ڕاپرسـی دەكرێـت، یـان بـە بـێ ئـەو دوو ناحیەیـە ڕاپرسییەكە دەكرێت. ئەگەر هەر دوو ناحیەی قۆرەتوو و مەیدان بخرێتەوە سەر قەزای خانەقین، ئەنجامی ڕاپرسـییەكە لـە بەرژەوەنـدیی كـورد دەبێـت لـە سـەر ئاستی قەزا.

هەروەها چەند قەزایەكی تر ئەم حاڵەتەی خانەقینیان هەیە و سـنوورەكەیان دابەش بووە لە نێوان ئیدارەی هەرێم و بەغدا.

هەموو ئەو گرفتە هونەرییانەی باس كرا، دەرهاوێشتەی سیاسیی كاریگـەری لـێ دەكەوێتـەوە بـۆ یەكلاییكردنـەوەی چارەنووسـی ناوچـە دابڕاوەكـان و، لـە كێشەی هونەرییەوە دەیگۆڕێت بۆ كێشەی سیاسیی ئاڵۆز و هەستیار.

## ٤. مامەڵـەی سـەركردایەتیی هـەرێمی كوردسـتان لەگـەڵ ناوچـە جێناكۆكەكان:

سەركردایەتیی سیاسیی هەرێمی كوردستان، بەو پێیەی دەسـەڵاتی هـەرێمی كوردسـتانیان بـە دەسـتەوەیە و، بەشـداریی كارایان لـە جومگـەكانی دەوڵـەت و پرۆسـەی سیاسـی لـە عێـراق، بەرپرسـیارێتیی جێبـەجێكردنی مـادەی (١٤٠) دەكەوێتە ئەستۆیان، چونكە ئەم كێشەیە، كێشەی كورد و هەرێمی كوردستانە و، حكومەتی عێراق، یان ڕاسـتتر بڵـێین بەشـی عـەرەبی لـە حكومـەتی عێـراق، بـە كێشەی نازانێت و كار بۆ چارەسەركردنی ناكات.

سەركردایەتیی هەرێمی كوردستان لە چەند ڕوویەكەوە، بەرامبـەر بـە ناوچـە دابڕاوەكان، بەرپرسیارێتیی نەتەوەیی و ئەخلاقیی دەكەوێتە ئەستۆیان:

**٤-١ له ڕووی سیاسییەوە:**

له پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام لـه نیسانی (٢٠٠٣)، کورد وەکو نەتـەوە و هـەرێمی کوردسـتان وەکـو ناوچـەیەکی ئـارام سـەنگێکی سیاسـی و دیبلۆمـاتیی گەورەی هەبوو، له هاوکێشەکانی سەر لـه نـوێ دروسـتکردنەوە و بونیاتنانـەوەی پایەکانی حـوکم لـه عێـراق، بـەڵام سـەرکردایەتیی سیاسـیی هـەرێمی کوردسـتان (یەکێتی و پارتی) نەیانتوانیوە لاوازیی لایەنـەکانی دیکـەی عێـراق بقۆزنـەوە، بـۆ هێنانەوەی (گەڕاندنەوەی) ناوچە دابڕاوەکانی هەرێمی کوردستان، چونکە یەکێتی و پارتی هێندەی له خەمی به دەست هێنانی پله و پۆستەکانی حکومـەتی بەغـدا بوون، هێنده له خەمی گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەدا نەبوون.

یەکەم مامەڵەی خراپی دەسەڵاتدارانی هەرێم، له سـاڵی (٢٠٠٤) بـوو، کاتێـك کـە یاسـای ئیـدارەی دەوڵـەتی عێـراق دەرچـوو، لـە مـادەی (٥٨)ی یاسـاکەدا، چارەنووسـی ناوچـە دابڕاوەکـان بەسـترایەوە بـە چـەند ڕێوشـوێنێکی یاسـایی و ڕاپرسـییەوە و، لـە خـاکی نیـشتیمانی کـوردەوە، ڕازیبـوون ببێـت بـە خـاکی جێناکۆك.

له لایەن حکومەتی ئەو کاتی عێراقـەوە، هـیچ هـەنگاوێك بـۆ جێبـەجێکردنی مادەی (٥٨) نەنرا. له سـەردەمی حکومەتەکـەی ئیـبراهیم جەعفەریـدا ( ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦)، که کورد ئەو کات له کۆمەڵەی نیـشتیمانیی ئینتیقـالی عێراقـدا (الجمعیـة الوطنیة الانتقالیة) (٧٥) ئەندامی هەبوو له کۆی (٢٧٥) ئەندام و، چەندین پۆستی دیکەی باڵای هەبوو، وەکو سەرۆك کۆمار و جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتیمانی و، چەند وەزارەتێکی گـرینگ، نـەیتوانی ئەم مادەیە بباتە بواری جێبەجێکردنەوە.

لـــە ســـەردەمی حکومـــەتی یەکـــەمی نـــوری مالیکیـــدا (٢٠٠٦– ٢٠١٠) دەسەڵاتدارانی هەرێم بە هەمان شێوە دەسـەڵاتی زۆریـان هـەبوو لـە حکومەتـدا،

سەرەڕای ئەوەی چارەسەری ناوچە جێناکۆکەکان لە بەرنامەی کاری حکومەتدا زەمەن بەندی کرابوو، هەروەها ئەوە چەسپێنرابوو، کە ئەگەر کورد لە حکومەتی نوری مالیکی کشایەوە، ئەوا حکومەت بە دەستلەکارکێشاوە ئەژمار دەکرێت، بەڵام مادەی (١٤٠) ی دەستووری عێراق (کە درێژکراوەی مادەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەدانی دەوڵەتە بۆ قۆناغی گواستنەوە) لە کاتی ئاسایی خۆی لە (٢٠٠٧/١٢/٣١)، کە دەبوو لەو ماوەیەدا هەر سێ قۆناغەکەی جێبەجێ بکرێت، نەتوانرا تەنانەت قۆناغی یەکەمیشی جێبەجێ بکرێت. تەنانەت پاش کشانەوەی سەدرییەکان و لیستی عێراقییە و بەرەی تەوافوق لە حکومەتەکەی مالیکی لە مانگی ئابی ٢٠٠٧، بەڵام پارتی و یەکێتی، لە کاتێکدا مادەی (١٤٠) جێبەجێ نەکرابوو، هاوپەیمانیی چوارینەیان لەگەڵ حیزبی دەعوە و ئەنجومەنی باڵا ئیمزا کرد و، حکومەتەکەی مالیکیان لە هەڵوەشاندنەوە ڕزگار کرد.

سەرەنجام لەگەڵ بەهێزبوونی عەرەبی سوننە، لە ناوچە جێناکۆکەکان و، بەهێز بوونی حکومەتی عێراق، بە تایبەت پاش ئەوەی کە حکومەتەکەی مالیکی توانی، لە ساڵی ٢٠٠٧، تا ڕادەیەك کۆنترۆڵی توندوتیژیی تایەفیی نێوان شیعە و سوننە بکات و، بارودۆخی ئەمنی تا ڕادەیەکی باش بەرەو پێشەوە بەرێت، پرسی یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی ناوچە جێناکۆکەکان هێندەی تر ئەستەم بوو.

دەسەڵاتدارانی هەرێم، لە مامەڵەی خراپی مالیکی لەگەڵ دۆسیەی ناوچە دابڕاوەکان، لە خولی یەکەمی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانیدا، پەندیان وەرنەگرت، بە هەمان شێوە بۆ جارێکی تر، پاش هەڵبژاردنی خولی دووەمی پەرلەمانی عێراق، لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٠، پشتگیریی نوری مالیکیان کرد و، لەگەڵیدا ڕێکەوتن لە چواچێوەی ئەو ڕێکەوتنەی ناونرا (ڕێکەوتننامەی هەولێر) و، بە دەسپێشخەری خودی مەسعود بارزانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان،

ڕێکەوتنەکە لە دایك بوو، بۆ ئەوەی سەر لە نوێ مالیکی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بگرێتە دەست.

لەم خولەی سەرۆکایەتیی مالیکیدا، کە نزیك دەبێتەوە لە دوو ساڵ، نەك هەر هیچ هەنگاوێکی جیدی نەنراوە بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠، بەڵکو حکومەتی عێراق، هێزی سەربازیی زیاتری ڕەوانەی ناوچەکە کردووە و، فشارێکی زۆری خستووەتە سەر هێزی پێشمەرگە و پۆلیس و ئیدارەی کورد، بە تایبەت لە ناوچەکانی کەرکووك و خانەقین و دوزخورماتوو.

## ئەمریکاییەکان کێشەکە وەکو خۆی بەجێ دەهێڵن:

لە کۆتاییی ساڵی (٢٠١١)، بە پێی ڕێکەوتننامەی سۆفا لە نێوان عێراق و ئەمریکا، دوایین سەربازی ئەمریکا عێراقی بەجێ هێشت و، دەسەڵاتی سەربازی و ئەمنی بە تەواوی ڕادەستی حکومەتی عێراق کرا. تاوەکو سوپای ئەمریکا لە عێراقدا بوونی هەبوو، چەترێکی باش بوو بە نەهێشتنی هەر پێکدادانێك لە نێوان هێزە ناکۆکەکانی عێراق، بە تایبەت لە ناوچە جێناکۆکەکان، بەڵام بە کۆتایی هاتنی ئەرکی سەربازیی ئەمریکا، چارەسەری کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان بۆ کورد زۆر ئاڵۆزتر و زەحمەتتر دەبێت، چونکە بە بەهێزبوونی دەسەڵاتی ناوەند، پێگەی سیاسیی هەرێمی کوردستان لاواز دەبێت.

لە کاتی گفتوگۆکردن لە سەر ئەم ڕێکەوتننامەیەیش، سەرەڕای ئەوەی سەرۆکی دامەزراوەی دیپلۆماسیی عێراق (وەزیری دەرەوە) کوردە (هۆشیار زێباری) و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانە، نەتوانرا هیچ زەمانەتێك لە ڕێکەوتنەکە بەدی بهێنرێت، هەروەها نەتوانرا پشتگیریی ئەمریکا بۆ یەکلاییکردنەوەی پرسی ناوچە جێناکۆکەکان، لە چوارچێوەی ئەو ڕێکەوتنە بە دەست بهێنرێت.

## ناوچە جێناکۆکەکان لە ململانێی بارزانی ـ مالیکیدا:

لە بەهاری ساڵی ٢٠١١، سەرۆکی هەرێمی کوردستان هێرشێکی توندی کردە سەر حکومەتەکەی مالیکی، کە هاوپەیمانیی کوردستان یەکێکە لە هاوبەشە سەرەکییەکانی ئەو حکومەتە و، چەندین پۆستی باڵای لەو حکومەتەدا هەیە. سەرۆکی هەرێم خودی مالیکی بەوە تۆمەتبار کرد کە لە شەراکەتی نیشتیمانی لای داوە و تاکڕەوی دەکات لە بڕیاردان و بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانیدا و، داوای سەندنەوەی متمانەی لە مالیکی کرد.

بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك، کێشمەکێشێکی سیاسیی توند، لە گۆڕەپانی سیاسیی عێراقدا هاتە کایەوە، بەشی زۆری فراکسیۆن و کوتلەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، دابەش بوون بە سەر دوو بەرەدا، بەرەی عێراقییە (عەلاوی) و هاوپەیمانیی کوردستان (بە تایبەت پارتی) و کوتلەی سەدرییەکان "لە سەرەتادا"، دروست بوو بۆ سەندنەوەی متمانە لە مالیکی. لە بەرامبەردا، لیستی دەوڵەتی یاسای نوری مالیکی و، بەشێك لە هاوپەیمانیی نیشتیمانی (ئەنجومەنی باڵا و حیزبی فەزیلە) پشتگیریی مانەوەی مالیکییان کرد. سەرەنجام بەرەی سەندنەوەی متمانە لە مالیکی شکستی هێنا.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، موقتەدا سەدری سەرۆکی ڕەوتی سەدر، لە یاداشتەکانی دا بە ئاشکرا ئاماژەی بەوەدا کە کوردەکان بۆ پرۆسەی سەندنەوەی متمانە لە مالیکی، بە هیچ شێوەیەك باسی پرسی یەکلاییکردنەوەی ناوچە جێناکۆکەکانیان نەکردووە، تەنانەت سەدر لە بارەگای سەرۆکایەتیی هەرێم بۆ ڕۆژنامەنووسان دەڵێت: ((لەگەڵیان ڕێکەوتین کە کەرکووك هەر بە شارێکی عێراقی بمێنێتەوە)).

لە گەرمەی ئەم ململانێیەدا، مالیکی سوپای بۆ بەشێکی فراوانی ناوچە جێناکۆکەکان بەهێز کرد و، لە ٢٠١٢/٥/٨ سەردانی کەرکووکی کرد و، لەوێوە ڕای

گەیاند، کە کەرکووك شارێکی عێراقییە. پاشان لە مانگی پێنجی ساڵی ٢٠١٢ بڕیاری پێکهێنانی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلەی دا و، لە مانگی تەمووزدا، بڕیاری پێکهێنانی ئەو فەرماندەییە چووە بواری جێبەجێکردنەوە. بە پێی بڕیاری ژمارە (٣٧٢) لە ٣١ی تەمووزی ٢٠١٢، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق، ئەم فەرماندەییە سەرپەرشتیی پرۆسە سەربازی و ئەمنییەکانی هەر دوو پارێزگای دیالە و کەرکووك دەکات و، بە پێی بڕیارەکە سەرجەم هێزەکانی وەزارەتی ناوخۆ، دەکەونە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەم هێزەوە. واتە مالیکی دەیەوێت لەبری چارەسەری یاسایی و دەستووری، لە ڕێگەی سوپای عێراقەوە، بە تەواوی بوونی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانی لە ناوچە دابڕاوەکان تەحجیم بکات و، دەسەڵاتی تەواوی خۆی بە سەر ئەو ناوچانەدا بسەپێنێت.

مایەی سەرنج و تێڕامانە، لە گەرمەی پێکهێنانی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە، کە گەورەترین مەترسییە بۆ دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان و دەسەڵاتی کورد لە کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکە، هەر دوو حکومەتی هەرێم و بەغدا، ڕێکەوتن لە سەر پێدانی پارەی کۆمپانیاکانی بواری دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت لە کوردستان، بە بڕی (٢) دوو ملیار دۆلار، لە کاتێکدا ئەم کێشەیە تەنها یەکێك بوو لە خاڵەکانی ململانێی نێوان هەولێر و بەغدا، نەك کۆی کێشەکە، بەڵام لە بەرامبەردا هەولێر و، بە تایبەت خودی سەرۆکی هەرێم، هەڵوێستێکی جیدی و نەتەوەیی، لە ئاستی پێویستدا نەنواند، بۆ ڕێگە گرتن لە پێکهێنانی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە.

ئایا کێشەکە لەوە دایە، کە ناوچەکانی دەسەڵاتی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە دەکەونە بازنەی دەسەڵاتی یەکێتیەوە و، پارتی خۆی بە بەرپرسیار نازانێت و، کێشەکە تووشی یەکێتی و تاڵەبانی دەکات؟!

یـان کێـشە گەورەکـەی پـارتی لەگـەڵ ناوەنـد، کـە کێـشەی گرێبەسـتە نەوتییەکانــە چارەســەری کــردووە و، لــە پێنــاو بەردەوامیــدان بــە ڕێکــەوتنی گرێبەستە نەوتییەکان، بێدەنگی لە فراوانبوونی دەسەڵاتی مالیکی لە کەرکووك و خانەقین، دەکات؟!

هــەر کامێکیـان بێـت، بێـدەنگیکردنی دەسـەڵاتی هــەرێمی کوردسـتان، لـە پێکهێنانی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە، هێنـدەی تـر یەکلاییکردنـەوەی چارەنووسـی کــەرکووك و ناوچــە دابڕاوەکــان ئــاڵۆزتر و قورســتر دەکــات، لــە چارەسەری یاسایی و دەستوورییەوە ململانێکەی گۆڕی بۆ چارەسەری سەربازی و ئەمنی، کە زۆر ئەستەمە کورد لە بالانسی هێـزی سـەربازیدا بـراوەی ململانێکـە بێت.

ئەو ڕاستییەیش دەسەلمێنی کـە دەسـەڵاتدارانی کـورد هەڵوێـستی جیـدی و نەتەوەییان نییە و، هیچ بەرژەوەندییەکی خۆیان ناکەن بە قوربانی خاکی ناوچە دابڕاوەکان. بەڵگەیش بـۆ ئەمـە لـە مـانگی تـشرینی یەکەمـدا، لـە هەرێمـەوە دوو وەفدی تایبەت سەردانی بەغدای کرد، یەکێکیان بەناوی حکومەتی هەرێمەوە، کە عیماد ئەحمەد سەرۆکایەتیی دەکرد، ئەوی تریـان نوێنـەری پارتـە سیاسـییەکان بوو بێجگە لە گۆڕان و کۆمەڵی ئیسلامی، بە سەرۆکایەتیی بەرهەم سـاڵح و، هـیچ کام لەم وەفدانە کێشەی ناوچە دابڕاوەکانی لە سـەر مێـزی گفتوگـۆ و دانوسـتان باس نـەکردووە، بـەڵام وەفدەکـەی وەزارەتـی نـەوتی هـەرێم، کـە پێکهـاتبوو لـە ئاشـتی هـەورامی و ڕۆژ نـوری شـاوەیس، لـە کۆتـاییی مـانگی ئـەیلولی (٢٠١٢)دا گەیـشتنە ڕێکـەوتن، لەگـەڵ حکومـەتی عێـراق، لــە سـەر پـارەی گرێبەسـتە نەوتییەکانی کۆمپانیاکانی هەرێمی کوردستان.

## ٤-٢ مامەڵەی حیزبی لەگەڵ ناوچە دابڕاوەکان:

پارتە دەسەلآتدارەکانی هەرێمی کوردستان، هەمان کێشەکانی خۆیان لە هەرێمی کوردستان گواستەوە بۆ ناوچە دابڕاوەکان، یەکێتی و پارتی بە جیا، لە سەر بنەمای بەرژەوەندیی بەرتەسکی حیزبی، مامەڵەیان لەگەڵ ناوچە دابڕاوەکان کردووە، نەك لە سەر بنەمای بەرنامە و پلانێکی نەتەوەیی، هەر پارتە و بەجیا پێشمەرگەی خۆی لە ناوچە دابڕاوەکان جێگر کرد، هەر یەکەیان ئاساییشی تایبەت بەخۆی بردە ئەو ناوچانە، تەنانەت هەر حیزبە و پەروەردەیەکی کوردی بردە کەرکووك و خوێندنی کوردی و ئیدارەی قوتابخانەکانیان دابەش کرد، خەڵکی کوردی ئەو ناوچانەیان لە سەر ئەساسی وەلائی حیزبی بە سەر خۆیاندا دابەش کرد، بۆیە هەمیشە خەمی نەتەوەیی تەنها دروشم بووە لە بەرنامە و کاری ئەو حیزبانەدا و، ئامانجی گەورەیان حیزب و بەرژەوەندیی حیزبی بووە.

لە هەڵوێستێکی سەیردا، لە گەرمەی خۆپیشاندانەکانی ١٧ ی شوبات و ڕۆژانی دواتر، دەسەلآتی هەرێم، کارتی ناوچە دابڕاوەکانی بۆ خولقاندنی قەیرانی دەرەکی بەکار هێنا و، لەو ڕۆژانەدا بێ بوونی هیچ کێشەیەك لەگەڵ ناوەند، هێزی پێشمەرگەی جولآند بۆ کەرکووك و خانەقین، بۆ ئەوەی بە شەقامی کوردستان و ڕای گشتی بگەیەنێت، کە ئێمەی کورد کێشەی نەتەوەییمان هەیە، نەك کێشەی گەندەڵی، بەلآم پاش نزیکەی ساڵ و نیوێك لەو ڕووداوە، کاتێك کە حکومەتەکەی مالیکی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە پێکدەهێنێت و هێز و تۆپ و تانك ڕەوانەی کەرکووك دەکات، دەسەلآتدارانی هەرێم هەڵوێستی توند و پێویست نانوێنن و، بەهێزی پێشمەرگە ڕێگری ناکەن لە هاتنی هێزەکانی عێراق.

### ٤-٣ لە ڕووی خزمەتگوزاریی و ئاوەدانییەوە:

دابینکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکانی وەکو ئاوی پاکی خواردنەوە، تەندروستی، پەروەردە، پاکڕاگرتنی شارەکان، دابینکردنی هەلی کار، باشترین هەل بوو بۆ دەسەڵاتدارانی هەرێم، بۆ ئەوەی وێنەیەکی باشی حوکمڕانی لە لای دانیشتوانی ئەو ناوچانە دروست بکەن، بە کورد و هەموو نەتەوە و ئایینەکانی ترەوە، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو بودجەیەی لە بەردەستی حکومەتی هەرێم دایە، دانیشتوانی کوردی ناوچە دابڕاوەکان لەبەر کێشەی نەبوون، یان کەمیی خزمەتگوزاری، ناوچەکانی خۆیان بەجێ دەهێڵن و، ڕوو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هەرێم دەکەن.

هەر بۆ نموونە لە (٢٠٠٨)ەوە (١٢٠٠) خێزانی کورد ناحیەی جەلەولایان چۆڵ کردووە، بۆیە تا دێت ڕێژەی دانیشتوانی کورد لەو ناوچانە ڕوو لە کەمی دەکات. ئەم حاڵەتە بۆ خۆی مەترسییەکی گەورەیە بۆ یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی ناوچە دابڕاوەکان، چونکە بە کەمکردنی ڕێژەی کورد، ترسی ئەوە هەیە لە کاتی ئەنجامدانی هەر ڕاپرسییەکدا، لە بەرژەوەندیی کوردستان کۆتایی نەیەت.

بەشی سەرەکیی خاکی ناوچە دابڕاوەن ناوچەی کشتوکاڵین، لە قۆناغەکانی سەردەمی بەعسدا، کورد لە دێهاتەکانی خۆیاندا دەرکرا بوون، بەڵام لە پاش ساڵی (٢٠٠٣ )ەوە، حکومەتی هەرێم بەرنامەیەکی ئابووریی نەبوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو دێهاتانە و، گەڕانەوەی جووتیاران بۆ سەر خاکی خۆیان، بەرنامەیەك بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان و، پشتگیریکردنی بەرهەمی جووتیاران و، پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان بە دانیشتوانی گوندەکان. نەبوونی بەرنامە و پلانی حکومەتی هەرێم، بۆ ئەم ناوچانە، بووە هۆی ئەوەی زۆربەی دێهاتەکانی ناوچە دابڕاوەکان، یان چۆڵبن، یان لە کۆی (١٠٠) خێزان، کە پێشتر لە گوندێکدا نیشتەجێبوون، ئێستا کەمتر لە (١٠) خێزان لە زۆربەی گوندەکاندا، بوونیان هەیە، بۆیە لە ئێستادا، دێهاتی ناوچە دابڕاوەکان، کەمترین ڕێژەی کوردی تێدا دەژی بەراورد بە سەردەمی پێش

ڕاگواستنی گوندنشینەکان. لە بەراشبەردا گوندە عەرەبنشینەکان تا دێت گەورەتر و قەرەباڵغ تر دەبن.

### ٤-٤ لە ڕووی قەرەبووەوە:

نوێنەرانی کورد لە دەسەڵاتی ناوەند، نەیانتوانی، یان ڕاستتر بڵێین هەوڵیان نەدا، بە پێی یاسا و بە پشتبەستن بە دەقی مادی (١٤٠) قەرەبوویەکی تایبەت بۆ ئاوەدانکردنەوە و خزمەتکردنی ناوچە دابڕاوەکان، لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، دابین بکەن، بەڵکو ئەم ناوچانەیش هەر وەکو ناوچەکانی دیکەی عێراق ئەژماری بۆ کرا، لە کاتێکدا بەشی زۆری ئەم ناوچانە لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعسدا دووچاری ئەنفال و ڕاگواستن و لەناوبردنی بە کۆمەڵ بوونەتەوە.

لە بارەی ئەو قەرەبووەیش کە بۆ ئەو خێزانانە تەرخان کرا، کە لە ڕێگەی لیژنەکانی مادەی (١٤٠)ەوە وەری دەگرن، لەبری گەڕانەوەیان بۆ ناوچەکانی پێشووی خۆیان، تەنها (١٠) ملیۆن دینار بۆ خێزانە کوردەکان تەرخان کراوە، لە کاتێکدا دوو هێندە (٢٠ ملیۆن دینار) بۆ هەر خێزانێکی عەرەب تەرخان کرا. ئەمە لە کاتێکدایە کە خێزانە کوردەکان زەرەرمەندتر بوون و، ماڵ و حاڵی خۆیان بە زۆرەملێ لە سەردەمی بەعسدا پێ چۆڵ کراوە و، بەشی زۆری خێزانە عەرەبەکان بە ئارەزووی خۆیان هاتوون و، پاداشتی مادییان وەرگرتووە لە سەردەمی سەدامدا و، پیشە و کاری باشیشیان پێ دراوە لە دامودەزگانی حکومەتدا.

## ٥. ئێستا چۆن مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکرێت؟

لە ئاسۆی جێبەجێکرنی مادەی (١٤٠)دا، تاوەکو ئێستا قۆناغی یەکەمی مادەکە، کە قۆناغی ئاساییکردنەوەیە، جێبەجێ نەکراوە، بۆ ئەوەی بچێتە قۆناغی سەرژمێری و ئامارەوە، پاشان ڕاپرسی لە سەر چارەنووسی ئەو ناوچانە ئەنجام بدرێت.

له بەرامبەردا، کێشەی ئەمنی و سەربازی له ناوچه جێناکۆکەکان، لەوپەڕی خراپی دایه، حکومەتی عێراق و فەرماندەی گشتیی هێزه چەکدارەکانی عێراق (فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجله) یان، له هەر سێ پارێزگای دیاله و کەرکووك و سەلاحەدین، پێکهێناوه و ئەم فەرماندەییه، دەسەڵاتی ئەمنی و سەربازیی تەواوی پێ دراوه و هەموو هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ دەکەونه ژێر دەسەڵاتی ئەم فەرماندەییەوه.

له ڕووی دەستووری و یاساییەوه، لەبەر سێ هۆکار ئەم فەرماندییه نا دەستوورییه:

١. به پێی مادەی نۆ/ خاڵی یەکەم/أ له دەستووری عێراق، نابێت سوپا وەکو ئامرازێك بەکار بهێنرێت بۆ سەرکوتکردنی گەلی عێراق، هەروەها نابێت سوپا دەست وەر بداته کاروباری سیاسیی. هەر به پێی دەستووریش کێشەی ناوچه جێناکۆکەکان کێشەیەکی سیاسییه.

٢. لەبەرئەوەی ناوچه جێناکۆکەکان به پێی مادەی (١٤٠) جێناکۆکن له نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی ناوەنددا، پێویسته ئیدارەی هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت لەو ناوچانەدا، به هاوبەشی هەر دوو لا بێت، نەك بڕیار و چالاکییه سەربازییەکان تەنها به دەستی لایەنێکی ململانێکه بێت و، لایەنەکەی تر دوور بخرێتەوه، یان دژی بەرژەوەندیی لایەنەکەی تر کار بکرێت.

٣. هەر به پێی دەستوور، بڕگەی یەکەم له مادەی (٩) پێویسته کەسه باڵاکانی ناو سوپا، له فەرماندەی فیرقه و بەرەوژوور، له ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوه متمانه وەربگرن و، هاوسەنگی له پلەکاندا هەبێت به پێی پێکهاتەکانی گەلی عێراق، بەڵام مالیکی کاری بەم بنەما دەستوورییانه نەکردووه.

ئەوەی مایەی سەرنجی شەقامی کوردستان و چاودێرانی بارودۆخەکەیه، هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار له کوردستان، فراوانبوونی دەسەڵاتی سەربازی حکومەتی

ناوەند لە ناوچە جێناکۆکەکان بە مەترسییەکی جیدی وەرنەگرتووە و، تەنها لە ڕووی میدیاییەوە گرینگیان بەم مەسەلەیە داوە. تەنانەت لە ناردنی دوو شاندی حکومەتی و حیزبیدا لە مانگی تشرینی یەکەمی ٢٠١٢، پێداگرییان لە سەر داوای ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە نەکردووە و، تا ئێستایش لە دادگای دەستوی سکالایان لە سەر فەرماندەیی هێزە چەکدارەکان تۆمار نەکردووە.

تا ئەو کاتەی کێشەکە لە ڕووی یاسایی و دەستوورییەوە یەکلایی دەکرێتەوە، پێویستە لە ڕووی مەیدانییەوە، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لە حکومەتەکەی مالیکی، هەڵوێستی نەتەوەیی جیدی وەربگرن و، بە هیچ شێوەیەك ڕێگە بەم کردەوە سەربازییانە نەدەن. زۆر بە جیدی کار بۆ ئەوە بکەن :

- ✓ یان دۆخەکە بگەڕێتەوە بۆ پێش پێکهێنانی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە و پێکهێنانی فەرماندەییەکە هەڵبوەشێتەوە.
- ✓ یان ژووری ئۆپەراسیۆنی هاوبەش دروست بکرێت، لە هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق، تا ئەو کاتەی چارەسەری یاسایی و دەستووری کێشەکە دەکرێت، بەڵام ئەم ژوورە هاوبەشە دەسەڵاتی بە سەر تەشکیلاتەکانی وەزارەتی ناوخۆدا نەبێت.
- ✓ یان ئەوەتا کورد هەڕەشەی ڕاستەقینەی کشانەوە لە دەوڵەتی عێراق بکات، بە هەر سێ ئاستەکەیەوە، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکایەتیی کۆمارەوە. ئەگەر مالیکی پاشگەز نەبێتەوە لە سیاسەتەکانی سەبارەت بە ناوچە دابڕاوەکان.

دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، وەك پێشتر باسکرا، زۆر کەمتەرخەم بووە بەرامبەر بە دۆزی ناوچە دابڕاوەکان، مامەڵەی حیزبیانەی لەگەڵ گۆڕاوەکاندا کردووە نەك مامەڵەی نەتەوەییانە، کێشەکانی دواخستووەو چارەسەری ڕیشەیی

و دوور مەودای بۆ نەدۆزیوەتەوە. بەرپرسیاریێتی فەشەلی ئیدارەدانی فایلی ناوچە دابڕاوەکان دەکەوێتە ئەستۆی یەکێتی و پارتی، چونکە دەسەلآت و هێز و سامانی کوردستان و پشکی کوردیان لە حکومەتی ناوەند، لە بەردەستدایە بۆ بەرەوپێشبردنی ڕەوشی ئابووری و خزمەتگوزاری و ئەمنی،....تاد، لە ناوچە دابڕاوەکاندا.

لە ئێستادا ناوچە دابڕاوەکان، بە خراپترین بارودۆخدا تێ دەپەڕن و، ئالۆزترین بارودۆخی سیاسی و ئیداری و ئەمنی و خزمەتگوزارییان هەیە، کە پێویستە سەر لە نوێ، بە لە بەرچاوگرتنی واقیعی ئێستای عێراق و ئەزموونی ڕابردوو لە هەلۆێستی لایەنە سیاسییەکانی عێراق و، حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق، بەرامبەر بە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ بارودۆخی ناوچە دابڕاوەکان بکرێت.

هەروەها پێویستە ئەم پرسە ئەولەویەتی، لە پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستان و بەغدا، پێ بدرێت و، بکرێتە چەقی هەر هەلۆێستێك لە حکومەتی ناوەند.

# سوپای عێراق "پێکهاتەکەی -ڕێژەی کورد- کاریگەرییەکانی لە سەر ئاییندەی هەرێمی کوردستان"

ئامادەکردنی: د.محەمەد عەلی

## دەروازە

عێراق ئەو دەوڵەتەی، جوگرافیایەکە بە بێ هەبوونی نەتەوەیەکی بەهێز. هەموو گروپە کۆمەڵایەتی، ئایینی، مەزهەبی و ئیتنیکییەکان ترسیان لە یەکتر هەیە و جۆرێك لە بێمتمانەیی لە نێوانیاندا هەیە. لە دوای جەنگی عێراقەوە لە (٢٠٠٣)دا و ئازادبوونی پێکهاتە جیاوازەکانی، عێراق لەبەردەم دەستتێوەردانی هەرێمی و هەڵوەشانەوە و شەڕی ناوخۆدایە. ئەم مەترسییانە خێراتر بوون پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆتایی ساڵی (٢٠١١)دا. بە پێی ڕێکەوتننامەی SOFA لە نێوان حکومەتی عێراقی و ئەمریکییەکاندا، سوپای ئەمریکی لە (٢٠١١/١٢/٣١)دا، جگە لە ڕێژەیەکی کەم هەموو سوپاکەی کێشایەوە. سەرۆك وەزیرانی عێراق نوری مالیکی و بەرپرسەکانی تری حکومەت، ڕایانگەیاند کە عێراقییەکان دەیانەوێ خۆیان داهاتووی وڵاتەکەیان بەڕێوە بەرن. لەو کاتەوە، بنیاتنانی ئەم داهاتووە بووەتە مایەی نیگەرانی و ناسەقامگیری لە ناو گروپە جیاوازەکانی عێراقدا. قسەکردن لە سوپای عێراق و پێکهاتەکەی، پەیوەستە بە ئێستا و داهاتووی عێراقەوە. لە ڕووی سەربازی و بەرگریکردن لە دەوڵەتی عێراق، زۆربەی سیاسییەکانی ئەم وڵاتە، لە گفتوگۆ تایبەتییەکانیاندا دانیان بەوەدا ناوە کە سوپای عێراق، بە تایبەتی هێزی ئاسمانی ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێ.

سوپای عێراق لە ڕێکەوتی ٦ کانوونی دووەمی ١٩٢١ دامەزراوە. لەو ساتەوە، ئەم سوپایە ڕووبەڕووی چەندین ڕووبەڕووبوونەوەی ناوخۆیی و شەڕی هەرێمی بوەتەوە. لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، سوپا لە ساڵانی ١٩٣٦،

۱۹٥٨، ۱۹٦۳ و ۱۹٦٨دا، چوار کودەتای سەرکەوتووی ئەنجام داوە. شەڕی کوەیت ساڵی ۱۹۹۱، سوپای عێراقی بە تەواوەتی لاواز و پەرتەوازە کرد. تا پێش ئەم شەڕە، عێراق خاوەنی (٤۲) فیرقە و یەك ملیۆن سەرباز بووە، بەڵام ئێستا (۱٥) فیرقەیە و نزیکەی (۳٥۰) هەزار سەربازی هەیە.

بیناکردنەوەی سوپا و هێزی پۆلیسی عێراق کارنامەی سەرەکیی حکومەتی عێراقی بووە لە دوای (۲۰۰۳)ەوە. بودجەی وەزارەتی بەرگری لە (۲۰۰٥) بۆ (۲۰۰۹) ساڵانە ۲٨٪ زیادی کردووە، هاوکات بودجەی وەزارەتی ناوخۆ ٤٥٪ زیادی کردووە.

لە وڵاتێکی ئاڵۆزی وەك عێراقدا، سەربەخۆبوونی ئەم هێزە گەورە مرۆییە و بە دووربوونی لە دەستتێوەردانی سیاسی و تایەفی و بەکارهێنانی بە مەبەستی کودەتا یان لە ململانێ ناوخۆییەکاندا مایەی پرسیار و گومانە.

لەم سیاقەدا، دەبێ ئەوە لە بەرچاو بگیرێ کە ۷۰٪ ی هێزی سوپای ڕژێمی پێشوو، لەم سوپا نوێیەدا دەستبەکارن. عەقڵیەت و کارنامەی سوپای پێشوو کار دەکاتە سەر پێکهاتەی سوپا، بە تایبەتی لە ڕووی کودەتا و هەبوونی ئەنگێزەی تۆڵەکردنەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە لە لاپەڕەی سەرەکیی سایتی وەزارەتی بەرگریی عێراق نووسراوە "لا وجود للطائفية والعنصرية والتحزب في الجيش العراقي الجديد" بەڵام واقیعی حاڵ پێمان دەڵێ پێچەوانەی ئەمە ڕاستە.

زۆربەی فەرماندە و پلە باڵاکانی سوپا، لە سەر بنەمای مەزهەبی و سیاسی و نەتەوەیی دامەزراون. بۆ نموونە: ۷٥٪–٨۰٪ پلەدارەکانی سوپا شیعەن. پەیوەستبوون و وەلائی ئەم سوپایە بۆ پارت و گروپە مەزهەبی و ئیتنیکییەکان کاریگەریی گەورەی دەبێت لە لاوازبوونی دەوڵەت و دامەزراوەکانی، لە بەرامبەر بەهێزبوونی پارت و گروپە تایفی و ئیتنیکییەکان.

ئەم هێزانە، بە تایبەتی هێزی ئاسایش و پۆلیسی عێراقی ڕۆڵی خراپیان بینی لە ساڵانی ٢٠٠٥-٢٠٠٦. بە سیاسی کردنی هێزی ئاسایشی عێراقی، زیاتر لە هێزی نیشتیمانیی عێراقی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر دەردەکەوێ. ئەم هێزە لە (٦٠٠٠) کەس پێکهاتووە، بە باشترین هێزی ڕاهێنراو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەژمار دەکرێ. زیندانی تایبەتیی خۆیان هەیە، هەروەها سیخوڕیکردن لە هەموو پارێزگاکاندا ئەنجام دەدەن. بە سیاسی کردنی ئەم هێزە لە (٢٠٠٧)ەوە بە دەرکەوت، کاتێك کە ئەمریکییەکان ئەم هێزەیان ڕادەستی حکومەتی عێراقی کردەوە. نوری مالیکی نووسینگەی دژە تیرۆری کردەوە و ئەم هێزەی لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێریی پەرلەمان و وەزارەتی ناوخۆ و دەرەوە دەرهێنا. مالیکی بە هەمان شێوە، دەستی گرتوە بە سەر دەزگای سیخوڕیکردندا، دەسەڵاتی بەرفراوان و ڕاستەوخۆی مالیکی بە سەر ئەم هێزەوە، بووەتە ڕێگر کە بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵانە و سەربەخۆیانە کارەکانی ڕاپەڕێنی[1].

لە ساڵی (٢٠٠٦)ەوە، مالیکی کۆمەڵێك تاکتیکی بۆ بەهێزکردنی خۆی بەکار هێناوە. فەرمانگەی فەرمادەییی گشتی بەکار هێنا بۆ کۆنترۆڵکردنی کارنامەی ئاسایش، بەمەیش هەر دوو وەزارەتی بەرگری و ناوخۆی لاواز کرد. مالیکی هەندێ فەرماندەی تەکنۆکراتی لادا و لە بری ئەوان، کۆمەڵێکی تری دامەزراند، کە نزیکن لە خۆیەوە یان لە فەرمانەکانی لا نادەن. ئەم دامەزراندنانەی ناونا (کاتی) بۆ ئەوەی خۆی بەدوور بگرێ لە لێپێچینەوەی پەرلەمانی. مالیکی نۆ ئۆپەراسیۆنی هاوبەشی لە نۆ پارێزگادا ئەنجام داوە. دامەزراندنی فەرماندەی ئەم ئۆپەراسیۆنانە، بە بڕیاری ڕاستەوخۆی مالیکی بووە بە بێ گەڕانەوە بۆ وەزیرەکانی بەرگری و ئاسایش. لە ڕێگای ئەم ئۆپەراسیۆنانەوە و

[1]. The Military Balance 2012, the annual assessment of global military capabilities and defence economics. The International Institute for Strategic Studies.

فەرماندەکانیانەوە، کۆنترۆڵی لایەنی سەربازی و ئاسایشی لە سەر ئاستی نیشتیمانی کردووە.

لاوازیی سوپا و ئاسایشی عێراقی لە ڕووی ئیداری و، لۆجیستی و پلانی ستراتیژی، لەو کێشانەی ترن کە سوپای عێراقی نەتوانێ ئەرکەکانی ئەنجام بدا بە شێوازێکی سەربەخۆیانە و پرۆفیشناڵانە. بە تایبەتی پارێزگاری لە سنوورەکان و ئاسمانی وڵات[1].

**١: هێز و توانا مرۆیی و لۆجیستییەکانی عێراق:**

تێکڕای دانیشتوان: ٣٠,٣٩٩,٥٧٢، هێزی مرۆیی ئامادە: ١٥,٢٢٩,٠٩٥، ئامادە بۆ خزمەتی سەربازی: ١٣,٠١٢,٩٠٢، ئامادە بۆ سەربازی لە ڕووی تەمەنەوە: ٦٥٤,٢٠٤، ژمارەی چالاك لە سەربازیدا: ٢٧٦,٦٠٠، ژمارەی یەدەك: ٣٤٢,٢١٢.

بەرهەمی نەوتی: ٢,٣٩٩,٠٠٠ لە ڕۆژێکدا، نەوتی سەرفکراو: ٦٨٧,٠٠٠ لە ڕۆژێکدا، نەوتی ئیحتیات: ١١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ لە ڕۆژێکدا.

هێزی کار: ٨,٥٠٠,٠٠٠، ڕوپێوی ڕێگاکان: km٤٤,٩٠٠، ڕوپێوی ڕێگای شەمەندەفەر: km٢,٢٧٢

بودجەی بەرگری: $١٧,٩٠٠,٠٠٠,٠٠٠، ئیحتیاتی بۆ ئاڵوگۆڕی بیانی و ئاڵتوون: $٤٥,٦٨٠,٠٠٠,٠٠٠، هێزی کڕاو: $١١٣,٤٠٠,٠٠٠,٠٠٠.

جوگرافی: ڕێگاکانی ئاو: km٥,٢٧٩، کەناری ئاوی: km٥٨، ناوچەی زەوی چوارگۆشە: km٤٣٨,٣١٧ ، سنووری هاوبەش: km٣,٦٥٠

هێزی ئاوی ژمارەی گشتیی کەشتی: ١٥، هێزی ئاوی بازرگانی: ٢، ڕێگا سەرەکییە ئاوی و گەڕاجییەکان: ٣، بارهەڵگری گواستنەوەی فڕۆکە: ٠،

---

[1]. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کاولکەر:٠، غەواسە: ٠، فیرقاتات:٠، کرافتی خولی: ٠، مینی کرافتی جەنگی: ٠، کرافتی هێرشبەری دوو جەمسەری: ٠.[1]

سەبارەت بە توانا و هێزی سوپای عێراقی، تائێستا، لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ و دروست لە بەردەستدا نییە. لەبەرئەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە چەند ژمارە و داتەیەکی جیاواز دەخاتەڕوو.[2]

یەکەم لیوا لە سوپای نوێی عێراقدا، لە ساڵی (٢٠٠٣)دا پێك هێنرا، کە ئەو کات سوپای نوێ پێك هاتبوو لە (١٥) فیرقەی پیادە و فیرقەیەکی پیادەی – ئالی واتا ئەو کەرەستە سەربازییانەی کە بە دەست دەجووڵێن– (تانك و فڕۆکە و ئۆتۆمبێلی سەربازیی و کەرەستەی سەربازیی دیکە)، کۆی ژمارەی سەربازی عێراق دەگەیشتە نزیکەی (٣٥٠) هەزار سەرباز.

بە پێی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکان لە ئێستادا سوپای عێراق (٢٥٠) بۆ (٣٠٠) هەزار سەربازە و دابەش دەبن بۆ سەر هێزی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی.

هێزی وشکانی: پێك دێت لە (١٤) فیرقە و هەر فیرقەیەکیش نزیکەی (١٠) بۆ (١٥) هەزار سەربازی هەیە.

هێزی ئاسمانی: لە دوو هێزی فەرماندەیی پێك دێت، یەکەمیان هێزی ئاسمانی و دووەمیان فەرماندەیی فڕۆکەوانی سوپا، (١٥) بۆ (٢٠) هەزار سەربازیان هەیە، بەڵام فڕۆکەی جەنگیان نییە و فڕۆکەی ڕاهێنانیان هەیە، بەڵام فڕۆکەی شەڕکەر لە جۆری ئێف (١٦) تا ساڵی (٢٠٢٠) دەگاتە (٩٦) فڕۆکەی ئەمریکی، لەگەڵ فڕۆکەی فەرەنسی لە جۆری میراج.

هێزی دەریایی: لە (٥) بۆ (١٠) هەزار سەرباز پێك دێ و حکومەتی عێراق ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ حکومەتی ئیتالیادا، ئیمزا کرد بۆ کرینی (٤) کەشتی

[1]. سایتی CIA و لەبەشی The World Fact Book

[2]. بە پێی ڕاپۆرتێکی کەناڵی تەلەفزیۆنی NRT دۆخی سوپای عێراقی لە دوای ٢٠٠٣ وە.

مامناوەند بۆ پاراستنی کەنارە دەریایەکانی عێراق، هەر کەشتییەک پێک هاتووە لە (٣٢) چالاکوانی دەریایی، عێراق تا ئێستا (٢) لەو کەشتییانەی وەرگرتووە.

واتا کۆی گشتیی سەربازی عێراق (٣٠٠) بۆ (٣٥٠) هەزار سەربازە.

سەرجەمی چەکە زەمینییەکان: ٥,٣٤٤، ژمارەی تانک: ٢٩٥، ئەی پی سی ئێس/ئای ئێف فی ئێس2,695 (APCs/IFVs) ، مەدفەعیەی مەقتورە: ١,٥٨٠

ئێس پی جی ئێس224 :(SPGs) ، ئێم ئێل ئار ئێس ئێس0 :(MLRSs)

قەزیفەی هاوەن: ٠، چەکی ئەی تی 550:(AT) چەکی ئەی ئەی :(AA) 0، سەیارەی لۆجیستیکی: ٩,٠٢٨

هێزی ئاسمانی: سەرجەمی فڕۆکەکان: ١,١٣٩ ژمارەی هێلیکۆپتەر: ٢٦٦ ژمارەی فڕۆکەخانە خزمەتگوزارییەکان: ١٠٤.

## ٢: پێکهاتەی وەزارەتەکانی ناوخۆ و بەرگری:[1]

لە دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق، هێزی ئاسایشی عێراقی، (٨٠٦٦٠٠) کەسی دامەزراندوە بۆ هەر دوو وەزارەتی بەرگری و ناوخۆ و هێزی سەرۆک وەزیران بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر.

وەزارەتی بەرگری: ٤٠٠٢٧١ کەس: سوپای عێراق: ٤٢١١٩٣، هێزی ئاسمانی: ٥٠٥٣.

وەزارەتی ناوخۆ: ٥٣١٠٠٠، پۆلیسی عێراق: ٣٠٢٠٠٠، بەشی خزمەتگوزاری پارێزگاریکردن: ٩٥٠٠٠، هێزی سنوور: ٦٠٠٠٠، پۆلیسی فیدراڵی عێراقی: ٤٤٠٠٠، پۆلیسی نەوت: ٣٠٠٠٠.

[1]. ئەم زانیارییانە لە سەرچاوەی جیاواز و فەرمانبەرانی سوپای عێراقەوە وەرگیراون.

له ساڵی (٢٠١٠) دا، ٠٨٪ هێزی کاری عێراقی له لایەن ئاسایيشی عێراقەوە دامەزراون، کە دەکاتە ١٢٪ ڕێژەی دانیشتوان.

هێزی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر: سەرپەرشتیکردنی دژەتیرۆر.

هێزی تایبەتی ئۆپەراسیۆنی عێراقی

هێزەکانی وەزارەتی بەرگری: سوپای عێراقی ئەمانە دەگرێتەوە: (بەڕێوەبەرایەتیی هێزی فڕۆکەوانی، هێزی پێشووی دەستتێوەردانی پاراستنی عێراقی، بەتالیۆنەکانی ژێرخانی ستراتیژی)، هێزی پێشووی ئاسمانی (هێزی بەرگریی سەواحل) ئەمانە دەگرێتەوە: هێزی زەمینی و هەوایی.

سوپای عێراق لە حەڤدە فیرقە پێك دێت. هەر فیرقەی لە چوار لیوای مەشات پێك دێت. هەر لیوایەك لە چوار فەوج و هەر فەوجەی لە فەسیلە و هەر فەسیلەی لە چوار حەزیرە.




فیرقە: لیوا: ٣٠٠٠–٣٢٠٠ سەرباز، فەوج: ١٢٠٠ سەرباز، فەسیلە: ٥٠ سەرباز، حەزیرە: ١١ سەرباز.

### ٣: سوات (SWAT):

ئەم هێزە لە سەرئاستی نێودەوڵەتی ناسراوە و کورتکراوەی Special Weapons And Tactics)_تەکتیك و چەکە تایبەتەکان). سوات هێزێکی

سەربازییە و سەر بە سوپا نییە، ڕاستەوخۆ سەر بە نووسینگەی سەرۆك وەزیرانە، بەڵام فەرمان لە وەزارەتی ناوخۆ وەردەگرن. لە دەرەوەی عێراق ڕاهێنانیان پێ کراوە و لە ناوخۆی عێراقدا چالاکی دەکەن. پەرلەمانیش ناتوانێ لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات. لە دوای ڕووداوەکانی مانگی چواری (٢٠١٣)، جارێکی تر ناوی ئەم هێزە هاتەوە بەر باس. هێزی سوات لە میدیاکانەوە بە "هێزی دەستتێوەردانی خێرا" ناو دەبرێت. ئەم هێزە ساڵی (٢٠٠٧)، لە سەردەمی ئەیاد عەلاویدا دامەزرا. لە مانگی تشرینی دووەمی (٢٠٠٥)دا، دوو بەتالیۆنی هێزەکانی سوات لە (١٤٤٠) سەرباز پێك هێنرا. ئەمەیش دوای ئەوەی بۆ ماوەی دوو ساڵ لە وڵاتەکانی ئوردن و ئەمریکا و ئوسترالیا لە سەر دەستی هێزە تایبەتەکانی سوپای ئەمریکا مەشق و ڕاهێنانیان پێ کرا. ئەو کاتە هەریەکە لە عێراق و ئەمریکا و ڕێکخراوی ناتۆ بودجە و خەرجیی ئەو هێزەیان دابین دەکرد.

لە ئێستادا ژمارەی سەربازەکانی هێزی سوات بە پازدە هەزار سەرباز دەخەملێنرێت. لە ئاستی فەرمیدا ڕاهێنان و ئامادەکردن و دابینکردنی چەك و پێداویستییەکانیان لە ئەستۆی وەزارەتی بەرگریین، بەڵام فەرمان لە وەزارەتی ناوخۆ و نووسینگەی سەرۆك وەزیران نوری مالیکی وەردەگرن. هەرچەندە حکومەت ڕای دەگەیەنێت ئەو هێزە لە چوارچێوەی یاساکانی وەزارەتی ناوخۆدا کار دەکات، کەچی لە سەر ماڵپەری فەرمیی وەزارەتی ناوخۆ، هیچ زانیارییەك لە بارەی ئەرك و پێکهاتە و چالاکییەکانی ئەم هێزە بڵاونەکراوەتەوە .

هێزەکانی سوات جلوبەرگی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە جیاوازە لە جلوبەرگی سەربازەکانی سوپا و هێزەکانی پۆلیس. ئەم هێزە خاوەنی چەك و تفاقی سەربازی زۆر پێشکەوتووی شەوان و هەمەڕی ئەمریکی و تانك و فڕۆکەی پێشکەوتوو دەبینێتەوە. بە پێی زانیاریی میدیاکان، هێزەکانی سوات تا ئێستا

نزیکەی شەش هەزار چالاکییان لە ناوچە جیاوازەکانی عێراق ئەنجام داوە. ڕۆڵیان لە دەستگیرکردنی چەندین سەرکردەی ڕێکخراوی قاعیدەدا هەبووە. تۆمەتبارن بە مامەڵەیەکی دڵڕەقانە لەگەڵ خۆپیشاندەرانی بەغداد و بەسرە و شارەکانی دیکە لە ساڵی (٢٠١١)دا.

دیارترین چالاکییەکانی هێزی سوات بریتین لە: شەڕی نەجەف، شەڕی ئەنباری نێوان سوپای ئەمریکا و چەکدارەکان، پڕۆسەی سەربازی "صولة الفرسان" لە بەسرە، پەلاماردانی کەنیسەی نەجات لە ساڵی (٢٠١٠) لە بەغداد، ڕزگارکردنی وەزارەتی داد لە دەستی گروپە چەکدارەکان لە مانگی ئازاری (٢٠١٣) و پەلاماردانی قەزای حەویجە لە ڕۆژی ٢٠١٣/٤/٢٣. بە وتەی پەرلەمانتاران و چاودێران، تەواوی ئەندامانی هێزی سوات شیعە مەزهەبن و خەڵکی پارێزگا شیعەنشینەکانی باشووری عێراقن و هەندێکی کەمیشیان خەڵکی بەغدان. لە ڕیزەکانی ئەم هێزەدا، کورد و عەرەبی سوننەی تێدا نییە. شوان محەمەد تەها پەرلەمانتاری عێراق و ئەندامی لیژنەی ئاسایش و بەرگریی عێراق، باس لەوە دەکات هەرچەندی لە ئێستادا هێزەکانی سوات لە موسڵ و کەرکووك و بابل بڵاوەیان پێ کراوە، بەڵام فەرمان لە بەرپرسانی ئەو شارە وەرناگرن، بەڵکو فەرمان لە فەریق فارووق ئەعرەجی و بریکاری پێشکەوتووی وەزارەتی ناوخۆ عەدنان ئەسەدی وەردەگرن. تەنانەت لیژنەکەیشیان ناتوانێت چاودێری کارەکانی ئەو هێزە بکات و لێپێچینەوە لە بەرپرسەکانیان بکات.[1]

### ٤: ئۆپەراسیۆنەکان:

ئۆپەراسیۆنەکان بەشێکی گرینگن لە چالاکی و پلانی وەزارەتی بەرگری و حکومەتی عێراقی بە مەبەستی جیاواز. ئەم ئۆپەراسیۆنانە بوونەتە مایەی

---

[1]. هەفتەنامەی ئاوێنە، ژمارە، ٣٧٦ سێ شەم، ٢٠١٢/٥/٧، گۆشەی پرۆفایل، ناوی نووسەری لەسەر نییە.

نیگەرانیی دانیشتوانی پارێزگاکان. دواین ئۆپەراسیۆن کە زۆرترین نیگەرانی و کێشەی لە سەر دروست بوو، ئۆپەراسیۆنی دیجلە بوو.[1]

لەساڵی (٢٠٠٨)ەوە ئۆپەراسیۆنەکان دەستیان پێ کردووە بەم شێوەیە:

یەکەم: بەسرە، دووەم: فوراتی ناوەڕاست، سێیەم: کەرخ، چوارەم: ڕەسافە، پێنجەم: موسڵ (١) مەقەڕ مسەیتر، شەشەم: موسڵ (٢)، حەوتەم: دیجلە.

بۆ هەموو ئۆپەراسیۆنێك: سێ فیرقە.

ئەو هێزانەی هاتوون بۆ کەرکوك (جگە لە دیجلە): یەك لیوا و یەك فەوج لە فیرقەی یەك لە سەید عوزێم و کەمپی ئەشرەف جێگیر بوون، دوو فەوجی مەشاتی مدرع لە فیرقەی نۆ، لەگەڵ کەتیبەی دەبابات، هەروەها فیرقەی (١٤) ی بەسرە هێزێکی ناردووە.

ئۆپەراسیۆن لە سێ فیرقە پێك دێت. بۆ نموونە ئۆپەراسیۆنی دیجلە لە فیرقەی ٤، ٥ و ١٢ پێك دێت.

**٥: توانای مرۆیی سوپا:**

(خەمڵاندن –مەزەنەکردن– ٢٠١١)

خزمەتی سەربازی، تەمەن و ئەرکەکان، تەمەنی خۆبەخشانەی سەربازیی (١٨) ساڵ بۆ (٤٠) ساڵ، هێزی مرۆیی هەبوو بۆ خزمەتگوزاریی سەربازی، نێر: تەمەنی: (١٦–٤٩) ژمارە:٣٢٩٧٦٧٧، مێ، تەمەن: (١٦–٤٩)، ژمارە: ٧٦٦٤٦١٧، هێزی مرۆیی ئامادە بۆ خزمەتی سەربازی، نێر: تەمەن: (١٦–٤٩)، ٦٥٩١١٨٥، مێ: تەمەن: (١٦–٤٩)، ٧١٧٤٢١٦.

---

[1]. The Military Balance 2012, The annual assessment of global military capabilities and defence economics. The International Institute for Strategic Studies.

هێزی مرۆیی دەگەنە تەمەنی خزمەتگوزاریی سەربازی ساڵانە، نێر:١٩٤٣٣٢، مێ: ١٠٣٣٢.

تێچووی سەربازی:

٨,٦ %ی بودجەی نیشتیمانی بۆ خەرجیی سەربازییە، بەراورد بە وڵاتانی جیهان: عێراق پێنجەمینە لە ساڵی ٢٠٠٦.

٦: کڕینی چەك:

لەدوای (٢٠٠٣) وە، حکومەتی عێراقی لە ڕێگای کڕینی چەکەوە لە وڵاتی جیاواز لە هەوڵی بەهێزکردنی سوپاکەی دایە. ئامارێکی دروست لە بەردەستدا نییە سەبارەت بە پرۆسەی کڕینی چەك لە لایەن سوپا و حکومەتی عێراقییەوە، بەڵام ئەم سەرچاوانەی خوارەوە ئاماژە بە هەندێ زانیاری دەدەن.

لە نوێترین زانیاریدا جەنەراڵ ڕۆبەرت کاڵسن، بەرپرسی نووسینگەی هەماهەنگیی ئەمنیی لەگەڵ عێراق لە دواین ڕاپۆرتی وەرزیدا کە پێشەکەش بە کۆنگرێسی ئەمریکا کراوە، ڕۆژنامەی (DEFENSE INDUSTRY DAILY) ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکەی بڵاو کردووەتەوە و تێیدا هاتووە "بەشی فرۆشیاری دەرەکی لە وەزارەتی بەرگریی ئەمریکا (٤٧٩) داواکاریی لە لایە، کە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە پێشکەش کراوە بۆ کڕینی چەك و پێداویستیی سەربازی بە بەهای نزیکەی ١٥ ملیار دۆلار..." [1].

حکومەتی عێراقی، لە مانگی نۆی (٢٠١١) دا، داوای (٣٦) فڕۆکەی (F16)ی کرد لە ئەمریکا، دواتر کرا بە (٢٤)، لە کۆتاییدا ژمارەکە بوو بە (١٨). ڕاهێنانی فڕۆکەوانەکان بۆ ماوەی (١٥) ساڵ بەردەوام دەبێت. وەزیری بەرگریی ئەمریکی

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ڕاپۆرتەکە بڕوانە:

http://www.changesxchange.com/t20283-iraq-submitted-479-applications-for-us-arms-worth-about-us-15-billion

ڕای گەیاند: هەوڵ دەدەن کە عێراق بتوانێ بەرگری لە سنووری ئاسمانیی خۆی بکات. ئەم مامەڵەیە بە (٣) ملیار دۆلار مەزەنە دەکرێ.[1]

باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە شاری بەغدا ڕای گەیاندوە، حکومەتی عێراق لە کۆی (١٤٠) تانکی جۆری ئەبرامز (١٣١) تانکی بە دەست گەیشتووە.

باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە شاری بەغدا بەیاننامەیەکی بڵاو کردۆتەوە و تێیدا ڕای گەیاندووە، بە پێی ئەو بۆندەی لەگەڵ حکومەتی عێراقیان مۆر کردبوو بۆ پێدانی (١٤٠) تانکی جۆری ئەبرامز، ئەوان (١٣١) تانکی سەربازییان ڕادەست کردوون. باڵیۆزخانەی ئەمریکا ڕایشی گەیاندوە، بۆندەکە بە شێوەیەکی شەفاف بەڕێوەچووە و ئێستایش ئەو تانکانە لە ژێر دەستی سوپای عێراقی دان.[2]

ئاژانسیئەسۆشەیتد پرێس ڕای گەیاند، ئەمریکا دوا وەجبەیتانکیجۆری The M1A1 Abramsیڕادەستیسوپایعێراق کرد لە کۆی(١٥٠) تانکدا، ئاژانسەکە لە زاریچەند سەرچاوەیەکیئەمریکییەوە بڵاوی کردەوە "عێراق (١٥٠) تانکیجۆری The M1A1 Abramsیبە بەهای(٨٦٠) ملیۆن دۆلار لە ئەمریکا کڕیوە، ئەمەیش بەشێکە لە پڕۆگرامیمەشقپێکردن بە بڕی(١٢) بلیۆن دۆلار بۆ ڕاهێنانو چەکدارکردنیسوپایعێراقیلە سەر فڕۆکەیجەنگیو کەشتیو ئامێریڕاداریئەمریکی".

ڕوونیشی کردۆتەوە "دوا وەجبەیتانکەکان ئەمڕۆ ڕادەستیسوپایعێراقیکرا".

ئاژانسەکە لە زاریباڵاترین پلەیسەربازییئەمریکیلە عێراق، ژەنەڕاڵ ڕۆبێرت کازلین،ئاماژەیبەوە داوە کە سەربازانیعێراقیبە هەمان توانایئەمریکییەکان تانکەکان بەکار دەهێنن.[3]

---

1. سایتی یەکگرتووو- ٢٠١٢/٢/١٩.

2. سایتی ئاوێنە — ٢٠١٢/٨/٣٠.

3. ئاوێنەنیوز- ٢٠١٢/١٢/١٠.

جێی ئامادەیە دوا سەربازی لە کۆتاییی ساڵی(٢٠١١) لە عێراق کشایەوە، بەڵام تەنها (٢٥٠) سەربازیان بە مەبەستی مەشقپێکردنی سەربازانی عێراق ماونەتەوە.

عێراق سێ فڕۆکەی گواستنەوەی سەربازیی لە ئەمریکا وەرگرت. لە مەراسیمێکدا لە شاری بەغدا، هێزی ئاسمانیی عێراق سێ فڕۆکەی جۆری C-130J لە ئەمریکا وەرگرت، کە تایبەتە بە گواستنەوەی سەربازی. بە پێی بەیاننامەیەکی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە بەغدا، ئەو سێ فڕۆکەیە کە تایبەتە بە گواستنەوەی سەرباز و کەلوپەلی سەربازی، ڕۆژی دوو شەممە تەسلیم بە لایەنی عێراقی کراوە و بڕیاریشە سیانی دیکە لە هەمان جۆری C –130J بۆ هێزی ئاسمانیی عێراق دابین بکرێن.

لە بەیاننامەکەدا هاتووە، کە ستیڤن بیکرۆفت باڵیۆزی ئەمریکا لە بەغدا ڕای گەیاندوە: دابینکردنی ئەو فڕۆکە سەربازییانە لە چوارچێوەی ڕێکەوتننامەی ستراتیژیی نێوان بەغدا و واشنتۆنە و دەری دەخات کە ئەمریکا پەرۆشە بۆ سەقامگیرکردنی بارودۆخی ئەمنی لە عێراقدا.

بە پێی بەیاننامەکەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، ئەو فڕۆکانە نوێترین تەکنەلۆژیای تێدا بەکار هێنراوە لەچاو مۆدێلی پێشووی هەمان جۆردا، فڕۆکەکان لە توانایان دایە تا ئاستێکی زۆر بەرزببنەوەو ماوەیەکی دوورتر بڕن.

گەندەڵی و ناڕوونی (شەفافیەت) لە گرێبەستەکانی چەککڕیندا، بوونەتە بەشێك لە نیگەرانی و کێشە بۆ پێکهاتەکانی عێراق. دیارترینی کەیسی گەندەڵی لە مامەڵەی چەککڕیندا، ئەو مامەڵەیە بوو کە لەگەڵ حکومەتی ڕوسیادا لە کۆتاییەکانی ساڵی (٢٠١٢) ئەنجام درا. گرێبەستی چەکی ڕوسیا کە لەگەڵ عێراق مۆر کرا و بڕەکەی (٤،٢) ملیار دۆلار بوو، بەڵام بە هۆی تێوەگلانی ژمارەیەك کەسی نزیك لە مالیکی هەڵوەشایەوە و ئێستایش ئەو دۆسیەیە داخراوە و وڵات بە هۆی سەرقاڵی بە کێشەکانی تر، ئەو مەسەلەیە وەلا نراوە.

---

وتەبێژی پێشووی حکومەتی عێراقی (عەلی دەباغ) رای گەیاند، هەر یەکە لە کوڕی سەرۆك وەزیـران و سـەرۆکی لێژنـەی ئاسـاییش و بـەرگری لـە ئەنجومـەنی نوێنەران دەستیان هەیە لە گەندەڵی نێو گرێبەستی چەکی ڕوسیا[1]

وتەبێژی پێشووی حکومەتی عێراقی کە ئێستا لە وڵاتی ئیماراتە، بۆ ئاژانسی دەنگ و باسی مۆسکۆ وتی: (ئەحمەدی کوڕی نوری مالیکی) و (حەسەن سنێد)ی سەرۆکی لێژنەی ئاساییش و بەرگری لە ئەنجومەنی نوێنەران دەستیان هەیە لـە گەندەڵی نێو گرێبەستی کڕینی چـەکی ڕوسـیا، ئەمـە جگـە لـە دەسـت هـەبوونی ژمارەیـەك ڕاوێـژکاری مـالیکی. دەبـاغ ڕایـشی گەیانـد، ئـەو زانیـاری لـە بـارەی گەندەڵییەکە هەبوو، بۆیە سەرۆك وەزیران ئەوی لە پۆستەکەی دوورخستۆتەوە و لـە ڕێگـەی ڕاوێـژکاری ڕاگەیاندنییـەوە هــەوڵی لەکـەدارکردنی کەسایەتییـشی دراوە[2].

حکومەتی عێراق سێ فڕۆکەی سەربازی لە ئەمریکا وەردەگرێت، کـە تایبەتـە بـە گواسـتنەوەی سـەرباز و کەلوپـەلی سـەربازی. فەرمانـدەیی هێـزی ئاسمـانیی عێراق سێ فڕۆکەی جۆری سی ١٣٠ی لـە ئـەمریکا وەرگـرت، کـە لـە چوارچێوەی گرێبەستێك دایە و ساڵی ڕابردوو لە نێوان ئەمریکا و عێراق واژۆی لە سەر کـراوە. لەو بارەیـەوە لـە بەیاننامەیەکدا وەزارەتـی بـەرگریی عێـراق ئاشـکرای کـردووە، وەرگــرتنی ئــەو ســێ فڕۆکــە ســەربازییە، جێبــەجێکردنی بەشــی کۆتــاییی گرێبەستەکەیانە لەگەڵ ئەمریکادا و پێشتریش سێ فڕۆکەی دیکەیان لە جۆری سی ١٣٠ لـە ئـەمریکا وەرگرتـوە. فڕۆکـەکانیش تایبـەتن بـە گواسـتنەوەی سـەرباز و هـەموو جـۆرە کەلوپـەلێکی سـەربازی، لـە لایـەن فڕۆکـەوانی عێراقییـەوە بـەکار دەهێنرێن، کە پێشتر لە دەرەوەی وڵات بەشدارییان لـە خـولی ڕاهێنـان لـە سـەر بەکارهێنانی ئەو فڕۆکانە کردووە[3].

---

1. سایتی خەندان- ٢٠١٢/١٢/١٨.

2. سایتی سبەی- ٢٠١٢/٢/٨.

3. سایتی کەی ئێن ئێن- ٢٠١٣/٥/٧.

**٧: ڕێژەی کورد:**

فیرقـــەکانی ٢، ٣، ٤، ١٥ و ١٦ ژمارەیـــەکی زۆری کوردیـــان تێدایـــە، ئـــەم ژمارەیەیش لە لایەن هەر دوو حیزبی پارتی و یەکێتییەوە کۆنترۆڵ کراوە[1].

قورساییی کورد لە فیرقەی سێ و چوارە.

لە لێدوانێکدا، ئەمینداری هێزی پێشمەرگەی کوردستان، جەبار یاوەر دەڵێ: لە ساڵی (٢٠٠٧)ەوە، بڕیاری پێکهێنانی دوو فیرقەی سەربازی دراوە لـە هـەرێمی کوردستان، بەڵام تا ئێستا جێبەجێ نـەکراوە. بە پێکهێنـانی ئەو دوو فیرقەیـە، (٣٠) هەزار کورد دەچوونە ڕیزی سوپای عێـراق. پێشتر و تـا سـاڵی (٢٠٠٧)، بـە گوێرەی سەرژمێرییەکان ڕێژەی کورد لە سوپای عێراق ٨٠٪ بـووە، بـەڵام ئێـستا بۆ نیوە کەمبووەتەوە[2].

لیـوای ١٦ی سـلێمانی سـەر بـە فیرقـەی چـواری سـوپای عێـراق، سـنووری کارەکەیان بە درێژایی لە داقـوق تـا ئینجانـە (زنجـیرەی حـەمرین)، بـە پـانی لـە دوزخورماتوو تاوەکو بازگەی تەلك شەییە، کە بازگەیەکی سەرەکییە لە تکریـت و دوزخورمـاتوو درێـژ دەبێتـەوە. لیواکـە ٦٥٪ی کـوردە، چـوار فەوجـە، دوو ئـامر فەوجی کوردە و دوو ئامریشی عەرەبن شـیعە و سـوننە و تورکمـانی تێدایـە و لـە ناوچە جێناکۆکەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە[3].

پۆســتە گرینگــە ئەمنیــەکانی کــورد لــە (٢٠٠٣) و تــاوەکو (٢٠١٣) بــەم جۆرەیە:[4]

➢ ئەنوەر حەمەد ئەمین – فەرماندەی هێزە ئاسمانییەکانی عێراق.

---

[1] .The Military Balance 2012, The annual assessment of global military capabilities and defence economics. The International Institute for Strategic Studies.

[2]. بۆ گۆڤاری سیڤیل – ژمارە ١٥٩، ٢٠١٣/١٢/١.

[3]. گۆڤاری لڤین لە ژمارە ٢١٦، ٢٠١٢/١٢/١.

[4]. بە پێی ڕاپۆرتێکی کەناڵی NRT

- شێردڵ حەوێزی – بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای هەواڵگری و ئاسایش لە وەزارەتی بەرگری.
- سەڵاحەدین مستەفا– فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی ڕەصافە لە بەغدا.
- حامد محەمەد – فەرماندەی فیرقەی چواریی سوپای عێراق.
- ئاراس عەبدولقادر– فەرماندەی لیوای (١٤)ی فیرقەی چوار.
- موئەیەد نورەدین – سەرۆك ئەركانی فیرقەی (١٢) كە ڕەچەڵەك توركمانە.
- بەختیار محەمەد – فەرماندەی لیوای (١٦)ی فیرقەی چوار.
- عەمید ڕوكن هیدایەت – فەرماندەی لیوای (١٩)ی فیرقەی پێنج.
- فەریق بابەكر زێباری – سەرۆك ئەركانی سوپای عێراق.
- فەیسەڵ دۆسكی – جێگری سەرۆكی دەزگای هەواڵگریی عێراق.
- حسین كەمال – بریكاری وەزیری ناوخۆ.
- لیوا هەینی – فەرماندەی فیرقەی (٣)ی سوپای عێراق.
- عەمید نەزیر– جێگری سەرۆكی فیرقەی پێنجی سوپای عێراق.
- فەریق ڕوكن خورشید – جێگری سەرۆك ئەركانی ڕاهێنانی سەربازیی سوپای عێراق.
- عەمید بەشدار – فەرماندەی لیوای (٤٩)ی فیرقەی (١٢).
- عەمید غەفور – فەرماندەی لیوای پێنجی فیرقەی دوو.
- عەمید ڕوكن مالیك – جێگری فەرماندەی فیرقەی دوو.
- عەمید ڕوكن ئەیاد – جێگری فەرماندەی (١٢) كە بە ڕەچەڵەك توركمانە.
- عەمید ڕوكن هۆگر – بەڕێوەبەری فەرماندەی سامەڕا.

**٨: هۆکارەکانی کەمبوونەوەی ڕێژەی کورد لە سوپای عێراقی:**

بەشدار نەبوون لە بڕیارە گرینگەکانی سوپا و کەمبوونەوەی ڕێژەی کورد، بۆ ئێستا و داهاتووی کورد و هەرێمی کوردستان باش نییە. لە لێدوانێکدا بەختیار محەمەد سدیق فەرماندەی لیوای (١٦)ی سلێمانی سوپای عێراق، دەڵێ: ئەو لیوایە سەرەتا هەمووی کوردبووە و بریتی بووە لە چوار فەوج، ئەوانیش: ڕانیە، چەمچەماڵ، شارەزور و بازیان، بەڵام بە هۆی وازهێنانی کوردەکانەوە.[1]

ئەندامی لیژنەی ئاسایش و بەرگری لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، شوان محەمەد تەها، بە پێی ئامارێکی ئەوان، لیستی هاوپەیمانیی کوردستان و لە لیژنەی ئاسایش و بەرگری لە ساڵی(٢٠٠٧) دا ڕێژەی کورد لە پۆستە باڵاکانی سوپادا ١٩٪ بووە کەچی لەم ساڵانەی دواییدا دابەزیوە بۆ ٦٪ و ئێستایش لە ٣٪ تێپەڕ ناکات. ئەو ڕێژە کوردەیشی لە ناو سوپادان بەردەوام بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات و ئەمەیش مەترسییە بۆ سەر ئایندەی وڵات و شەراکەت و هاوسەنگی لە بەڕێوەبردنی کاروباری سوپا[2].

لەلای خۆشییەوە حەسەن جیهاد لە هەمان لیژنە، دەڵێت لەخوار پۆستە باڵاکانی سوپادا بۆشاییەکی زۆری ڕێژەی کورد هەیە، بە تایبەت لە فەرماندەی فەوج و لیوا و ڕێژەی کورد لەم پۆستانە لە نێوان ٤ ـ ٥٪ دایە[3].

بە پێی ئەو زانیارییانەی دەست ئاوێنە کەوتوون لە ئێستادا دەوروبەری(٨٠) پلەی فەریق و (٢٠٠) پلەی لیوا لە ناو ڕیزەکانی سوپای نوێی عێراق دان، لە کاتێکدا بە پێی ستانداردی سەربازیی، ئەم سوپایە لە ئێستادا تەنها (١٠)

---

1. گۆڤاری سیڤیل – ژمارە ١٥٩، ٢٠١٢/١٢/١.
2. ئاوێنە نیوز – ٢٠١٢/٧/٢.
3. هەمان سەرچاوە

پلەی‌فەریقی‌پێویستەو سوپا هەڵوەشاوەکەی‌سەدامیش، کە خۆی‌بە پێنجەم سوپای‌جیهان دەزانی‌تەنها (٩) فەریقی‌تێدا بوو[1].

لە بارەی‌ئەم حاڵەتەیشەوە، ئەندامی‌لیژنەی‌بەرگری‌و ئاسایش لە ئەنجومەنی‌نوێنەران، شوان محەمەد تەها، بۆ ئاوێنەی‌ڕوون کردەوە "لە وڵاتێکی‌وەکو عێراقدا، نابێت ژمارەی‌هەڵگرانی‌پلەی‌فەریق لە (١٠) کەس تێپەڕ بکات و دەبێت هەر فەریقێکیش فەرماندەی‌دەزگایەکی‌ئەمنیی‌گرینگ بێت، کەچی‌ئێستا لە عێراق ئەم پلەیە بە هەڕەمەکی‌و لە سەر بنەمای‌دڵسۆزی‌بۆ سەرۆک وەزیران دەبەخشرێتەوە".

ئەم پەرلەمانتارەی‌لیژنەی‌بەرگری‌کە لە لیستی‌هاوپەیمانیی کوردستانە، ئامادە نەبوو ئامارەکە پشتڕاست یان ڕەت بکاتەوە، بەڵام جەختی‌لەوە کردەوە "لە ساڵی(٢٠٠٧) وە تائێستا وەزارەتی‌بەرگریی‌عێراق بە شێوەیەکی‌هەڕەمەکی‌کار دەکات و لە سەر بنەمای‌دڵسۆزی‌بۆ مالیکی‌پلە بەرز دەکاتەوە". هەروەها باسی‌لەوەش کرد، ئەوان بەڵگەیان لایە هەندێك لەوانەی‌پلەی‌فەریقیان هەیە لە سوپای‌عێراق، تەمەنی‌یاساییان تەواوبوەو گەشتونەتە ئاستی‌خانەنشین بوون، بەڵام لەبەرئەوەی‌لایەنگری‌نوری‌مالیکین بەنایاسایی‌ماوەی‌خزمەتیان بۆ درێژ کراوەتەوە.

لەلای‌خۆشییەوە ئەندامی‌لیژنەی‌بەرگریی‌ئەنجومەنی‌نوێنەران، حەسەن جیهاد، بۆ ئاوێنەی ڕوون کردەوە جگە لە پێشێلکردنی‌عورفی‌سەربازی، زۆریی‌پلە باڵاکان بە جۆرێك کراون، کە هاوسەنگیی‌ناو ڕیزەکانی‌سوپا تێك دەدەن، چونکە لە ئێستادا ڕێژەی‌کورد لە ناو پۆستە باڵاکانی‌سوپای‌عێراقدا لە نێوان ٣ ـ ٥٪ دایە و، ئەمەیش مەترسییە بۆ ئایندەی‌وڵات و بنەمای‌نیشتیمانیبوونی‌سوپا.

---

[1]. ئاوێنە نیوز – ٢٠١٢/٧/٦.

ئەمینداری گشتیی وەزارەتی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئاماژە بە کەمبوونەوەی ڕێژەی کورد دەکات لە سوپای عێراقدا و دەڵێت "ڕێژەی کورد لە ناو سوپای عێراق بۆ لە (٤٪)کەمبوەتەوە".

فەریق جەبار یاوەر، کە ئەندام و وتەبێژی فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی پاراستنی هەرێمیشە، لە لێدوانێکدا باس لە کەمبوونەوەی ڕێژەی کورد لە سوپای عێراقدا دەکات و ڕای دەگەیەنێت: لەم ساڵدا ڕێژەی کورد لە ناو سوپای عێراقدا بۆ نزیکەی (٤٪) کەمبوەتەوە، ئەوە لە کاتێکدایە کە لە ساڵی (٢٠٠٧) دا و بە گوێرەی سەرژمێرییەکان، ڕێژەی کورد لە ناو سوپای عێراقدا (٨٪) بوە.

یاوەر، کەمبوونەوەی ئەو ڕێژەیە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێنێتەوە، کە یەکێکیان ئەوەیە "کورد نەیتوانیوە بەشداریی تەواوەتی بکات لە سوپای عێراقدا، لە لایەکی دیکەیشەوە کوردستان ناتوانێت وەك ڕژێمی بەعس بە زۆر خەڵك بکات بە سەرباز."

هەر وەك ئەوەیش دەخاتەڕوو، کە ساڵی (٢٠٠٧) بڕیاری دروستکردنی دوو فیرقە درا، بەڵام تا ئێستا پێکهێنانی ئەو دوو فیرقەیە نەچووەتە بواری جێبەجێکردنەوە و لە کاتی پێکهێنانی ئەو دوو فیرقەیەیش (٣٠) هەزار سەرباز بۆ سوپای عێراق زیاد دەبوو[1].

## ٩: جوڵەی پێشمەرگە:[2]

هێزی پێشمەرگە بێ گوێدانە نیگەرانییەکانی بەغدا، لەچەند ناوچەیەکەوە بە قوڵاییی دەیان کیلۆمەتر چوونەتە کەرکوك و ناوچە دابڕێندراوەکانەوە و سەرچاوەیەکیش وردەکارییەکەی ئاشکرا دەکات.

---

1. ئاوێنە نیوز- ٢٠١٢/٩/٢٧.

2. ئیبراهیم عەباس http://www.rubernet.net/Read/16767.html?fb_comment_id=fbc_393246594122027_1976592_393855860727767#.UX9td9iYXGg

سەرچاوەیەكی باڵای سەربازیی هەرێمی كوردستان بە كەناڵی ئاسمانیی پەیامی ڕاگەیاندوە، كە حەوت لیوای هێزی پێشمەرگەی هەرێمی كوردستان بە بێ هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ سوپای عێراق چوونەتە نێو شاری كەركووك و ناوچە دابڕێندراوەكانی دەوروبەری ئەو شارەوە.

ئەو سەرچاوە زانیاریی لەوە زیاتریشی ئاشكرا كردو وتی: لیواكانی(١، ٢، ٦، ١٠ و ١١) تا (٦٠) كیلۆمەتر چوونەتە ئەودیو شاری كەركووكو لیواكانی(٥ و ٦)یش چوونەتە نێو شارۆچكەی(قەرەتەپە)وە.

هەر بە پێی زانیارییەكانی ئەو سەرچاوە تایبەتەی(پەیام) لە ئێستادا هێزی پێشمەرگە لە ناوچەو گوندو شارۆچكەكانی(تركەڵان و قەرەدەرە و مەمۆعەلاغێر و نادراوا و چەخماخو یایچی و درگە) نیشتەجێبوونو لە هەندێك شوێنیشدا بەرانبەر فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەكانی دیجلە وەستاون.

بەپێی زانیارییەكانی ئەو سەرچاوەیە، جوڵەپێكردنی هێزی پێشمەرگە بۆ ئەو ناوچانە لە ژێر سەرپەرشتی ئەنوەر حاجی عوسمان بریكاری وەزارەتی پێشمەرگەی هەرێم دایە.

ئەم بەرەو پێشچوونەی پێشمەرگەی كوردستان لە كاتێكدا لەچەند ڕۆژی ڕابردوودا هەر یەك لە وەزارەتەكانی بەرگریی و ناوخۆ ناڕەزاییان لە بڵاوەپێكردنی هێزەكانی پێشمەرگە لە كەركووك دەربڕی.

**دەرەنجام:**

عێراق بە دەست دوو كێشەی سەرەكییەوە دەناڵێنێ .

یەكەم: نەبوونی نەتەوەیەكی عێراقی یەكگرتوو. تاكەكان لەبری پەیوەستبوون و هەبوونی ناسنامەی عێراقی، وەلائیان بۆ مەزهەب و گرووپی ئیتنی هەیە و ئەمەیش لە كار وجوڵەی سوپادا ڕەنگی داوەتەوە .

دووەم: سیستمی سازان (توافق) لە پرۆسەی سیاسی و پێکهاتەی سوپادا جێبەجێ کراوە. واقیعی حاڵ و ڕووداوەکان پێمان دەڵێن کە سیستمی سازان وڵاتی پەکخستوە و پرۆسەی سیاسی ناچێتە پێش، لەم سۆنگەیەوە سوپایش بووەتە بەشێك لە کێشە نەك چارەسەر.

سەرباری ئەم دوو کێشەیەی سەرەوە، بە ڕای ئێمە ئەم خاڵانە مایەی نیگەرانین.

یەکەم: ڕابردووی سوپای عێراق لە پرۆسەی سیاسیدا و ڕوودانی کۆمەڵێك کودەتا لە سەر دەستی ئەم سوپایە لە مێژووی عێراقدا. زۆرێك لە ئەفسەرە باڵاکانی پێشووی ئەم سوپایە ئەمڕۆ کاربەدەستن لەم سوپایەدا.

دووەم: ململانێی شیعە و سوننە و تێوەگلانی سوپا لەم ململانێیەدا، بە تایبەتی شیعە وەك چۆن لە دەسەلات و پرۆسەی سیاسیدا، هەوڵی تۆڵەکردنەوە دەکەنەوە، بە هەمان شێوە لە کۆنترۆڵکردن و بەڕێوەبردنی سوپادا، ئەم دۆخە دەبینین. بەشێك لەم لێکۆڵینەوەیە تەرخان کراوە بۆ ئەم مەترسییە، بە تایبەتی هەوڵەکانی مالیکی و دەوڵەتی یاسا لەم بوارەدا. ئەوەی ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئەم ئامانجەی شیعەکان، بە پێی مادەی (٧٨)ی دەستووری عێراق، سەرۆك وەزیران فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی عێراقە و بە پێی مادەی (٧٦)ی دەستوور سەرۆکی زۆرینەی پەرلەمانی، کە هەموو جارێك لە شیعەکان دەبێت، دەبێتە سەرۆك وەزیران.

سێیەم: چەککڕینی سوپای عێراق بە بێ چاودێری و ئاگاداریی دەزگایەکی سەربەخۆی نیشتیمانی. گرتنەدەستی ئەم چەکە نوێیانە لە لایەن گروپ و فەرماندەی جیاوازەوە تاڕادەی مەترسیی بردنی ئەم چەکانە لە لایەن گروپە توندڕەوەکانەوە لە ڕێگای تاك و گروپی دزەکراوی سەر بەو گروپانەوە.

چوارەم: کەمبوونەوەی ڕێژەی کورد لە سوپای عێراق و پێك نەهێنانی هەر دوو فیرقەی پازدە و شازدە. ئەو ڕێژە کوردەیش کە لە سوپا دایە، لە لایەن

پارتی و یەکێتییەوە و بە تایبەتی لە لایەن پارتییەوە کۆنترۆڵ کراوە. بە مانەیەکی تر، بەشداریی کورد لە سوپای عێراقدا، بەشدارییەکی حیزبییە نەوەک کوردستانی. ئەمەیش وا دەکات، ئەو پۆستانە لە بەرژەوەندیی حیزبیدا بەکار بهێنرێن و هەر کاتێك ئەم دوو حیزبە کەوتنە ململانێ و ناکۆکی لەگەڵ پێکهاتە و گروپەکانی تری عێراق، مەترسیی تێوەگلانی فەرماندە و پۆستەکانی کوردیش لە سوپادا ئەگەرێکی بەهێزە.

سوپای عێراق بەم پێکهاتە و کارنامەی ئێستاوە، مەترسیی دەبێت بۆ دانیشتوانی عێراق بە گشتی و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی. لەبەرئەوەی زۆرینەی عێراق (شیعە و دەسەڵاتەکانی سەرۆك وەزیران) دەتوانن ئەم سوپایە لە ململانێکانیان دا لەگەڵ کورد و هەرێمی کوردستان بەکار بهێنن وەك چۆن لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا بەکاریان هێناوە.

# کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و کاریگەری لە سەر دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی لە عێراق *

د. ئاکۆ حەمەکەریم

## پێشەکی

بە پێی ڕێکەوتننامەی ئەمنیی نێوان عێراق و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (SOFA) هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لە کۆتایی ساڵی (٢٠١١) خاکی عێراق-یان بەجێ هێشت. ئەم پاشەکشێکردنەیش کاریگەریی گەورەی لە سەر ڕەوشی سیاسی و ئەمنیی ناوخۆی عێراق هەبوو و دەبێت، هەر وەك چۆن ئاییندەی سیاسیی ئەم وڵاتە دەخاتە بەردەم چەندین سیناریۆ و ئەگەری جیاواز، وەکو سیناریۆی: مانەوەی عێراق وەك دەوڵەتێکی دیموکراسیی سەقامگیریی بەهێز، یان سەرهەڵدانی توندوتیژی و جەنگ، یان دابەشبوونی عێراق بە سەر سێ دەوڵەتدا، یان گەڕانەوەی دەسەڵاتگەری لە عێراق.

هەر یەکێك لەم سیناریۆیانە پێویستیی بە توێژینەوەی سەربەخۆ و تەواو هەیە، بۆیە ئێمە لەم توێژینەوەیەدا تەنها یەك سیناریۆ بۆ ئاییندەی عێراق وەردەگرین، کە ئەویش سیناریۆی دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقیە لە عێراق و گریمانەی توێژینەوەکەمان بریتی دەبێت لە: کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا کاریگەریی هەیە لە سەر ئاییندەی سیاسیی عێراق و دەبێتە هۆی دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی (التسلطية التوافقية).

بۆ ڕوونکردنەوەی گریمانەی توێژینەوەکەمان چەند پرسیارێك دەکەین، لەوانە: کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا چی دەبێت لە سەر ئاییندەی سیاسیی عێراق؟ چارەنووسی عێراق بە کوێ دەگات و ئەو سیناریۆیانە چین، کە

---

* ئەم توێژینەوەیە لە کۆنفرانسی زانستیی سێهەمی سکوڵی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی سلێمانی ساڵی ٢٠١٢ پێشکەش کرا. لە کۆنفرانسی ئاییندەی سیاسیی عێراق لە ژێر ڕۆشنایی گۆڕاوە ناوخۆیی و هەرێمیەکانی ئێستا.

چاوەڕێی دەکات؟ ئایا دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، عێراقییەکان دەتوانن سیستمە دیموکراسییەکەیان پێش بخەن و بیپارێزن و کۆتایی بە قەیرانی سیاسیی ناوخۆیی و دەستتێوەردانی دەرەکی بهێنن؟ ئایا عێراق ڕووبەڕووی کێشە و تەنگەژەی زیاتر دەبێتەوە و لە ئەنجامی ناکۆکی سیاسی و مەزهەبی و جەنگی تائیفی و ناوخۆیی سەر هەڵدەدات؟ ئایا دیموکراسی عێراق شکست دەهێنێت و دوا جار جۆرێك لە سیستمێکی دەسەلاتگەری دەگەڕێتەوە؟ ئایا واقیعی نوێی عێراق ڕێگە دەدات جارێکی تر دەسەلاتگەری بگەڕێتەوە؟ ئەگەر ڕێگە دەدات، چۆن؟ جۆرەکانی دەسەلاتگەری چین؟ ئایا عێراق دەسەلاتگەرییەکی تەوافوقی تایبەت بە خۆی دەبێت؟ ئەو گۆڕاوانە (المتغيرات) و فاکتەرانە کامانەن، کە کاریگەرییان هەیە لە سەر گەڕانەوەی دەسەلاتگەریی تەوافوقی؟

بابەتی توێژنەوەکەمان وا دەخوازێت، کە زیاتر لە میتۆدێکی زانستی بەکار بهێنین، سەرەتا پشت بە میتۆدی شیکاری (المنهج التحليلي) دەبەستین بۆ لێکدانەوە و خستنەڕووی کاریگەرییەکانی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر ڕەوشی ناوخۆی عێراق، پاش میتۆدی ئاییندەگەری (المنهج المستقبلي) بۆ ڕوونکردنەوەی ئاییندەی سیاسیی عێراق لە ژێر ڕۆشنایی گۆڕاوە ناوخۆی و دەرەکییەکان و دەرەخستنی کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر ئاییندەی عێراق و دروستبوونی دەسەلاتگەریی تەوافوقی.

بۆ ئەم مەبەستەیش نەخشەی توێژینەوەکە دابەش دەکەین بۆ دوو بەشی سەرەکی، سەرەتا بەشی یەکەم تەرخان کراوە بۆ کاریگەر کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر بارودۆخی ناوخۆی عێراق، کە ئەویش دابەش دەبێت بۆ دوو تەوەرە: یەکەم تایبەت دەبێت بە کاریگەریی کشانەوەی ئەمریکا لە سەر

پرۆسەی سیاسی، دووەمیش باس لە کاریگەریی کشانەوەی ئەمریکا دەکات لە سەر ڕەوشی ئاسایشی عێراق.

هەرچی بەشی دووەمە تەرخان کراوە بۆ سیناریۆکانی گەڕانەوەی دەسەڵاتگەری لە عێراق، کە دابەشبووە بۆ سێ تەوەرە: لە تەوەرەی یەکەمدا باس لە سیناریۆی گەڕانەوەی دیکتاتۆری ئەگەری ڕوودانی دەکەین، دووەمیش سەرهەڵدانی دەسەڵاتگەریی نوێ لە عێراق لە خۆ دەگرێت و تەوەرەی سێهەمیش باس لەدروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی دەکات لە عێراقدا.

## ١. کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر بارودۆخی ناوخۆی عێراق:

کشانەوەی هێزی داگیرکەر لە هەر دەوڵەتێك کە دووچاری داگیرکردن هاتووە بە ڕووداوێکی نیشتیمانیی گەورە دادەنرێت، بەو پێیەی دەوڵەت سەروەریی یاسایی و سیاسی بۆ دەگەڕێتەوە و ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوەی دەپارێزێت و خواستی هاوڵاتییان دەهێنێتەدی، بەڵام بۆ عێراقییەکان کشانەوەی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لە کۆتایی دیسەمبەری (٢٠١١) واتایەکی جیاوازی بەخشی. کشانەوەکە چەندین شوێنەوار و دەرهاویشتەی سیاسی و ئەمنیی جیاوازی لێ کەوتەوە و کاریگەریی سلبییانەی هەبوو لە سەر پرۆسەی سیاسی و ڕەوشی ناوخۆی عێراق.

ئەم کاریگەرییە سلبییانەیش پەیوەستن بە نەگونجاندنی کاتی (توقیت) کشانەوەی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لەگەڵ واقیعی پرۆسەی سیاسی و ئاستی ئامادەباشیی هێزە سەربازییە عێراقییەکان، هەروەها بەردەوامیی شۆڕشەکانی گەلانی عەرەبی (بەهاری عەرەبی) و ئەگەری تێکچوونی هاوسەنگیی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر بارودۆخی ناوخۆی عێراق لە دوو تەوەرەی جیاوازدا بخەینە ڕوو کە یەکەمیان تایبەتە بە کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر پرۆسەی سیاسی و داخوازی دووەمیش تەرخان کراوە بۆ کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر ئاسایشی عێراق.

**١-١ کاریگەری کشانەوەی ئەمریکا لە سەر پرۆسەی سیاسیی عێراق:**

کۆتاییهێنان بە جەنگی عێراق بە یەکێك لە ئامانجە ستراتیژییەکانی ئیدارەی ئۆباما دادەنرێت، وەکو لە بەڵگەنامەی ستراتیژیی ئاسایشی نیشتیمانی* (National Security Strategy)دا هاتبوو کە ئەمریکا پابەندە بە ڕێکەوتننامەی سوفا (SOFA) و بەشێوەیەکی بەرپرسانە خاکی عێراق جێ دەهێڵێت. بەم شێوەیە باراك ئۆباما سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە وتارێکی لە (٢٠١١/١٢/١٤) لە بنکەی سەربازیی فۆرت براگی کارۆلینای باکوور ئاماژەی بە کۆتاییهاتنی جەنگی عێراقدا وتی: "هێزەکانمان ئەرکێکی نائاسایيان ڕاپەڕاند و بە سەربەرزیی عێراقێکی سەقامگیر بە جێ دەهێڵین"[١].

پرسیاری سەرەکیی لێرەدا ئەوەیە: ئایا ئەمریکا بەشێوەیەکی بەرپرسانە کۆتاییی بە جەنگی عێراق هێنا و هێزە سەربازییەکانی کشانەوە؟ بێگومان

---

* National Security Strategy, The White House, May 2010:
http://www.whitehouse.gov/sites/default/files/rss_viewer/national_security_strategy.pdf

1. Obama marks end of Iraq war at Fort Bragg, BBC, 14 December 2011:
http://www.bbc.co.uk/news/world-us-canada-16186136

نـەخێر، چـەند ڕۆژێـك بـە سـەر قـسەکانی ئۆبامـادا تـێ نەپـەڕی، تـا بـارودۆخی سیاسیی و ئەمنیی عێراق تێکچوو، پرۆسەی سیاسی تووشی ئیفلیجبوون بوو*.

وەکو خوان کول Juan Cole پسپۆڕ لە کاروباری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لـە زانکۆی میشیگان دەڵێت: ئەمریکا عێراقێکی ناسـەقامگیر و لاواز و برینـداری لـە دوای خۆی جێ هێشت، سەرکەوتوو نەبوو لە جەنگێك کـە زیـاتر لـە یـەك تریلـۆن دۆلاری تێـچوو و، زیـاتر (٤٤٠٠) سـەربازی ئـەمریکی و (١٠٠٠٠٠) عێراقـی بوونـە قوربانی. ئاماژە بـەوەیش دەدات کـە عێـراق بـە دەسـت دابەشـبوون و ململانێـی تونـدی مەزهـەبی و نەتـەوەیی دەناڵێـت و بـارودۆخی عێـراق بـەرەو کارەسـات دەچێت.(١)

هەروەها لە ڕاپرسییەکدا دەرکەوت کە لە٦٠٪ عێراقییەکان کاتی کـشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا بـە نـەگونجاو دەزانـن و لـە ٥٠٪ پێیـان وایـە کـە کـشانەوەکە کاریگەریی سلبیی دەبێت لە سەر ئایینـدەی عێـراق و وڵات ڕووبـەڕووی مەترسـی دەکاتەوە و ٤٠٪ ئاماژەیان بەوە کردووە، کە سەرۆکی ئەمریکا گرینگی بە پرسی عێراق نادات و لەبەر بەرژەوەندیی تایبـەتیی خۆیـان هێزەکانیـان کـشاندۆتەوە٢. ئەمەیش ئەوە ڕاستییە دەردەخـات، کـە خـودی عێراقییـەکان نیگـەران لـە کـاتی

---

* لە سەروبەندی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆتایی ٢٠١١ ململانێکانی نێوان شیعە و سوننە تەقیـەوە، پاش ئەوەی حکومەتی عێراقی بڕیاری دەستگیرکردنی تاریق هاشمی جێگری سـەرۆك کۆمـار دەرکـرد، بـە تۆمەتی تێوەگلانی لە کاری تیرۆریستی و ناوبراویش ناچاربوو بەغداد جێ بهێڵێت و لە هـەرێمی کوردسـتان نیشتەجی بێت، هەروەها نووری مالیکی سەرۆك وەزیران داوای لێسەندنەوەی متمانـەی لـە سالح موتڵـەگی جێگری کرد، ئەمانە هاوکات بوون لەگەڵ داوای بەهەرێمبوونی پارێزگاکانی سەلاحەدین و دیالە.

[1]. As Obama Announces Iraq Troop Withdrawal, Critics Say War Provides 'CautionaryTale.
http://www.huffingtonpost.com/2011/10/21/obama-iraq-troop-withdrawal_n_1025900.html

[2]. انسحاب القوات الأمريكية المتسرعة غير المسؤولة من العراق، صحيفة الشعب اليومية أونلاين،
http://arabic.people.com.cn/96604/7125116.htm

کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، بە تایبەتییش لە کاتێکدایە کە بارودۆخی سیاسی لەبارێکی ئاڵۆز دایە و ئایندەی عێراق ڕوون نییە.

ئەمریکا نەیتوانی یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی جەنگی عێراق بهێنێت، کە بریتیی بوو لە بە دیموکراسیکردنی عێراق. جورج دەبلیو بوش سەرۆکی پێشووی ئەمریکا بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد، کە عێراق دەکاتە نموونەیەکی سەرکەوتووی دیموکراسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە وتارێکیدا وتی: ئامانجمان یارمەتیدانی عێراقییەکانە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراس و ئازاد و فیدراڵ... دەوڵەتێك خەونی عێراقییەکان بهێنێتەدی و ڕێز لە ماف مرۆڤ و ئازادیی تاکەکان بگرێت[1]. بەڵام ئەمریکا نەك هەر نەیتوانی عێراق بکاتە نموونەیەکی سەرکەوتووی دیموکراسی، بەڵکو بووە هۆی لاوازبوونی دەوڵەتی عێراق و ناسەقامیگری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئەو وڵاتە و تێکچوونی ئاسایشی ناوخۆ و دەرەکی.

لەگەڵ ئەوەی لە دوای (نیسانی ۲۰۰۳)ەوە دەسەلات لە عێراق گۆڕاوە و کۆتایی بە سیستمی دیکتاتۆری هاتووە و چەند هەڵبژاردنێك ئەنجام دراوە و دەستوورێکی مۆدێرین دانراوە...هتد، بەڵام بنەماکانی دیموکراسیی ڕاستەقینە لە عێراق نەچەسپیوە، بەو پێییەی عێراق بە قۆناغی گواستنەوەی هەستیاردا تێپەڕ دەبێت (لە دیکتاتۆرییەوە بۆ دیموکراسی) کە دامەزراوە شەرعیيەکانی دەوڵەت لاوازن و بە دەست گەندەڵی و دەستتێوەردانی حیزبی و خراپ بەکارهێنانەوە دەناڵێنن، کە توانای وەڵامدانەوەی داواکاریی هاوڵاتییانیان نییە.

بە واتایەکی تر بنەماکانی گەمەی دیموکراسی لە عێراق نەچەسپیوە، تا ئیستا پێکەوە ژیانی ڕاستەقینە لە نێوان حیزب و پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییە

---

1. الرئيس بوش في خطابه الاسبوعي، مصممون على الخطوات الخمس للمساعدة في بناء عراق ديمقراطي فيدرالي موحد، صحيفة الانصات الامركزية، العدد (٢٨٧٨)، ٢٠٠٤/٦/٦، ص٩-١٠.

جیاوازەکان نییە و یەکتر قبوڵ ناکەن و هەر لایەنێك هەوڵی بە دەست هێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەدات لە سەر حسابی ئەوانی تر بە بێ گوێدانە بنەما نیشتیمانییەکان. ئەمەیش پرۆسەی دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات لە عێراق دەخاتە مەترسییەوە، بە تایبەتییش ڕەنگە هەندێك پێکهاتە بە هاوکاریی لایەنی دەرەکی دەست بە سەر دەسەڵاتدا بگرن (لە بەشی دواتردا بە درێژی باسی دەکەین).

بەو پێیەی عێراق لە لایەن ئەمریکاوە داگیرکرابوو و بە پێی بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەرپرسیارێتیی ئاسایشی عێراق لە ئەستوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، بۆیە ئەمریکا هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ پاراستنی ئاسایش و سەقامگیریی ئەو وڵاتە. یەکێك لە میکانیزمە گرینگەکانی ئەمریکا بۆ پاراستنی سەقامگیری لە عێراق بریتی بوو لە پاراستنی هاوسەنگیی هێز لە نێوان هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکەدا (شیعە و سوننە و کورد) لە ڕێگەی تەوافوقی سیاسییەوە.

ئەمریکا نەیدەویست هیچ لایەك ئەوەندە بەهێز بێت کە بە تەواوی هەژموونی خۆی بە سەر لایەنەکانی تردا بچەسپێنێت، بە پێچەوانەیشەوە نەیدەویست هیچ لایەنێك لاواز بێت یان پەراوێز بخرێت، چونکە بەهێزبوون یان لاوازبوونی لایەنێك بە مانای سەرهەڵدانی کێشە و تێکچوونی هاوسەنگیی هێز دێت. بۆ نموونە ئەمریکا توانی کێشەی یاخیبوونی سوننە چارەسەر بکات پاش ئەوەی توانی بەشدارییان پێ بکات لە پرۆسەی سیاسیدا، کە لە سەرەتادا پەراوێز خرابوون.

بۆیە ئەمریکا لەپێناو پاراستنی سەقامیگریی عێراق بەردەوام هەوڵی سازانی دەدا لە نێوان پێکهاتە جیاوازەکان و فشاری دەخستنە سەر تا دەستبەرداری بەشێك لە داواکارییەکانیان بن و بگەنە ڕێکەوتن و پێکەوە کار بکەن، تا

ڕادەیەکیش ئەمریکا توانیبووی بەم ئەرکە هەستێت و هاوسەنگی لە نێوان پێکهاتە و لایەنەکان بپارێزێت.

کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا فاکتەرێك بوو بۆ تێکچوونی هاوسەنگیی هێز لە عێراق، بەشێوەیەك بووە هۆی بەهێزبوون و هەژموونی لایەنێك (شیعە) و لاوازبوون لایەنێکی تر (سوننە)، هەروەکو چۆن سەرچاوەیەك بوو بۆ قوڵبوونەوەی ململانێ ناوخۆییەکانی عێراق.

وەکو ئاشکرایە ململانێ سیاسی و مەزهەبی و نەتەوەییەکانی عێراق مێژوویەکی درێژیان هەیە و بە تەنها دەرهاویشتەی سەردەمی داگیرکاریی هێزەکانی ئەمریکا نین، بەڵکو بەشێکی پەیوەستە بە بونیادی پێکهاتەی عێراق و مێژووکەیەوە، بەڵام ئەمریکا هۆکارێك بوو بۆ لاوازی و پەرتەوازەبوونی عێراق و تەقینەوەی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەزهەبییەکان، جارێکی تریش کشانەوەکەی دەبێتە هۆکارێك بۆ قوڵبوونەوە و توندبوونی ململانێکانی عێراق.

لە عێراق چەندین ئاست و جۆری ململانێ لە نێوان پێکهاتە مەزهەبی و نەتەوەییەکان و حیزب..هتد هەیە، کە لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا ئاستی ململانێکان توندتربوون، بڕوانە هێڵکاری ژمارە (١).

ئەم هێڵکارییە سێ ئاستی سەرەکی ململانێ دەردەخات لە عێراق، ئەوانیش ململانێ (سوننە– شیعە) و (ناوەند–پارێزگا) و (کورد– عەرەب) و ئەو خاڵە سەرەکییانەیشی خستۆتە ڕوو کە ناوەڕکی ململانێکانن*.

بۆ نموونە هەرچەندە ململانێ سوننە و شیعە مێژوویەکی درێژی هەیە و فاکتەرەکانی زۆرن، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم ململانێیە بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتە لە عێراق، شیعەکان کە زۆرینەن بەدرێژاییی مێژووی دەوڵەتی عێراق بێ بەش بوون

---

* بێگۆمان ئاست و جۆرەکانی ململانێ زۆرن لە عێراق، کە باس لە ململانێی سوننە و شیعە دەکەین، ئەوانیش هەر یەکەیان دابەش دەبن بۆ چەند ئاستێکی تر، بۆ نموونە لە ناو شیعەدا ململانێی (شیعە-شیعە) هەیە و لە ناو سوننەدا ململانێ (سوننە-سوننە) و بە هەمان شێوە بۆ ململانێ کورد- عەرەب، کە ململانێ کورد-عەرەبی شیعە و کورد-عەرەبی سوننە و کورد-تورکمان هەیە، لە ناو کوردیشدا ململانێی تر هەیە وەکو ململانێی ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵات...هتد.

لە دەسەڵات، لە(٢٠٠٣)ەوە دەسەڵاتی خۆیان بە سەر جومگە گرینگەکانی عێراقدا چەسپاند و لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا پەردەیان لە سەر ئەوە هەڵماڵی، کە دەیانەوێت بەتەنها فرمانڕەوایی عێراق بکەن و تەوافوقیان هەڵوەشاندەوە و سوننەکانیان لە حکومەت و پرۆسەی سیاسی پەراوێزخست و ئەمەیش بووە هۆی چەقبەستنی پرۆسەی سیاسی لە عێراق.

ململانێی پارێزگا و حکومەتی ناوەندی ئاستێکی تر ململانێکانە و درێژکراوەی ململانێی سوننە و شیعەیە، کە لەگەڵ نزیکبوونەوەی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق لە کۆتایی (٢٠١١) سەری هەڵدا، پارێزگا سوننەکانی وەکو سەلاحەدین و دیالە داوای بەهەرێمبوونیان کرد، بەو پێیەی عەرەبی سوننە ترسیان لەوە هەیە لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندەوە پەراوێز بخرێن، کە عەرەبی شیعە تێیدا باڵادەستە و گەشتوونەتە ئەو باوەڕەی، کە ناتوانن لە حکومەتی ناوەندا بگەنە دەسەڵات. هەروەها ئەنجومەنی پارێزگاکان بە گشتی و پارێزگا سوننەکان بە تایبەتی، کاروبارەکانیان وەکو پێویست لە ناوەندەوە بەڕێوە ناچن، بۆیە پێکهێنانی هەرێم هاوشێوەی هەرێمی کوردستان بە چارەسەر دەزانن بۆ ئەوەی دەسەڵاتی زیاتریان هەبێت، ئەمەیش ململانێکانی نێوان سوننە و شیعەی قووڵتر کردەوە و بارودۆخەکەی زیاتر ئاڵوز کرد.

بە هەمان شێوە، لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و قووڵبوونەوەی ململانێ نێوان شیعە و سوننە، ململانێی نێوان حکومەتی ناوەند و هەرێمی کوردستان ئاستێکی توندتری بەخۆیەوە بینی. لەگەڵ ئەوەی ململانێ کورد و حکومەتی ناوەندی لە سەر ناوچە جێناکۆکەکان، کێشەی مادەی (١٤٠)، بودجە، نەوت و گاز و پێشمەرگەیە، بەڵام ململانێی دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا بە پلەی یەکەم لە سەر دەسەڵاتە، کە کورد ترسی لە هەژموونی شیعەکان و کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات هەیە.

له ئەنجامی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، کاریگەریی ئەم ململانێیانە زیاتر بوون لە سەر ئاییندەی عێراق، ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی ئاشتییانە کێشەکان چارەسەر نەکرێن و ئیدارەی ململانێکان نەدرێت، ئەوا عێراق ڕووبەڕووی چەندین سیناریۆی جیاواز دەبێتەوە، وەکو سەرهەڵدانی توندوتیژی و جەنگی تائیفی و ئیتنیکی و پاشان ئەگەری دابەشبوون و گەڕانەوەی دەسەڵاتگەری.

## ٢-١ کاریگەریی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سەر ڕەوشی ئاسایشی عێراق:

ئیدارەی ئۆباما لە بەڵگەنامەی ئاسایشی نیشتیمانیی ئەمریکادا ئەوەی ئاشکرا کردبوو، کە تا توانای هێزە ئەمنی و سەربازییەکانی عێراق نەگاتە ئاستێك کە بتوانن ئاسایش ناوەوە و دەرەوەی عێراق بپارێزن، دۆسیەی ئەمنی ڕادەستی عێراقییەکان نەکاتەوە و پاشەکشێ لەو وڵاتە نەکات[1]. بەڵام ئەمریکا نەیتوانی ئەو بەڵێنە بێنێتەدی و سوپایەکی بەهێزی نیشتیمانی پێك بهێنێت.

ئێستا پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، سوپای عێراق لە توانایدا نییە ئاسایشی ناوخۆ و دەرەکیی وڵات بپارێزێت، چونکە[2]:-

١. ئامادەباشیی سوپای عێراق لە ئاستی پێویستدا نییە و تا ئێستایش سوپای نوێی عێراق ڕاهێنان و مەشقی پێویستی پێ نەکراوە، وەك بابەکر زێباری سوپاسالاری پێشووی عێراق وتی "تا (٢٠٢٠) سوپای عێراق ئامادە نابێت و ناتوانێت ئەرکی خۆی لە پاراستنی ئاسایشی وڵاتدا جێبەجێ بکات"[3].

---

[1]. National Security Strategy, op.cit.

[2]. د. ئاکۆ حەمەکەریم، عێراق و کوردستان پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، توێژینەوەیەکی بڵاونەکراوەی ناوەندی توێژینەوەی سیاسیی بزووتنەوەی گۆڕان، ٢٠١١، ص٦.

[3]. بابکر زيباري، القوات العراقية لن تكون قادرة على تولي الأمن حتى عام ٢٠٢٠، راديو سوا، http://www.radiosawa.com/iraq/arabic_news.aspx?id=8043682

٢. لە ڕووی چەکدارکردنەوەی سوپای عێراق لاوازە و هەموو ئەو ڕێکەوتننامانەی عێراق بۆ خۆپڕچەکردن ئیمزای کردوون، ماوەیەکی زەمنیی زۆریان دەوێت بۆ جێبەجێکردنی و بە چەند قۆناغێك چەکەکان وەردەگرێت[1]، واتە چەکدارکردنی سوپای عێراق ڕاستەوخۆ و بەخێرایی نایەتە دی.

٣. لە ئێستادا سوپای عێراق سوپایەکی لاواز و دابەشبوو و بێ بەرنامەیە، بەشێکی زۆری سوپا ئینتیمای بۆ نیشتیمان لاوازە، بگرە زیاتر ئینتیمای بۆ مەزهەب و نەتەوە و حیزب و لایەنە سیاسییەکان هەیە، بۆیە ناتوانرێت سەد لە سەد لە کاتی تەنگەژە ناوخۆیی و دەرەکییەکاندا پشتی پێ ببەسترێت.

٤. لە ئێستادا سوپای عێراق ناتوانێت بە شێوەیەکی تەواو پرۆفیشناڵی کار بکات و توانای مادی و مرۆیی لاوازە و ناتوانێت بەرەنگاری تیرۆر و توندوتیژی بێتەوە.

٥. لاسەنگیی هێزی عێراق بە بەراورد بە هێزی وڵاتانی تر، بە تایبەتییش وڵاتانی دراوسێ.

ئەم هۆکارانەیش وا دەکەن، کە پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، جۆرێك لە بۆشاییی هێز (فراغ القوة) دروست بێت لە عێراق، کە لە توانای هێزە

---

[1]. حکومەتی عێراق دوو پلانی ستراتیژی دارشتووە بۆ خۆ پڕچەککردن کە بڕی (١٠) ملیار دۆلاری بۆ تەرخان کراوە و ستراتیژی یەکەم تا ساڵی (٢٠١٥)ە و ستراتیژی دووەم تا ساڵی (٢٠٢٠)ە، بۆ ئەم مەبەستەیش چەند گرێبەستێك لەگەڵ وڵاتانی ئۆکرانیا و ڕوسیا و سربیا و فەرەنسا و ئەمریکا و ئیتاڵیا مۆرکراون بۆ کڕینی فڕۆکەی جەنگی و کۆپتەر و تانك، بۆ نموونە عێراق بە نیازە (٩٦) فڕۆکەی جۆری F16 لە کۆمپانیای (لۆکهیدمارتن)ی ئەمریکی بکڕێت کە چەندین ملیار دۆلاری تێ دەچێت، هەروەها عێراق بۆندێکی لەگەڵ سربیا مۆر کردووە بە بڕی (١٠٠) ملیۆن بۆ کڕینی فڕۆکە و تانك و، بۆندێکی بە بڕی ٢,٤ ملیار دولار لەگەڵ وڵاتی ئۆکرانیا مۆر کردووە بۆ کڕینی تانك و زرێپۆش و فڕۆکە. بڕوانە، د. ئاکۆ حەمەکەریم، هەمان سەرچاوەی، پێشوو، ل٦-٧.هەروەها بڕوانە، محمد حميد الصواف، الجيش العراقي... صفقات كبيرة وتحديات اكبرضعف الموازنة والفساد يحدان من سقف الآمال، شبكة النبأ المعلوماتية، ١٢/حزيران/٢٠١٠،

http//:www.annabaa.org/nbanews/2010/06/134.htm

چەكدارەكانی عێراقدا نییە ئەو بۆشاییە ئەمنییە پڕ بكەنەوە، سەرئەنجام ئەم لە لایەكەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی كاری توندوتیژی و تیرۆریستییەكان، لە لایەكی تریشەوە دەبێتە هۆی زیاتر دەستتێوەردانی دەوڵەتانی دراوسێ.

وەكو د. جاسم غالی بەڕێوبەری سەنتەری لێكۆڵینەوەی كەنداوی عەرەبی (مركز دراسات الخليج العربي) لە كۆڕبەندێكدا تایبەت بە (عێراق لە پاش كشانەوەی ئەمریكا) وتی: "یەكێك لە دەرئەنجامە سلبییەكانی كشانەوەی هێزەكانی ئەمریكا لە عێراق دروستبوونی بۆشاییی هێزە، كە پێویست دەكات پەلە بكرێت لە پێشخستن و چەكداركردنی هێزە عێراقییەكان"[1].

ئاست نزمیی هێزە چەكدارەكانی عێراق، هۆكارێك دەبێت بۆ بەهێزبوونی گروپە چەكدار و تیرۆریستییەكان، كە ڕەنگە سەرئەنجام ڕەوشی ئەمنیی عێراق تێك بدات و توندوتیژی و ئاژاوەی مەزهەبی و نەتەوەیی لێ بكەوێتەوە.

بە پێی ئامارە ڕەسمییەكانی حكومەتی عێراق، لەگەڵ نزیكبوونەوەی كشانەوەی هێزەكانی ئەمریكا ئاستی توندوتیژی لە عێراق زیادی كردووە، بۆ نموونە تەنها لە مانگی یۆلیۆی ساڵی ڕابردوو ٥٣٥ عێراقی بوونەتە قوربانی، كە ٣٩٦ هاوڵاتییان مەدەنیین، ئەمەیش گەورەترین ئاستی توندوتیژییە لە عێراق لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا[2].

د. ئەنتونی كوردسمان Anthony H. Cordesman كە پسپۆڕێكی ستراتیژی و سەربازییە لە (سەنتەری ستراتیژی و لێكۆڵینەوەی نێودەوڵەتی) لە واشنتۆن ئاماژە بەوە دەكات: ئەمریكا سەركەوتوو نەبوو لە دروستكردنی هەیكلی سیستمی سیاسی لە عێراق و نەیتوانی سەر لە نوێ سوپای عێراق بە شێوەیەك

---

1. خلال ندوة "العراق ما بعد الانسحاب" باحثون يدعون الى استثمار العلاقات مع اميركا، موقع جريدة الصباح الجديد، ٢٠١٢/١/٤،

http://www.newsabah.com

2. انسحاب القوات الأمريكية المتسرعة غير المسؤولة من العراق، سەرچاوەی پێشوو.

بونیاد بنێتەوە، کە بتوانێت ئاسایشی ئەو وڵاتە بپارێزێت و ڕووبەڕووی
مەڕەشەکان بێتەوە بە تایبەتییش لە بەرامبەر ئێران، کوردستان ئەمەیش بە
هەڵەیەکی ستراتیژیی گەورەی ئەمریکا لە قەڵەم دەدات[1].

بە واتایەکی تر، کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا دەبێتە هۆی دروستبوونی
بۆشاییی هێز لە عێراق کە هانی دەوڵەتانی دراوسێ دەدات زیاتر دەست لە
کاروباری ناوخۆی عێراق وەربدەن. بەو پێیەی عێراقیش بەشێکە لەو ململانێ
هەرێمییە کە لە ناوچەکەدا لە نێوان ئێران (بەرەی شیعی) و تورکیا و سعودیە
(بەرەی سوننی) هەیە، ئەم دوو بەرەیە بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی خۆیان
بەشێواز و میکانیزمی جیاواز دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق وەردەدەن و
پشتگیریی گروپ و ڕێکخراوە عێراقییەکان دەکەن.

دوور نییە، لە ئایندەدا عێراق (بە هۆی لاوازیی سیاسی و سەربازیی
ناوخۆیییەوە) ببێتە میدانی یەکلاییکردنەوەی ململانێی هەرێمییەکانی نێوان هەر
دوو بەرەکە، بە تایبەتییش ئەگەر بێت و بە هۆی شۆڕشەکانی گەلانی
عەرەبییەوە هاوسەنگیی هێز لە نێوان بەرەی شیعی و سونی تێك بچێت، واتە
ئەگەر گۆڕان لە ڕژێمی سوریادا ڕوو بدات، بەرەی دەوڵەتانی سوننی بەهێز دەبێت
و لە بەرامبەردا بەرەی دەوڵەتانی شیعی لاواز دەبێت، ئەمەیش هانی ئێران دەدات
ململانێکانی بگوێزێتەوە بۆ عێراق*

---

[1]. Anthony H. Cordesman and others, Iraq and the Challenge of Continuing Violence, Center for Strategic and International Studies, Washington, EBook, 2012, pp2-3.

* ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە سوریا دەبێتە هۆی گۆڕینی هاوکێشەی هێز لە ناوچەکە، بە جۆرێك بەرەی شیعی (ئێران-سوریا) لاواز دەبێت و لە بەرامبەردا بەرەی سوننی (سعودیە-تورکیا-میسر) بەهێز دەبێت، ئەم تێکچوونە لە هاوسەنگیی هێز کاریگەریی گەورەی دەبێت بۆ سەر عێراق و هەرێمی کوردستان، بەو پێیەی:

بەشێوەیەکی گشتی پێگەی دەوڵەتانی سوننی لە ناوچەکە بەهێز دەبێت، کە هەوڵدەدەن لە ڕێگەی عەرەبی سوننەوە ڕۆڵی زیاتر بگێڕن لە عێراق، لەوانەیە ئەمەیش سوننەی عیراق هان بدات هەوڵی گەڕاندنەوە

یەکێکی تر لە مەترسییەکان ئەوەیە کە سوپای عێراق سوپایەکی نیشتیمانیی پرۆفیشینالْ نییە[1]، بەڵکو هاوشێوەی ژیانی سیاسی دابەش بووە بە سەر پێکهاتە و مەزهەبە جیاجیاکاندا، بەشێکی سوپاکە پێکهاتووە لە میلیشیا شیعەکانی پێشوو (فەیلەقی بەدر و جەیشی مەهدی) و هێزی صەحوە و کۆنە بەعسییەکان و پێشمەرگە، کە ئەو ئەگەرە دروست دەکات لە کاتی بوونی ململانێی ناوخۆی ئەم سوپایە ببێتە بەشێك لە ململانێکان، یاخود لە لایەن کەس و حیزبێکی دیاری کراوەوە بۆ بەرژەوەندیی تایبەت بەکار بهێنرێت، بە تایبەتییش لە ئێستا لە لایەن شیعە و نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانەوە کۆنترۆڵی هێزە چەکدارەکانی عێراق کراوە.

---

بدەن بۆ دەسەڵات و سنوورێك بۆ هەژموونی شیعە و ئێران دابنێن، یان هەوڵی بە دەست هێنانی دەسەڵاتی زیاتر لە ناوەند و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بدەن.

ئێران هەست بە کەنارگیریی زیاتر دەکات و عێراق دەکاتە گۆڕەپانی یەکلاییکردنەوەی کێشەکان و، لە دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، ئێران هەموو توانای خۆی بەکار دەهێنێت بۆ چەسپاندنی هەژموونی لە عێراق و دوورخستنەوەی لە بەرەی سوونی.

پێگەی هەرێمیی تورکیا بەهێز دەبێت، بە جۆرێك هەوڵدەدات سەرکردایەتیی جیهانی ئیسلامی بکات و، بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندییەکانی زیاتر دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق و هەرێمی کوردستان وەربدات.

بڕوانە: ئایندەی کورد لە عێراق، پەیپەری شیکاری ژووری توێژینەوەی سیاسیی بزووتنەوەی گۆڕان، ٢٠١١/١١/٥؛

http://www.gorran.net/UserFiles٢٠٪ئایندەی/کگعێراق٢٠٪٥٪ل٢٠٪ورد.pdf

[1]. بڕوانە، د. عزیز جبر شیال، الجیش العراقي، قدرات متدنیة وتهدیدات متزایدة، مرکز الجحزیرة للدراسات، ١٥ کانووني الثاني ٢٠١٢؛

http://studies.aljazeera.net/reports/2012/01/2012115134647609886.htm

١. گەڕانەوەی دەسەڵاتگەری لە عێراق:

ئاییندەی عێراق دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لەبەردەم چەند سیناریۆیەکی جیاواز دایە، وەکو سیناریۆی بەردەوامیی دیموکراسیی عێراق و زیاتر چەسپاندنی، سیناریۆی فراوانبوونی زیاتری فیدراڵی، سیناریۆی دابەشبوونی عێراق، سیناریۆی سەرهەڵدانی توندوتیژی و جەنگی تائیفی و ئەهلی، سیناریۆی گەڕانەوەی دەسەلاتگەری لە عێراق. هەر یەکە لەم سیناریۆیانە کەم یاخود زۆر چانسی ڕوودانیان هەیە لە ئاییندەدا و تا ڕادەیەکیش پەیوەستن بە یەکترییەوە، کە باسکردنی هەر یەکێکیان پێویستیی بە توێژینەوەی جیاواز و قوڵبوونەوەی ورد هەیە.

لە پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسیدا، هەموو کۆمەڵگایەك بە چەند قۆناغێکی مێژوویی هەستیاردا تێ دەپەڕێت، کە هەندێکیان خاڵی وەرچەرخان و یەکلاییکەرەوەن بۆ چەسپاندنی یان شکستهێنانی دیموکراسی لە مێژووی ئەو کۆمەڵگایەدا، دانکۆت ڕۆستۆ Dankwart Rustow لە وتارێکی زانستی بە ناوی (Transition to Democracy) چوار قۆناغی سەرەکی بۆ پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسیدا دیاری دەکات [1]:

- **یەکەم قۆناغی بەدیهێنانی یەکێتیی نیشتیمانییە**، کە مەبەست لێ دروست بوونی ناسنامەیەکی نیشتیمانی هاوبەشە بۆ زۆرینەی هاوڵاتییان.
- **دووەم قۆناغی ململانێی سیاسیی یەکلایی نەکراوەیە**، کە لەم قۆناغە گروپ و لایەنەکان بە ململانێیەکی توند تێ دەپەڕن، کە دەشێت دیموکراسی یەکێك بێت لە بەرهەمەکانی.

[1]. Dankwart A. Rustow, Transitions to Democracy: Toward a Dynamic Model, in Lisa Anderson (editor) , Transitions to Democracy, Columbia University Press, New York, EBook, 1999, pp28-45.

➢ **سێهەم قۆناغی بڕیارە**، ئەم قۆناغە ساتەوەختێکی مێژووی گرینگە، تێدا گروپ و لایەنەکانی ململانێ دەگەنە چارەسەرێك و تەبەنی بنەماکانی دیموکراسی دەکەن و ڕێگا بە هەموو لایەك دەدرێت، کە بەشداریی پرۆسەی سیاسی بکەن.

➢ **چوارەم قۆناغی ڕاهاتنە لە سەر بنەماکانی گەمەی دیموکراسی.**

ڕۆستۆ ئاماژە بەوە دەدات ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە قۆناغی بڕیاردا، ناتوانن بڕیار لە سەر بنەماکانی گەمەی دیموکراسی بدەن دووچاری شکست دەبن و پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسی هەرەس دەهێنێت.

ئەگەر ئەم مۆدێلەی ڕۆستۆ لە پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسی بە سەر واقیعی عێراقدا جێبەجێ بکەین، دەبینین عێراق هێشتا لە قۆناغی یەکەم و دووەمدا کە هێشتا ناسنامەیەکی نیشتیمانیی هاوبەش عێراقی بۆ زۆرینەی هاوڵاتییانی دروست نەبووە، بگرە ناسنامەی تائیفی و ئیتنیکی و نەتەوەییەکان زاڵن، هەروەها لایەن و پێکهاتەکانی عێراق باوەڕیان بە بنەماکانی گەمی دیموکراسی نییە لە ململانێکانیدا، بەڵکو هەر لایەن هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەسەلات و بە دەست هێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەدات لە سەر حسابی ئەوانی تر، واتا کۆمەڵگەی عێراق هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناغی بڕیار بۆ پەسەندکردنی بنەماکانی گەمەی دیموکراسی و قبوڵکردنی یەکتر و پێکەوە ژیان و دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەلات و سەروەرکردنی یاسا.

ئێمە گریمانەی ئەوە دەکەین، کە عێراقییەکان ناتوانن لە ئاییندەیەکی نزیکدا بگەنە چارەسەرێکی دیموکراسییانە بۆ کێشەکانیان و بڕیار لە سەر بەردەوامی و چەسپاندی دیموکراسی بدەن لە عێراقدا، بۆیە ئاییندەی عێراق لەبەردەم گەڕانەوەی جۆرێك لە دەسەلاتگەریدا دەبێت.

لەم توێژینەوەیەدا تەنها باس لە سیناریۆی گەڕانەوەی دەسەلاتگەری دەکەین لە عێراق، بەو پێیەی بابەتی توێژینەوەکەمان تەرخان کراوە بۆ ئەو باسە

و پێمان وایە ئەم سیناریۆیە لەبەر ڕۆشنایی بەڵگە و فاکت و داتاکاندا (کە لە باسەکانی دواتردا دەیانخەینە ڕوو) ئەگەری ڕوودانی زیاترە لە عێراق، کە لە ئێستاوە هەندێك لە ئاماژە و سەرەتاکانی دەرکەوتوون.

ئەم بەشەی توێژینەوەکەمان دابەش دەکەین بۆ سێ سیناریۆی سەرەکی، یەکەم تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی گەڕانەوەی دیکتاتۆری و ئەگەری ڕوودانی لە عێراق و دووەمیش تەرخان کراوە بۆ شیکردنەوەی سیناریۆی سەرهەڵدانی دەسەڵاتگەریی نوێ لە عێراق و سێیەمیش باس لە سیناریۆی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی دەکات.

## ٢-١ گەڕانەوەی دیکتاتۆری و ئەگەری ڕوودانی لە عێراق:

بە پێی ئەم سیناریۆیە پاش ئەوەی لایەن و پێکهاتە جیاوازەکانی عێراق بەردەوام دەبن لە سەر ململانێ توندەکانیان و ڕێك ناکەون لە سەر چارەسەرێکی دیموکراسی و ئاشتییانە، کە هەموو لایەك ڕازی بکات، بارودۆخی عێراق ناسەقامگیر دەبێت، ئەمەیش یارمەتی ئەوە دەدات کە لە ئاییندەدا دەسەڵاتێکی دیکتاتۆریی مەرکەزی بگەڕێتەوە، کە ئایا لە ڕێگەی کودەتای سەربازییەوە دەبێت یان لە ڕێگەی دەستگرتن بە سەر دەسەڵات و قۆرغکردنیدا دوای ئەوەی کە بە هەڵبژاردن دێت.

١. ڕوودانی ئەم جۆرە سیناریۆیە ڕێگەی تێ دەچێت، بەو پێیەی[١]:

عێراق ژینگەیەکی لەبارە بۆ دروستبوونی دیکتاتۆر و بە درێژایی مێژوو لە لایەن دیکتاتۆرەکانەوە فەرمانڕەوایی کراوە و جۆرێك لە کلتوور لە عێراق باوە کە یارمەتیدەری سەرهەڵدان و قبوڵکردنی دیکتاتۆرییەتە، لە عێراق زیاتر لە (١٠)

---

[1]. د. ئاکۆ حەمەکەریم، عێراق و کوردستان پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦-١٧.

کودەتا ئەنجام دراون و هەموویان سیستمێکی دیکتاتۆرییان بە دوای خۆیاندا هێناوە[1].

٢. تا ئێستا لە عێراقدا دیموکراسییەکی ڕاستەقینە و ڕۆشنبیری و کلتووریی دیموکراسی نییە کە هەڵقوڵاوی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی گەلانی عێراق بێت، دەیان گروپ و کۆمەڵ و حیزب هەن کە باوەڕیان بە بنەماکانی دیموکراسی و فیدراڵی و ئازادیی گشتی و مافی مرۆڤ... هتد نییە و داوای دەسەڵاتی مەرکەزی و حوکمی کەمینە دەکەن، هەموو ئەمانەیش ڕێخۆشکەرن بۆ سەر لە نوێ گەڕانەوەی دیکتاتۆری.

٣. گەڕانەوەی دەسەڵاتێکی مەرکەزی لە عێراق لە لایەن زۆربەی وڵاتانی دراوسێ و ناوچەکەوە پشتگیریی لێ دەکرێت بە تایبەتییش ئەگەر بێت و ئەو سەرکردەیە بەرژەوەندیی دەوڵەتانی دراوسێ بپارێزێت، چونکە زۆربەی ئەم وڵاتانە ئەزموونی دیموکراسی و فیدراڵیی عێراق بە هەڕەشە لە قەڵەم دەدەن بۆ سەر ئاسایشی نیشتیمانیان و نایانەوێت ئەو پەتا و دردمەی کە لە عێراق هەیە بگوێزرێتەوە بۆ ئەوان، هەروەها پشتگیری لە دەسەڵاتێك دەکەن کە بتوانێت سەقامیگریی عێراق بپارێزێت و سنوورێك دابنێت بۆ ناکۆکیی مەزهەبی و ئیتنیکی و ناسەقامگیریی سیاسی و ئەمنی و ببێتە قەڵغانێك لە بەرامبەر هەژموونی شیعی.

٤. دوور نییە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی هاوپەیمانی پشتگیری لەو جۆرە دەسەڵاتە بکەن، بە تایبەتییش ئەگەر بێت و ئەو دەسەڵاتە ڕێگە بگرێت لە ناسەقامگیری و هەڵگیرساندنی جەنگی ناوخۆ، هەروەها بتوانێت عێراقییەکان یەك بخات و دەوڵەتێکی بەهێز پێك بهێنێت، تا بتوانێت سنوورێك بۆ دابەشبوون و دەستتێوەردانی دەرەکی دابنێت و لە بەرامبەر ئێراندا بۆستێتەوە،

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: باقر یاسین، مێژووی خویناوی عێراق، و: حەمەسالح گەلاڵی، مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراسییەکانی (ی.ن.ك) سلێمانی،٢٠٠٤. هەروەها بڕوانە: د. کاظم حبيب، الاستبداد والقسوة في العراق، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٥.

ڕەنگە ئەم ئەرکەیش تەنها بە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری بکرێت! کە لە ڕابردوودا توانیبووی،بە زەبری هێز عێراقییەکان یەك بخات و بەرەنگاری دەوڵەتانی ناوچەکە ببێتەوە.

بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا وا دەخوازێت کە پاش کشانەوەی هێزەکانی لە عێراق ئەو وڵاتە سەقامگیر بێت، هیچ دەوڵەت و لایەنێك تێدا باڵادەست نەبن و عێراق نەبێتە بنکەیەك بۆ تیرۆر و تێیدا هەڕەشە لە بەرژەوەندی و ئامانجەکانی ئەمریکا بکرێت لە ناوچەکە، بۆیە ئەمریکا دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری دۆستی پێ باشترە لە دەسەڵاتێکی دیموکراسیی لاوازی دۆستی نەیارەکانی وەکو ئێران.

ئەم سیناریۆیەیش چەندین توێژینەوەی لە لایەن ئەمریکییەکان لە سەر کراوە، بۆ نموونە سەنتەری کاروباری نێودەوڵەتی سەر بەزانکۆی نیویۆرك لە توێژینەوەیەکدا بە ناونیشانی (Iraq Post 2010*) عێراق لە پاش (٢٠١٠) پێشبینیی ڕووداوەکانی عێراق دەکات لە دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق، لە ئەنجامی بەردەوامبوونی ناسەقامگیریی ڕەوشی سیاسی و ئابووری و ئەمنی و سەرهەڵدانی شەڕ و ئاژاوە، سەرکردەیەکی نیشتیمانی دەردەکەوێت و دەسەڵات کۆنترۆڵ دەکات و هەوڵی یەکخستنی وڵات دەدات و متمانەی هاوڵاتییانی عێراقی بە دەست دەهێنێت، بەو پێیەی وەك کەسێکی ڕزگارکەر سەیر دەکرێت، بۆیە باشترین ڕێگە بۆ دەربازبوون لەو تەنگەژە و قەیرانانە (بە پێی توێژینەوەکە) گەڕانەوەی سیستمێکی دیکتاتۆری و تاکڕەوییە[1].

بەڵام لە واقیعدا ڕوودانی ئەم سیناریۆیە قورسە و ئەگەرێکی دوورە، بەو پێیەی:

---

* Steven A. Cook, Douglas Dillon Fellow, IRAQ POST-2010, Center for Global Affairs, New York University, Number 1, Spring 2007, pp4-26.

[1]. ئاکۆ حەمەکەریم، سیاسەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوای ڕووداوەکانی ١١ سێپتەمبەر، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی،٢٠٠٩، ل١٦٥.

١. پێکهاتە و دابەشبوونی تائیفی و نەتەوەیی ڕێگە بەوە نادات کەسێك یان چەند کەسێك کۆنترۆڵی دەسەلآت بکات و بە شێوەی مەرکەزی فەرمانڕەوایی عێراق بکات، بۆ نموونە هەرێمی کوردستان دژی ئەو جۆرە دەسەلآتەن.

٢. ئەستەمە جارێکی تر عێراقییەکان ڕێگە بە دیکتاتۆریەت بدەن، گەلان عێراق ئێستا تامی ئازادی و دیموکراسییان کردووە و پەسەندی ناکەن جارێکی تر بە ئاگر و ئاسن فەرمانڕەواییان بکرێت و ماف و دەستکەوتەکانیان زەوت بکرێت.

٣. دامەزراوە سیاسی و سەربازی و ئابوورییەکان حکومەت لەو ئاستەدا نین، کە کەسێك بتوانێت بەکاری بێنێت بۆ کۆنترۆڵکردنی هەموو عێراق.

٤. کارێکی قورسە سەرکردەیەك دروست بێت و بتوانێت ڕەزامەندیی یاخود هەموو پێکهاتەکانی عێراق کورد و شیعە و سوننە لە ژێر سایەی خۆیدا کۆ بکاتەوە.

٥. هیچ سەرکردەیەك ناتوانینێت پشتگیریی هەموو دەوڵەتانی دراوسێ و ئەمریکا و ڕۆژئاوا بە دەست بهێنێت، بۆ نموونە ئەگەر سەرکردەکە لە شیعە بوو و ئێران پشتگیریی کرد، ئەوا دەوڵەتانی دراوسێ و ئەمریکا دژی دەبن، بە پێچەوانەیشەوە ڕاستە.

بۆیە ئەگەری ڕوودانی ئەم سیناریۆیە (گەڕانەوە دیکاتۆریەت)، لە ژێر ڕۆشنایی خوێندنەوەی واقیعی ئێستای عێراق لاوازە، ئەمەیش هانمان دەدات بیر لە ڕوودانی سیناریۆیەکی تر بکەینەوە.

### ٢-٢ سەرهەڵدانی دەسەلآتگەریی نوێ لە عێراق:

سەرەتا مەبەست لە دەسەلآتگەری (التسلطية Authoritarianism) ئەو جۆرەیە لە سیستمی سیاسی، کە دەسەلآت تیایدا لە لایەن کەسێك یان چەند کەسێکی دیارکراوەوە کۆنترۆڵ کراوە و دەستاودەستکردنێکی سنووورداری

دەسـەڵات هەیـە و فـرە حیزبـی و ئـازادی و مافـەکان سـنووردارکراون و دامودەزگاکانی دەوڵەت لاوزان و بە دەست گەندەڵییەوە دەناڵێنن و دەسـەڵاتی دادوەری و یاسادانان ناتوانن بە ڕۆڵی خۆیان هەستن و یاسا سەروەر نییە، بۆیە دەسەڵاتگەریی جیاوازە لە دیکتاتۆری Dictatorship کە مەبەست لەمەی دووەمیان ئەوەیە، کە دەسەڵات تەنها بە دەست یەك کەسە و بە ئاگر و ئاسن فەرمانڕەوایی دەکات و کۆنترۆڵی هەموو جومگەکانی دەوڵەتی کردووە بە بێ بوونی هیچ چاودێری و لێپرسینەوەیەك[1].

دەسەڵاتگەری چەند واتایەکی جیاواز لەخۆدەگرێت و بۆ گەلێك مەبەست بەکار دێت، لەم ئەمڕۆدا دەسەڵاتگەری بۆ ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتانە بەکار دێت کە هەرچەندە بەهەڵبژاردن هاتوون، بەڵام خۆسەپێنن و شەرعیتییان گوماناویە و ئازادییەکانیان سنووردار کردووە...هتد، وەکو ڕووسیا، ئێران، فەنزویلا، غانا، زیمبابوی، بۆیە چەمکی دەسەڵاتگەری گەشەی کردووە و بە چەند جۆرێك بەکار دێت، وەکو دەسـەڵاتگەریی نوێ Neo Authoritarianismیان نیمچە دەسـەڵاتگەری semi-authoritarianism یـان دیموکراسـیی هەڵبـژاردن electoral democracy یـان دەسـەڵاتگەریی کێبڕکێکـاری Competitive authoritarianism[2].

---

[1] د. عبدالغني بسيوني عبدالله، النظم السياسية، دراسة لنظرية الدولة والحكومة والحقوق والحريات العامة في الفكر الاسلامي والفكر الاوربي، منشأة المعارف للنشر، الاسكندرية، ط٤، ٢٠٠٢، ص١٩٩-٢٠٠. وينظر: برتران بادي، هل هناك فارق بين التسلطية والديكتاتورية؟ وهل الديمقراطية مفهوم مطلق ؟ موقع جريدة اللوموند ٢٢ ايلول ٢٠٠٩:

http://www.lemonde.fr/international/article/2009/09/22/aucune-democratie-n-est-a-l-abri-d-une-poussee-autoritaire-meme-en-europe_1243468_3210.html

[2]. Steven Levitsky and Lucan A. Way, The Rise of Competitive authoritarianism , Journal of Democracy Volume 13, Number 2 April 2002, p52-53.

پرۆفیسۆر جیمس پیتراس James Petras لە بابەتێکدا بە ناوی دەسەلاتگەریی نوێ Authoritarianism The New ئاماژە بەوە دەدات کە سیستمە دیموکراسییە لاوازەکان بەرەو سیستمی ئۆریگارچی Oligarchy (فەرمانڕەوایی کەمینە) چوون، کە کەمینەیەك لە سەرۆك حیزب و دەوڵەمەند و بازرگاکان دەسەلاتیان کۆنترۆڵ کردووە و کێبڕکێ دەکەن بۆ بە دەست هێنان بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان، بە بێ گوێدانە بەرژەوەندیی گشتی[1]. سیستمی سیاسیی ڕوسیا نموونەیەکی گونجاوە بۆ مۆدێلی دەسەلاتگەریی نوێ لەمڕۆدا، پارتی ڕوسیا یەکگرتوو بە سەرۆکایەتیی ڤلادیمێر پۆتین کۆنترۆڵی دەسەلاتی کردووە، کە دەستاودەستکردنی دەسەلات تەنها لە نێوان چەند کەسێکی کەم دایە و ئازادییەکانی سنووردار کردووە و دامەزراوەکانی دەوڵەت لە بەرژەوەندیی حیزب بەکار دەهێنێت و ساختەی گەورە لە هەڵبژاردنەکاندا دەکات...هتد[2].

بە پێی ئەم سیناریۆیە عێراق لە ئاییندەدا دەبێتە سیستمی دەسەلاتگەریی نوێ، کە لە ئێستاوە نیشانە و سەرەتاکانی دەرکەوتووە، واتە حیزبێك یان چەند کەسێکی کەم دەسەلات قۆرغ دەکەن و ڕێگە بە فرە حیزبییەکی سنووردا دەدەن و داهات و سوپا و دەزگاکانی حکومەت لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیان و حیزبەکەیان بەکار دەهێنن و بەمەیش کێبڕکێکارەکانی بەرامبەریان لاواز دەکەن و هەلیان پێ نادەن بگەنە دەسەلات، هەڵبژاردەکان بە شێوەیەك بەڕێوە دەبەن کە بردنەوەی خۆیان مسۆگەر بکات کە هاوشێوەی پرۆسە و جومگەکانی تری دەوڵەت گەندەڵی و ساختەی تێدا دەکرێت.

---

1. James Petras, The New Authoritarianism, 11/28/2011: http://palestinechronicle.com/view_article_details.php?id=17273

2. Justin Raimondo, Western Hypocrisy and the Russian Election, We preach "democracy" and practice oligarchy, March 8, 2012: http://lewrockwell.com/raimondo/raimondo161.html

به واتایەکی تر عێراق هەمان مۆدێلی ڕووسیا دووبارە دەکاتەوە، وەکو ئاماژەمان پێدا لە ئێستاوە ئاماژەکانی دروستبوونی دەسەڵاتگەریی نوێ دەرکەوتووە، کە حیزبی دەوڵەتی یاسا بە سەرۆکایەتیی نوری مالیکی سەرۆک وەزیران و شیعەکان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی تەواویی دەسەڵات دەدەن، لە دوای پاشەکشێی هێزەکانی ئەمریکاوە ئەم هەوڵانە بە ڕوونی دەردەکەون، کە شیعەکان لە دەرەوەی دەستوور و یاسا دامەودەزەگا و داهاتی دەوڵەت (بە هەموو ئاستەکانیەوە) بۆ بەهێزکردنی پێگەی فەرمانڕەوای خۆیان و لاوازکردنی بەرامبەرەکانیان بەکار دەهێنن.

ڕۆژنامەی نیۆیورك تایمزی لە (١٣) کانوونی یەکەم نووسیبووی: "هاوکات لەگەڵ پاشەکشێ هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق مالیکی سەرۆك وەزیران دەسەڵاتی خۆی زیاتر بەهێز دەکات، کە حەزی ستەمکاری تێدایە و توانایەکی گەورەی هەیە بۆ مانەوە لە دەسەڵات، ڕۆژنامەکە دەشڵێت: مالیکی بڕیار لە ئایندەی عێراق دەدات، کە بە دیموکراسی بمێنێتەوە یاخود بیگۆڕی بۆ سیستمی تاکەکەسی و تاك حیزبی"[1].

هەروەها ئەیاد عەلاوی سەرۆکی لیستی عێراقیە کە (٩١) کورسیی لە پەرلەمانی عێراقی بە دەست هێنا، هەمان ئەو مەترسییانە دەردەخات و دەڵێت: "عێراق بەرەو فەرمانڕەوایی تاکەکەسی دەڕوات، نوری مالیکی سەرۆك وەزیران دەستوور پێشێل دەکات بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی، سوپا و دامەزراوە ئەمنییەکان بەکار دەهێنێت بۆ سەرکوتکردن ڕکابەرە سیاسییەکانی و بە شێوەی گەندەڵانە دەوڵەت بەڕێوە دەبات، کە توانای دابینکردنی خزمەتگوزارییەکانی نییە"[2].

---

1. نیویورك تایمز، المالکی یعزز سلطاته بالتزامن مع انسحاب القوات الأمریکیة من العراق، الوفد، ٢٠١١/١٢/١٣، http://www.alwafd.org/%D8%B5%D8%AD%D9%81/134761-

2. علاوي، المالیکي یستخدم الفساد والوحشیة في ادارة شؤون العراق، وکالة انباء المستقبل،٢٠١٢/٤/١٠،

به هەمان شێوە مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە پەیامێکیدا لە٢٠/٣/٢٠١٢ وتی: "عێراق لە قەیرانێکی جیدی دایە و بەرەو هەڵدێر دەچێت... سەرۆك وەزیرانی دەسەڵاتی کۆنترۆڵ کردووە، خەریکە چەند کەسێك عێراق بەرەو دیکتاتۆریەت دەبەن"[1].

دەستگرتن بە سەر دەسەڵات و پیادەکردنی مۆدێلی دەسەڵاتگەریی نوێ ئەگەرێکی نزیکە لە عێراقدا، بە تایبەتییش لە لایەن شیعە و نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانەوە، بەو پێیەی:

١. لە ئێستادا سەرۆك وەزیران هەموو دەسەڵاتە گرینگەکانی لە دەستی خۆیدا کۆکردۆتەوە و پێنج پۆستی هەیە: فەرماندەی راستەقینەی هێزە چەکدارەکانی عێراق و وەزیری بەرگری و وەزیری ناوخۆ و بەڕێوبەرایەتیی هەواڵگری و سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتیمانی، بە واتایەکی تر هەموو مەلەفی ئەمنی لە ژێر دەسەڵاتی خۆی دایە و دەتوانێت سوپا و پولیس و ئەمن بجولێنێت.

٢. مالیکی تاکڕەوانە و بە بێ گەڕانەوە بۆ لایەنەکانی تر، حکومەت بەڕێوە دەبات و بڕیار دەدات، لایەنەکانی تر وەکو کورد و سوننە پەراوێزخستە و کە دەبووایە بە پێی ڕێکەوتنی هەولێر حکومەتی هاوبەشی نیشتیمانی و لە سەر بنەمای تەوافوق دروست بکرایە.

٣. لە ماوەی ڕابردوودا سەرۆك وەزیرانی عێراق بە بیانووی جیاواز ڕووبەڕووی نەیارەکانی بۆتەوە هەر لە دەرکردنەوە تا گرتن و ئەشکەنجەدان، بە پێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی هیومان ڕایس ووچ کە لە (٢٢-١-٢٠١٢)دا بڵاوی

http://www.mustakbal.net/index.php?option=com_content&view=article&id=18434:2012-04-10-08-38-38&catid=2:2011-07-18-15-01-39&Itemid=8

[1]. پەیامی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە، سایتی سەرۆکی هەرێم،٢٠/٣/٢٠١٢، http://www.krp.org/kurdish/articledisplay.aspx?id=25867

کردۆتەوە، بارودۆخی ماف مرۆڤ و ئازادیی ڕادەربڕین لە عێراق لە ئاستێکی خراپ دایە، کە ئازادیی ڕادەربڕین سنووردار کراوە و هێرش دەکرێتە سەر ڕۆژنامەوانان و ئەشکەنجەدان و گرتووخانەی نهێنی هەیە، حکومەت بە توندی ڕووبەڕووی خۆپیشاندان دەبێتەوە و دیاردەی گەندەڵ بەرفراوان بووە...هتد بە پێی ڕاپۆرتەکە عێراق بەرەو دەوڵەتی پۆلیسی دەچێت[1].

٤. حیزبی دەوڵەتی یاسا و شیعەکان دەستیان گرتووە بە سەر هەموو جومگەکانی حکومەتەدا، بە شێوەیەك شیعە زۆرینەی سوپا و هێزە ئەمنیەکان و فەرمانگەکانی حکومەت پێك دەهێنێت.

ئەم فاکتەران لەگەڵ ئەو فاکتەرانەی کە لە سیناریۆی یەکەمدا ئاماژەمان پێدا، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، کە پرۆسەی دیموکراسی لە عێراق بەبەردەوامی لە پاشەکشێ دایە، ئەوەی ئیستا لە عێراقدا دەگوزەرێت دەسەلاتگەرییە و دوورە لە بنەماکانی دیموکراسیی ڕاستەقینە، بەڵکو تەنها بە ڕووکەشی دیموکراسی هەیە، بۆیە لە واقیعدا چەند هێزێکی سیاسی دەیانەوێت تەنها خویان فەرمانڕەوای عێراق بن و ئەوانی تریش تەنها پاشکۆ بن و ڕێگەیش بۆ ئەوە خۆش دەکەن، کە بە هیچ جۆرێك دەستبەرداری دەسەلات نەبن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا واقیعی سیاسی و ئیتنیکی و کۆمەلایەتیی عێراق و هاوکێشە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکان، ڕێگە بەوە دەدەن کە مۆدێلی دەسەلاتگەریی نوێ لە ئاییندەدا بە تەواوی بچەسپێت لە عێراق؟ بە بۆچوونی ئێمە نەخێر و ئەگەریش ڕوو بدات، ئەوا تەنها بۆ ماوەیەکی زەمەنی کورت دەبێت، چونکە عێراق پێکهاتەیەکی تائیفی و ئیتنیکی جیاوازی هەیە، کە هیچ یەکێك لە پێکهاتەکانی بەوە ڕازی نابن، کە بێ بەش بکرێن لە

---

[1]. هيومن رايتس وتش تؤكد أن العراق ينزلق إلى الدولة السلطوية القمعية، ٢٠١٢/١/٢٢:
http://www.almokhtsar.com/node/32778

دەسەڵات و پەراوێز بخرێن، یاخود ببنە پاشکۆی پێکهاتەکانی تر و لە لایەن ئەوانی ترەوە فەرمانڕوایی بکرێن.

ئەگەر لە هەڵویستی کورد و سوننەکان بڕوانین ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەژموونی شیعە و مۆدێلی دەسەلاتگەریی نوێیان پێ پەسەند نییە و ڕووبەڕووی دەبنەوە، نایانەوێت ئەو دەستکەوت و بەرژەوەندییانە لە دەست بدەن کە لە دوای ۲۰۰۳ بە دەستیان هێناوە. هەروەك چۆن دابەشبوونی هاوکێشەی هێز لە ناوخۆی عێراق ڕێگە بە تەنها لایەنێك نادات کۆنترۆڵی هەموو عێراق بکات، واتە بە تەنها هێز لای شیعە یان سوننە یان کورد نییە، بەڵکو هێز بە ڕێژەی جیاواز دابەش بووە، ئەگەر ئەمڕۆ شیعەکان بەهێزترین ئەوا مانای ئەوە نییە کە سوننە و کورد لاوازن، بە تایبەتییش لە کاتی بوونی یارمەتیی دەرەکی.

عێراق بەشێکە لە هاوکێشەکان ناوچە و بارودۆخی ناوخۆی ئەو وڵاتە کاریگەریی دەبێت لە سەر ناوچەکە بە تایبەتییش دەوڵەتانی دراوسێ، بۆیە ئەگەر پێکهاتەیەك هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەسەلات بدات و ئەوانی تر پەراوێز بخات، دەوڵەتانی دراوسێ زیاتر دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق وەردەدەن و هاوکاریی پێکهاتە هاوپەیمانەکانی خۆیان دەدەن، واتە ئەگەر سوننە پەراوێز بخرێت دەوڵەتانی سوننە وەکو تورکیا و سعودیە و وڵاتانی کەنداوی هاوکاری و پشتگیریی سوننەی عێراق دەکەن، بە ڕوونیش ئەوەمان بینی کە لە دۆسیەی تاریق هاشمی دەوڵەتانی سوننە پشتگیریان کرد. بە هەمان شێوە ئێران هەمان شت بەرامبەر هاوپەیمانەکانی خۆی دەکات.

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتییش، ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لەگەڵ ئەوە نین عێراق بەرەو مۆدێلی دەسەلاتگەریی نوێ بچێت، کە لە لایەکەوە بەرژەوەندییەکانیان دەخاتە مەترسییەوە، لە لایەکی تریشەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی سەقامگیریی عێراق و سەرهەڵدانی توندوتیژی، بۆیە لە بەرژەوەندیی

ئەمریکا دایە کە هاوسەنگیی هێز لە نێوان هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکی عێراقدا بپارێزرێت و هەموویان هاوبەشبن لە دەسەڵاتدا.

بەم پێیەیش، هەرچەندە مۆدێلی دەسەڵاتگەریی نوێ لە عێراقدا هەیە، بەڵام ئەگەری بەردەوامبوون و چەسپاندنی ئەم سیناریۆیە لاوازە، ئەمەیش پاڵمان پێوە دەنێت سیناریۆیەکی تر بخەینە ڕوو بۆ ئاییندەی عێراق، کە لە داخوازی سێهەمدا دەیخەینە ڕوو.

### ٣-٢ دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی لە عێراق:

سەرەتا ئارنت لیبهارت Arend Lijphart داهێنەری چەمکی دیموکراسیی تەوافوقی، ئاماژە بەوە دەدات کە دیموکراسیی تەوافوقی گوزارشت لە ستراتیجییەتێك دەکات بۆ ئیدارەدانی ناکۆکییەکان لە ڕێگەی هاوکاری و هەماهەنگیی نێوان دەستبژێرەکانی پێکهاتە جیاوازەکانەوە، کە چوارە ڕەگەزی سەرەکی لە خۆ دەگرێت (١. حکومەتی ئیئتیلاف، ٢. پشت بەستن بە نوێنەرایەتیی ڕێژەیی، ٣. مافی ڤیتۆی دوو لایەنە، ٤. خۆبەڕێوەبردن لە کاروبارە تایبەتەکاندا)[1].

بەڵام ئەو دیموکراسییە تەوافوقییەی لە عێراق جێبەجێ دەکرێت جیاوازە، لە جیاتی ئەوەی ببێتە میکانیزمێك بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەدانی ناکۆکییەکان، بۆتە هۆکارێك بۆ پاشەکشێی دیموکراسی و لاوازبوونی دامەزراوەکانی دەوڵەت و بەهێزبوونی دەسەڵاتی تاکڕەوی.

بە پێی ئەم سیناریۆیە، عێراق لە دیموکراسییەوە بەرەو دەسەڵاتگەری دەچێت، بەڵام لە جیاتی ئەوەی تەنها یەك دەسەڵاتی ناوەندی دەسەڵاتگەری

---

[1] بڕوانە، آرنت ليبهارت، الديمقراطية التوافقية في مجتمع متعدد، ت: حسني زينة، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد، ٢٠٠٦.

هەبێت، چەند دەسـەلاتێکی دەسـەلاتگەریی دەبێـت، کـە بـە شـێوەی تـەوافوقی فەرمانڕەوایی عێراق دەکەن، کە ڕەنگە سێ دەسەلات بن یاخود زیاتر.

بە واتایەکی تر، عێراق لە دیموکراسـی تەوافوقییـەوە بـەرەو دەسـەلاتگەریی تەوافوقی دەچێت، کە هەر پێکهاتەیەك لە ناوچە و هەرێمی خۆیدا دەسەلاتگەریی تایبەت بە خۆی دەبێت. بۆ نموونە حیزبێك یان چەند لایەنێکی کەم ناوەڕاسـت و باشـووری عێـراق کـۆنترۆڵ دەکـەن (کـە ڕەنگـە ببێتـە هـەرێمێك یـان نـا) دەسەلاتگەرییەکی بەهێز دەچەسپێنن و بەدەر لە یاسـا و دەسـتوور، دەسـت بـە سـەر داهـات و سـوپا و دامودەزگـا حکومییەکانـدا دەگـرن و بـۆ بەرژەوەنـدیی حیزبەکەیان بەکاری دەهێن و لایەنەکانی تر لاواز دەکـەن، لـە ئێسـتادا دەوڵـەتی یاسا و ڕەوتی سەدر بەو کارە هەستاون.

لە هەرێم کوردستانیش حیزبێك یان چەند لایەنێك کۆنترۆڵی دەسەلات دەکەن و مـۆدێلی دەسـەلاتگەریی نـوێ دروسـت دەکـەن، کـە لـە ئێـستادا یـەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان بـەو کـارە هەسـتاون و بـە پێی ڕێکەوتنی ستراتیژیی نێوانیان، دەسەلاتی حیزبەکانیان چەسپاندووە و مـاف و ئازادییەکانیان سنووردار کردووە و هێـزی چـەکداریی تایبـەت (پێـشمەرگە) بـە خۆیان هەیـە، داهـات و نـەوت و دەزگاکـانی حکومـەتی هـەرێم بـۆ بەرژەوەنـدیی کەسی و حیزبی بەکار دەهێنن و هەوڵی لاوازکردن و پەراوێزخـستنی ئۆپۆزسـیۆن دەدەن*

* بۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە، د. رشـيد عمـارة الزيـدي و يوسـف محمـد صـادق، المعارضـة السياسـية في إقليم كردستان - العراق (النشأة والمستقبل)، المركز العربيّ للأبحاث ودراسة السّياسات، ١ أبريل ٢٠١٢ ؛ http://www.dohainstitute.org/Home/Details?entityID=5d045bf3-2df9-46cf-90a0-d92cbb5dd3e4&resourceId=cf7c6b56-126a-47d6-af38-de28e8d10fab

بە هەمان شێوە، لە ناوچەی سوننەکان (کە ڕەنگە ببێتە هەرێمێك یان زیاتر یان وەکو خۆی بمێنێتەوە) شێخێك یان حیزبێك یان چەند لایەنێك کۆنترۆڵی دەسەڵات دەکەن و مۆدێلی دەسەڵاتگەریی تایبەت بە خۆیان دروست دەکەن.

بە واتایەکی تر هەر چەندە عێراق لە ڕووی دەستوورییەوە دیموکراسییە و ماف و ئازادییەکان پارێزراوە و هەڵبژاردنی تێدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە هەموو ڕووکەشی دەبن، چونکە هەر ناوچە و پارێزگا و هەرێمێك لە لایەن حیزبێك یان چەند کەسێکەوە کۆنترۆڵ دەکرێت و دەسەڵاتگەرییەکی ناوچەیی بۆ خۆی دروست دەکات و کار لە سەر لاوازکردنی ئەوانی تر دەکات.

دواتر هەموو ئەم دەسەڵاتگەرییە ناوچەی و هەرێمییانە لە نێوان خۆیاندا بە شێوەیەکی تەوافوقی ڕێك دەکەون بۆ دابەشکردنی داهات و دەسەڵات و ئیمتیازات– کە دەشێت هەندێکیان لە هەندێکی تریان زیاتریان بەرکەوێت– هەروەك چۆن ڕێك دەکەون لە سەر بێ دەنگ بوون لە بەرامبەر کارە نایاسایی و دەستوورییەکان یەکتر، کە لە ڕێگەیەوە ئەو دەسەڵاتەیان پێ دروست کردووە. بەمەیش عێراق لە دیموکراسی تەوافوقییەوە دەبێتە دەسەڵاتگەریی تەوافوقی، کە هەر لە دروستبوونی ئەنجوومەنی و حوکم و حکومەتی ئینتیقالییەوە ئەم مۆدێلە دروست بووە و چاوەڕێ دەکرێت لە ئاییندەدا زیاتر بچەسپێت.

توێژەر پێی وایە، چەسپاندنی دەسەڵاتگەریی تەوافوقی بەهێزترین سیناریۆیە، کە لە عێراقدا ڕوو بدات، چونکە:

١. عێراق وڵاتێکی فرە پێکهاتە و نەتەوە و مەزهەبە، کە بە بێ ویستی خۆیان لکێندراون بە یەکەوە و ئەم پێکهاتانە ئەوەند دڵسۆزییان (انتماء) بۆ نەتەوە و مەزهەبەکانیان هەیە، ئەوەندە دڵسۆزییان بۆ عێراق نییە، بە واتایەکی تر عێراقییەکان ناسنامەیەکی نیشتیمانیی یەکگرتوویان نییە، کە کۆیان بکاتەوە، لەوەیش زیاتر بە هۆی مێژوو و ئەزموونەکانی ڕابردووەوە متمانە لە نێوان ئەم

پێکهاتانەدا نییە، کە تەنها لە ڕێگەی تەوافوقەوە دەتوانن ڕێك بکەون و هیچ پێکهاتە و حیزبێك با بەهێزیش بێت ناتوانێت بە تەنها فەرمانڕەوایی عێراق بکات.

٢. دیموکراسیی عێراق دیموکراسییەکی لاواز و شکلییە، کلتووری دیموکراسی و قبوڵکردنی یەکتر لە زۆربەی ئاست و چین و توێژەکاندا نییە، فەرهەنگ و کلتووری ڕژێمی پێشوو کاریگەریی بەردەوامە. هەرچەند سەرکردە و سیاسییەکان لە میدیاکان و لەبەردەم خەڵکدا باس لە دیموکراسی و پێکەوە ژیان دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا خۆیان باوەڕیان پێی نییە و ڕێز لە جیاوازییەکان ناگرن و ڕەخنەیان بە لاوە پەسەند نییە، ئەمەیش بەشێکە لە تایبەتمەندیی تاکی عێراقی کە د. عەلی وەردی بە دووانەی کەسێتیی عێراقی ناوی دەبات (ازدواج الشخصية العراقية)[1].

٣. زۆربەی حیزبە عێراقییەکان پێکهاتەیەکی نادیموکراسییان هەیە و بە شێوەی مەرکەزی بەڕێوە دەبرێن، کە زیاتر لە مۆدێلی حیزبی گشتگیرەکانەوە نزیکن*، کە سەرۆك و بەرپرسەکان ڕۆڵی سەرەکی و یەکلاییکەرەوەیان هەیە و خاوەنی بڕیاری کۆتایین و جەماوەر و ڕێکخستنەکانیان ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نییە لە پرۆسەی بڕیار دروستکردندا، بگرە حیزبەکان بە کەسی کراون (شخصنە) وەکو یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و حیزبی دەعوای ئیسلامی و هەندێکیشیان بوونەتە حیزبی بنەماڵە و خێزان، وەکو پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕەوتی سەدر و ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی..هتد، بۆیە حیزب لە عێراق بە پێی

---

[1] بڕوانە، د. علي الوردي، شخصية الفرد العراقي، بحث في نفسية الشعب العراقي على ضوء علم الاجتماع الحديث، منشورات دار ليلى، الطبعة الثانية، لندن، ٢٠٠١.

* زۆربەی حیزبە عێراقییەکان وەکو پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و حیزبی دەعوای ئیسلامی و ئەنجوومەنی باڵای پێش ڕووخانی ڕژێم لە دەرەوەی عێراق دروستبوون، کە حیزبی شۆڕشگێڕی چەکدار بوون و ڕێکخستنی کونکرێتییان لە سەرەوە بۆ خوارە هەیە و فەرماندە و سەرکردەکان ڕۆڵی سەرەکییان تێدا گێڕاوە.

بەرژەوەندیی کەس و بنەماڵە ماشەڵە دەکات و پرسە نیشتیمانەکانی بە لاوە گرینگ نییە، بۆ دەستکەوت و پۆست و داهات ئامادەن لەگەڵ یەکتر ڕێك بکەون.

٤. دامەزراوەکانی حکومەتی عێراق لە قەیرانێکی بەردەوام دان، کە دامودەزگاکانی حکومەت لاواز و ناکارایە و بە دەست گەندەڵی و موحاسەسەی تائیفی و دەستتێوەردانی حیزبەوە دەناڵێنێت، کە حیزبەکانی ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لەبەڕێوە بردن حکومەت بە هەموو ئاستەکانییەوە.

٥. دەسەلاتگەریی تەوافوقی لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی و هەرێمی پشتگیری دەکرێت، چونکە دەوڵەتانی دراوسێ و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیش، پرسی دیموکراسی و مافی مرۆڤیان بە لاوە گرینگ نییە، تەنها ئەوەیان بە لاوە گرینگە کە بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن و هاوسەنگیی هێزی نێوان پێکهاتەکانی عێراق بەتوندی تێك نەچێت، بە شێوەیەك نەبێتە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نیشتیمانییان.

٦. دەسەلاتگەریی تەوافوقی باشترین مۆدێل و میکانیزمە بۆ هێشتنەوەی عێراق بە یەکپارچەیی و پاراستنی سەقامگیری، کە هەر سیناریۆ و چارەسەرێکی تر دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی توندوتیژی و جەنگی ناوخۆ، چونکە هیچ پێکهات و حیزبێك بڕوایان بە بنەماکانی گەمەی دیموکراسی نییە و متمانەیان بە ئەوانی تر نییە. لە سەر ئاستی دەرەکی و وڵاتانی دراوسێ سیناریۆکانی تری وەکو دابەشکردن پەسەند نییە، چونکە بە هەڕەشەی دادەنێن بۆ سەر ئاسایشی ناوچەکە و، بەرژەوەندییەکانی وا دەخوازێت عێراق بە یەکپارچەیی و لاوازیی بمێنێتەوە، کە دەرفەتی دەستتێوەردانیان زیاتر دەکات.

**کۆتایی:**

هەرچەندە کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا دەستکەوتێکی گرینگ بوو بۆ عێراقییەکان و کۆتایی بە داگیرکاری هێنا، بەڵام لە هەمان کاتدا چەندین کێشە و قەیرانی سیاسی بە دوادا هات، کە ڕەوشی سیاسی و ئەمنی و ئابووریی وڵاتی زیاتر ئاڵۆز کرد و ئاییندەی عێراقی خستە بەردەم چەند سیناریۆیەکەوە، کە هەندێکیان مەترسیدارن.

کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لەو کاتەدا دوو دەرئەنجامی نێگەتیڤیی لێکەوتەوە، یەکەمیان بووە هۆ تەقاندنەوەی قەیرانە سیاسییەکان و تێکچوونی هاوسەنگیی هێز لە نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی عێراق و دەرکەوتنی ویستی هەندێك لایەن بۆ کۆنترۆڵکردن دەسەڵات و بێ بەشکردنی ئەوانی تر، دووەمیان دروستبوونی بۆشاییی هێز بە هۆی نائامادەییی سوپای عێراق، کە لە لایەکەوە بووە هۆی زیادبوونی توندوتیژی و کارە تیرۆریستییەکان و لە لایەکی تریشەوە بووە و دەبێتە هۆی زیاتر دەستتێوەردانی دەرەکی بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییی هێز.

لە ژێر ڕۆشناییی ئەو فاکتەرانە و واقیعی ئێستای عێراق گەییشتینە ئەو دەرئەنجامەی، کە قورسە دیموکراسیی ڕاستەقینە لە عێراق بچەسپێت، هەر وەك چۆن ئەستەمە عێراق بگەڕێتەوە بۆ دیکتاتۆری و لە لایەن تاکەکەسێکی زۆردارەوە و بە شێوەی مەرکەزیی فەرمانڕەوایی بکرێت، بۆیە نزیکترین سیناریۆ کە لە ئاییندەدا ڕوو بدات، دروستبوونی دەسەڵاتگەریی تەواقوفی دەبێت.

دەسەڵاتگەریی تەواقوفی بە واتای بوونی چەند دەسەڵاتێکی تائیفی و ئیتنیکیی نادیموکراسیی دەسەڵاتگەرییە، کە لە سەر بنەمای بەرژەوەندیی حیزبی و کەسی بە شێوەیەکی تەوافوقی ڕێك دەکەون بۆ بەڕێوەبردنی عێراق بە بێ گویدانە بنەما نیشتیمانی و دیموکراسییەکان، بەمەیش لە جیاتی ئەوەی یەك دەسەڵات لە عێراق هەبێت، چەند دەسەڵاتێکی نادیموکراسی دەبێت، ئەم سیناریۆیەیش لە ئێستاوە سەرەتاکانی دەرکەوتوون و پێشبینییش دەکرێت لە ئاییندەدا زیاتر بچەسپێت.

